


میربەسری

# ناودارانی کورد

لەعەرەبیەوە:

عەبدولخالق عەلائەدین








ناوی کتێب: ناودارانی کورد

دانەر: میر بەسری

وەرگێڕانی لەعەرەبیەوە: عەبدولخالق عەلائەدین

چاپخانەی: منارە / هەولێر

(لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٤٨٨) ساڵی (٢٠٠٩)ی پێدراوە).

# پێشەكیی وەرگێڕ



ئەوەی ڕاستی بێ دەمێك بوو ئاواتەخوازی ئەوە بووم كە بتوانم سەربوردە و بەسەرهاتی هەندێك لە پیاوانی هەڵكەوتە و سیاسەتمەداری لێهاتووی میللەتەكەمان بنووسم كە زۆربەی زۆریان فەرامۆش كراون و هەقی خۆیان وەك پێویست نەدراوەتێ، بی ناز و بی نوازشت لە ئارامگەی سەرمەدی خامۆشاندا سەریان ناوەتەوە، هەمیشە شیعرە بەهادارەكەی شاعیری مەزنی كورد حاجی قادر لە مێشكمدا دەزرنگێتەوە كە دەڵێ:

**كتێب و دەفتەر و تەئریخ و كاغەز - بە كوردی گەر بنووسرایە زوبانی**

**مەلا و شێخ و میر و پادشامان - هەتا مەحشەر دەما ناونیشانی**

تا لەم دوایەدا خۆشبەختانە ئەو دەرفەتەم بۆ ڕەخسا تاسە و ئارەزوو نیازی پڕجۆشی هێنامە دی. ئەویش بە هۆی ئەم كتێبەی بە ناونیشانی "اعلام الكرد" دانەری "میر بەسرییە" كەوتە دەستم كەوا لە "لەندەن" بە زمانی عەرەبی ساڵی ١٩٩١ بە چاپ گەیەندراوە، ئیتر لەوساوە واتە لە ساڵی ١٩٩٢ بەسەرگەرمییەوە كەوتمە كاری وەرگێڕانی بۆ زمانی شیرینی نەتەوەكەمان، دەبێ ئەوەش بە خوێنەری خوشەویستمان ڕابگەیەنم كە دانەری ئەم كتێبە پیاوێكی بیانییە، نە لە ڕەگەز و نە لە ئاییندا فڕی بەسەر كوردەوە نییە، كەچی ئەم نووسەرە مەردە ئەرك و ڕەنج و شەونخوونی و ماندووبوونێكی یەكجار زۆری كێشاوە كە شایستەی ڕێز و تەقدیری هەموو كوردێك بێت. دەتوانم بڵێم كەسی تر لە ئێمە لەبەر هەر هۆیەك بووبێت ئەم كارە پیرۆزەی بەم شێوە فراوانە نەكردووە، لە كاتێكدا كە ئەركی

سەرشانی خۆمان بووە. میر و سەردار و پاشا و رۆڵەی بەهرەوەر و خێرخوازی میللەتەکەمان زیندوو بکەینەوە، کار و رەفتار و هەڵوێستی جوامێرانەی نەتەوایەتی و کۆمەڵایەتی و مرۆڤایەتی و بەخشندەییان بەرچاو بخەین، هەر یەکەش بە پێی بارودۆخ و سەردەمی خۆیان مامەڵەیان لەگەڵا بکری نەك با تاو و تەرازوو و پێوانەی ئەمڕۆی بیروڕای سیاسی و چینایەتی و چەپڕەوی سەیر بکرێن، ئەوەی زیاتر جێی داخ و پەرۆشییە ئێمە نەك کەم تەرخەمیمان لەوەدایە کە یادیان ناکەینەوە و رێزمان لێنەناون و پەیکەرمان بۆ نەتاشیون، یا لە سوچێکی لاپەرەی مێژووا شوێنێکمان پی رەوا نەدیتوون. بەڵکو بە پێچەوانەی ئەوەوە نەمانهێشتووە لە گۆڕیشدا بحەسێنەوە، ناووناتۆرە و تۆمەتی دەرەبەگ، یا کۆنەپەرست و سەر بە داروەدەستەی ئیمپریالیزیشمان خستۆتە پاڵیان. بێگومان ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی کە دوژمنانی کورد ئەم هەلە بۆ سوودی خۆیان بقۆزنەوە. دەبینین بە درێژایی رۆژگاری مێژوو چەندین زانای ناودار و پیاوی هۆشمەند و سیاسەتمەدار و سەرداری بەتوانامان لی پەیدا بووبی ئەوە یەکسەر رەگەزنامەی خۆیان داوەتی و لە کوردیان بێبەری کردووە، جا تۆش هەر هاوار بکە و بڵێ: کورینە، عالەمینە، ئەوە راست نییە کارێکی ناپاکییە لەگەڵ حەقیقەت و مێژوودا، داخۆ چەندی بە چەند؟ ئێمەیەکی بێ تەخت و بەخت چۆنمان بۆ دەسەلمێنن!؟...

نرخ و بایەخی ئەم کتێبە زیاتر لەوە دایە کە دانەرەکەی کورد نییە و بە زمانی عەرەبی دایناوە. لەتەك ئەوەشا دانەرەکەی پیاوێکی بیر رووناك و نووسەر و شاعیر و ئەدیبێکی ناودارە، شوێنێکی تایبەتی گرانبەها و سەنگینی لەناو جیهانی ئەدەب و رۆشنبیریا هەیە و بە گیانی بێلایەنی و هەستی پڕخۆشەویستی مرۆڤایەتی بۆمان بۆتە پارێزەر و شاهیدێکی سەرراست، توانیویەتی بە هۆی دۆستایەتی و هەڵسوکەتی لەگەڵ کوردی رۆشنبیر و شارەزا و پایەبەرز زانیارییەکی ورد و فراوان دەبارەی بەسەرهاتەکانی کوردستان و پیاوانی ناودار و ناسراو بەدەست بێنی، سەرەرای ئەوەش پشتی بە چەند سەرچاوەی باوەڕپێکراوی مێژوویی بەستووە، لەگەڵ ئەوەشا مانای وا نییە کە کورد لەو مرۆڤانەی ناویان لەم کتێبەدا

هاتووە زیاتری لی هەڵنەکەوتووە، بەڵکو وەکو کورد گۆتەنی: "ئەوە مستێکە نموونەی خەرواریکە" دەتوانم بڵێم ئەم کتێبە سەرچاوەیەکی بەهادارە بۆ ئێمەی کورد و بە شێوەیەکی تێکڕاییش بۆ هەموو تۆژەرەوە و مێژوونووسانی تایبەتمەند. لە وەرگێڕانیشدا هەوڵی ئەوەم داوە دەستکاری لە چۆنێتی و شێوازی نووسین و رستە و ماناکانیدا نەکەم مەگەر بە گوێرەی پێویست، کرد و کۆشی ئەوەشم بووە کە بتوانم وێنەی هەر یەکێك لەم زاتانەی ناویان هاتووە بڵاو بکەمەوە، بۆ ئەم مەبەستەش پەیوەندیم بە زۆر برادەر و دۆست و ناسیاوان و خزم و کەسوکاریانەوە کردووە، بەهەر حاڵ کۆمەڵە وێنەیەکم بە هۆی چەند برایەکەوە دەستگیر بوو کە شایستەی سوپاسن ئەگەرچی ژمارەیان لە ئاستی خواست و قەوارەی کتێبەکەدا نەبوو. ئیتر تکام وایە لە کەم و کوڕیمان ببوورن، هیوادارم ئەم کتێبەش بەشداربوونێك بی لە خزمەتی مێژوو و ئەدەبی گەلەکامان، هەزار سڵاویش بۆ گیانی پاکی ئەو مرۆڤانە بی کە بۆ خێر و خۆشی و سەرفرازیی نەوەی کوردی ستەمدیدەمان تێکۆشاون.

عەبدوالخالق عەلائەدین

هەولێر

١٩٩٤

# کورتەیەک لە ژیانی دانەر



ئەمیر بەسری لە ساڵی ١٩١١ لە بەغدا هاتۆتە جیهان، خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندیی لەوی تەواو دەکات، پاشان لە جامیعەی فەرەنسا دەخوێنی لە ئابووری و ئادابی جیهانی پسپۆڕ و تایبەتمەند دەبێ، گەلێ فەرمانی گرنگ و بایەخداری جیاجیای بینیوە، سکرتێری وەزارەتی دەرەوەی عێراق و لە هەمان وەزارەتدا بریکاری بەڕێوەبەرایەتی تەشریفاتییەکەش بووە، بەڕێوەبەری ژووری بازرگانیی بەغدا و سەرەك دەرهێنەری گۆڤارەکەی بووە، بەڕێوەبەری گشتیی "جمعیە التمور العراقیە" بووە، بە نوێنەری عێراق لە کۆنگرە و پێشانگاکانی جیاجیا لە: پاریس و نیویۆرك، کەمبریج و میونیخ بەشدار بووە. سەرپەرشتی دەرچوونی شەش کتێبی کردووە کە بە زمانی ئینگلیزی لەسەر ئابووری و باج و خەراج و کار لە: عێراق، لیبیا، عومان، مەملەکەتی عەرەبی سعودی و میرنشینەکانی عەرەبی نووسراون، هەروەها هەڵبژاردراوە بە ئەندامی کۆمەڵەی ئاسیەوی مەلەکی لە لەندەن، جگە لەوەش ئەندامی "نادی القلم العراقی " بووە "جمعیە القلم الدولیە" لە لەندەن، سەرۆکی تایفەی مووسەویەکان بووە لە عێراق و پاشان لە ساڵی ١٩٧٤ روودەکاتە لەندەن. هەرچەندە تەمەنێکی زۆری هەیە، بەڵام هەر بەردەوامە لە نووسین و کتێب دانان و بەرهەمی ئەدەبی.

دانەر، ئەدیب و نووسەرێکی بەهرەوەر و بەتوانایە جگە لە دیوانی شیعرچەندەها کتێبی ئەدەبی و زانستی و مێژوویی بەهاداری بە زمانی عەرەبی و ئینگلیزی و فەرەنسی داناوە.[1]

# پێشەکیی دانەر

ڕەنگە کەم نەتەوەی زیندووی وەك گەلی کورد هەبی کە لەم چاخ و سەردەمە نوێیەدا بۆی نەرەخسا بی بە ئاوات و ئامانجی خۆی بگات، ئەم میللەتە گەلی سەرۆك و سەردار و سەرکردە و ئەدیب و شاعیری بەرزی لی پاشکەوت بووە، لەسەر مێژوو و بیری مرۆڤایەتی دا کاریگەر بوون، گەلی شۆڕش و ڕاپەڕین و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی لە وڵاتە جیاکانی لێی نیشتەجی بوون بەرپا کردووە، جارەهاش دووچاری داپڵۆسین و چەساندنەوە و دەردەسەری بوون.

زۆر خۆم بەختەوەر دەزانم کە ئەم کتێبە سادەیەم پێشکەشی ئەم نەتەوەیە و ڕۆڵە و مرۆڤەکانی بکەم، کە وا بە خۆشەویستی و دۆستایەتییان لە بەغدا و لەندەن شاد بووم، لە پێش هەموویانەوە ئاشنای سەروەرم خوالێخۆشبوو "تۆفیق وەهبی بەگ" و وەزیری مەردی کوژراو "سەعید قەزاز".

میر بەسری

لەندەن ١٩٩١

---

1– ئێوارەی ڕۆژی دووشەممەی ١٩٩٨/١٠/١٢ لەگەڵ دوو خزمی تر چوومە سەردانی میر بەسری، بە ڕووخۆشی لەگەڵ هاوسەرەکەی بە پیرمانەوە هاتن، گەلێ وتووێژی هەمەچەشنی ئەدەبی و کۆمەڵایەتی و مێژوویی هاتە ژێر باس، تا بڵێی پیاوێکی بیر ڕووناك و شارەزا بە بارودۆخی ڕابردووی ڕووداوی سیاسیی سەردەمی پاشایەتی و دۆستایەتی و هەڵسوکەوتی لەگەڵ کاربەدەست و ناودارانی ئەوسا بە تایبەتی هی کورد هەبووە.

# چاوخشاندنێک لەسەر گەلی کورد

نەتەوەی کورد لە ناوچەکانی تورکیا و ئێران و عێراقدا[2] بڵاو بوونەتەوە و هەندێك ئیماراتیان لە باکوری عێراق دا دامەزراندووە، لەوانە ئیماراتی سۆرانیەکان کە لە ناویاندا محەمەدی پاشای رەواندوزی ناسراو بە "میری کۆرە" ناوبانگی دەرکردبوو، حکومەتی عوسمانی لە ساڵی ١٨٣٦ دا ئیماراتەکەی لەناو برد، لە هەمان ساڵدا تورکەکان ئیمارەتی بادینانیشیان نەهێشت، بەڵام گرنگترین ئیمارەتەکانی کورد ئیمارەتی بنەماڵەی بابان بوو لە سلێمانی کە ١٨٠ساڵ زیاتری خایاند، فەقێ ئەحمەد باپیرەگەورەی بنەماڵەی بابان بوو، کە لە ساڵی ١٦٧٥ کۆچی دوایی کردووە.

کوڕ و نەوەکانی لە خانەوادەی بابان جێگایان گرتۆتەوە و فەرمانڕوایی سلێمانییان کردووە.. ناودارترینیان خالید پاشا (١٧٣٢-١٧٤٢ز) و عەبدولڕەحمان پاشا (١٧٨٩-١٨١٣ز) و مەحمود پاشا (١٨١٣-١٨٣٤ز) بوو کە وا موقیمی بەریتانی لە بەغداوە چۆتە سەردانی و لە یاداشتی گەشتەکەیدا باسی کردووە.

دووا میری بابان ئەحمەد پاشا بوو(١٨٣٨-١٨٤٧ز) تورکەکان فەرمانڕەواکەیان لە ساڵی ١٨٤٧ نەهێشت و رەوانەی ئاستانەیان کرد و عبدوڵڵا پاشای برایان لە شوێن دانا، پاشان ئەویشیان لە ساڵی ١٨٥١ز لابرد و فەرمانبەرێکی تورکیان لە جێگا دانا.

دوای ئەمە پیاوانی بنەماڵەی بابان پلە و پایەی بەرزیان لە حکومەتی تورکی و پاشان لە حکومەتی عێراقی پێ دراوە.

---

2- جگە لەو شوێنانەی کە دانەر باسی کردووە کورد لە روسیا و سوریا و لوبنان و بە شێوەیەکی کەمتر لە شوێنانی تریش هەیە، لەم دواییەشدا بە هۆی باری نالەباری کوردستان ژمارەیەکی زۆری کورد رووی کردۆتە وڵاتانی ئەورووپا و بە پەناهەندەیی لێی نیشتەجی بوون.

گەلی جار خێڵ و هۆزەکانی کورد لە حکومەتی تورکی هەڵگەراونەتەوە، بەتایبەتی عەشیرەتەکانی "میللییە" لە سوریا بە سەرۆکایەتی ئیبراهیم پاشای کوڕی محەمەد "میللی "، لە عێراقیش بارزانی و هۆزی هەمەوەند.

شەریف پاشا ساڵی ١٩١٩ چۆتە کۆنگرەی ئاشتی لە ڤرسای، ویست و داخوازیەکانی گەلی کوردی پێشکەش کردووە. پەیمانی "سیڤەر" ساڵی ١٩٢٠ بەستڕا، مافی کوردی تێدا رەچاو کرا، بەڵام پاش سی ساڵ بە پەیمانی "لۆزان" گۆڕدرا و کوردەکان لە ٥ی شوباتی ساڵی ١٩٢٥ شۆڕشیان لە ناوچەی ئورفە و دیاربەکر بە سەرۆکایەتی شێخ سەعید نەقشبەندی بەرپا کرد، بزووتنەوەکەیان پەرەی سەند و کوردەکان چەند گوندێکیان سوتاند، هەندێك کۆمەڵی کۆنەپەرست لە "ئەنقەرە" کە لە سیاسەتی مستەفا کەمال پاشا(ئاتا تورك) ی عیلمانی قایل نەبوون پشتگیری کوردەکانیان کرد. حکومەتی تورکی بایەخێکی زۆری بە مەسەلەکە دا، یاسایەکی تایبەتی لە ئەنجومەنی نیشتیمانی دا دەرچواند، دەسەڵاتێکی بەرفراوانی بۆ لەناوبردنی شۆڕشگێڕان پێدرا، دادگای سەربەخۆیی دامەزراند، لە نیسانی ١٩٢٥ شۆڕشەکەیان دامرکاندەوە، شێخ سەعیدیان گرت و حوکم درا، لە ٢٩ی حوزەیرانی هەمان ساڵدا لەگەڵ دوکتۆر فوئاد بەگ و چل و شەش کەسی تر لە سێدارە دران، حکومەتی تورکی بە توندی و دڕ و چەتوونی کەوتە داپڵۆسینیان... لەگەڵ ئەوەشا کوردەکان دووبارە لە ساڵانی ١٩٢٧ و ١٩٢٨ راپەرین و هەڵگەرانەوە.

دوای جەنگی دووەمی جیهانی کۆماری مەهاباد بە سەرۆکایەتی قازی محەمەد راگەیەندرا. نزیکەی یازدە مانگی خایاند، کاتی هێزی سۆڤیەتی کشایەوە حکومەتی ئێرانی کۆمارەکەی لەناو برد و قازی محەمەدی لە ٣١ی ئازاری ١٩٤٧ لە سێدارەدا، بەڵام لە عێراق شۆڕشەکانی کورد بە سەرۆکایەتی شێخ مەحمود تینی سەند، پاشان بە سەرکردایەتی شێخ ئەحمەدی بارزانی و مەلا مستەفای برای. دەبێ ئەوەش بگوترێ: تاکە هەوڵێك کە بۆ دامەزراندنی دوڵەتێکی یەکگرتووی کوردی درابی ئەویش لەسەر ئەنجامی شەری یەکەمی

جیهانی کاتی بەستنی پەیمانی "سیڤەر" بوو "غوتاف غوترو" لە کتێبێکەیدا لە ژێر ناوی "فەرەنسا لە سوریا و کیلکیا"دا کە ساڵی ١٩٢٠ دەرچووە دەڵێ: لە ئاکامی تێکشکانی تورکیا و داگیر کردنی ناوچەی کیلکیا و بنکەی ئەتەنە لە لایەن فەرەنسە و ئینگلتەرەوە، تورکەکان کەوتنە جموجۆڵ و هاندانی سەرۆکەکانی کورد لە ناوچەی ماردین و دیاربەکر بۆ داواکاری سەربەخۆبوونی کوردستان، سولەیمان نەزیف کە لە رەگەزی کوردی دیاربەکرە و عەبدوڵڵا جەودەت و هیتر لە پێشەوای ئەو بیرەرا و داخوازیانە بوون.

شاعیر و ئەدیبانی کورد هەمیشە شانازی بە زمان و نەتەوەکەی خۆیان دەکەن، شێخ رەزای تاڵەبانی هەڵبەستێکی لە ژێر ناوی "خاکی بابان" داناوە باسی شکۆداری بابان و پایتەختەکەیان دەکا و دەڵێ:

لەبیرم دێ سولەیمانی کە دارلمولکی بابان بوو
نە مەحوکمی عەجەم نە سوخرەکێشی ئالی عوسان بوو
لەبەر قاپی سەرا سەفیان دەبەست شێخ و مەلا و زاهید
مەتافی کەعبە بوو ئەرбابی حاجەت گردی سەیوان بوو
لەبەر تابووری عەسکەر رێ نەبوو بۆ مەجلیسی شا؟
سەدای مۆسیقە و نەققارە تا ئەیوانی کەیوان بوو
درێخ بۆ ئەو زەمانە، ئەو دەمە، ئەو عەسرە ئەو رۆژە
کە مەیدانی جریت بازی لە دەوری کانی ئاسکان بوو

پاشان دەڵێ:

عەرەب ئینکاری فەزڵی ئێوە ناکەم ئەفزەڵن ئەمما
سەلاحەدین کە دنیای گرت لە زومرەی کوردی بابان بوو

شاعیرانی ئەو دوایەی نەتەوەی کورد پیرەمێرد و فایەق بێکەس و عەبدوڵڵا گۆران ناوبانگیان دەرکرد، پیرەمێرد هەزار پەندی کوردی هۆنیوەتەوە، چیرۆك و داستانەکانی

زیندوو کردونەتەوە، بە جوانی وەسفی سروشتی چاو ئەندازی ئەفسوناوی کوردستانی کردووە.

ئەمین زەکی بە تۆمار کردنی مێژووی سلێمانی ولاّتی کوردی و سەربوردەی پیاوانی خەریك بووە، رایسپاردووە چەند دێڕ شیعری لەسەر گۆڕەکەی نەقەش بکرێ، ئەمەش واتاکەیەتی: "ئەگەر بە چاوی خۆم سەرفرازی و ئازادی گەلەکەم نەدی بزانن رەوان و گیانم تا رۆژی قیامەت لە ژێر باری خەما دەناڵێنێ، گەر حەز بکەن گیانم ئارام و شادمان بێت دەبێ لاوانی کورد بێنە کۆڕی خەبات و تێکۆشان". بەلاّم تۆفیق وەهبی کاری بەرز و پڕسوودی مێژوویی بۆ کورد ئەنجام داوە ، رێزمانی زمانەکەی داناوە، وەسیەتی کردووە تەرمەکەی ببەن لە قەد چیای پیرەمەگرون لە دۆڵی جوانڕۆ بنێژن بۆ ئەوەی گیان و رەوانە گەراوەکەی بۆ هەوار و نیشتمانی دێرینی ئارامگربێ.

مستەفا پاشا یامولکی گوتوویەتی:

**ئەترسم بمرم ئەی وەتەن نەبینم بەختیاری تۆ؟**

**بنووسن با لەسەر گۆڕم وەتەن غەمگین و من غەمگین؟**

ئەحمەد موختاری جاف دەڵێ:

**" لە خەو هەڵسن درەنگە میللەتی کورد خەو زەرەرتانە**

**هەموو تەئریخی عالەم شاهیدی فەزل و هونەرتانە**

**دەسا تێکۆشن ئەی قەومی نەجیبی بی کەس و مەزلوم**

**بە کورتی بیبڕن ئەو رێگە دوورەی وا لەبەرتانە"**

# دەوڵەتی بابان

بنج و بنەوانی خێزانی بابانەکان نادیارە، فەرمانڕواییان لە بەشێکی گەورەی کوردستانی باکوری عێراقدا کردووە، بە پێی داستان و چیرۆکە لێکجیاکان کە دەیگێڕنەوە زۆرترینی بە لای ئەندێشەو خەیاڵەوە چوون، مێژوونووس محەمەد ئەمین زەکی بەگ لە کتێبەکەیدا "مێژووی سلێمانی " کە محەمەد جەمیل رۆژبەیانی وەریگێڕاوەتە سەر زمانی عەربی، ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە گوایە: دەوڵەتی عوسمانی هەندێك زەوی و زاری لە ناوچەی پشدەر بۆ فەقی ئەحمەدی باپیرە گەورەی ئەو خێزانە دابڕیوە. ئیتر لەوی جڵەوی فەرمانڕوایی پشدەر و مەرگە و ماوەت و سەردەشتی گرتۆتە دەست، کاتی ژیان بەجی دەهێڵێت باباسلێمان(سلێمان بەبە) کوڕی بووبی یا خود نەوەی لە ١٦٧٠ز جێگای گرتۆتەوە و توانیویەتی دەسەڵاتی خۆی بەرفراوان بکا بۆ ناوچەی کەرکوك لەگەڵ "موتەسرڕیفەکەی دلاوەر پاشا جەنگاوە و بەسەریدا زاڵ دەبێ، سلێمان بە تەواوی خۆی چەسپاند، کاروباری ئیمارەتەکەی رێکخست، توانی بەسەر هێرشەکانی کە لە بەغداوە بۆی هاتووە سەر کەوێ، پاشان حکومەتی عوسمانی لە ساڵی ١٧٠٠ بە سوپایەکی مەزنی بی شومارەوە کە لە هێزی دیاربەکر و حەلەب و بەغدا پێك هاتبوو هەڵی کوتایە سەری، ناچاری خۆ بەسەستەوەدان بووە، ناردوویانەتە ئاستانە، زۆری پی ناچێ-ئیمارەتی سنجق بابانی پی دەبەخشن کە پایتەختەکەی گوندی قەڵاچوالانە... دەشبی سەر بە پارێزگای کەرکوك بووبێ... کە سلێمان بەگ لە ساڵی ١٧٠٣ کۆچی دوایی دەکات و وڵاتەکەی تووشی شڵەژان دەبێ، حکومەتی عوسمانی جڵەوی کاروبارەکەی دەگرێتە دەست -متسلم- دەکەن بە کارگێڕی و دەیخەنە سەر ناوچەی شارەزوور، پاشان یەك لە رۆڵەکانی خێزانی بابان، خانە محەمەد پاشا پەیدا دەبێ و دەتوانێت ساڵی ١٧٢١ ئیمارەتی بابان بژێنێتەوە، شەروشوڕ و کوشتارێکی زور لە نێوان والی بەغدا و ئەحمەد پاشا و ئێرانیەکان روو دەدا،

سوپای عوسمانی لە ١٧٢٥ دا شاری هەمەدان داگیر دەکات، خانە پاشای لی دەکەن بە والی. بەڵام ئێرانیەکان سەرلەنوی سەرکەوتن بەدەست دێنن، خانە پاشا دەبێتە والی ئەردەڵان، خالید پاشای برای جڵەوی کاروباری ئیمارەتی بابان دەگرێتە دەست، شەر لە نێوان عوسمانی و فارسەکان نەپسایەوە، ئێرانیەکان سەلیم پاشای کوڕی بەکر بەگ دەکەن بە فەرمانڕەوای "قەڵاچوالان"، بەڵام نەیتوانی خۆی بەرامبەر سوپای والی بەغدا سلێمان پاشا ـئەبو لەیلەـ رابگری و هەرێمی بابان داگیر دەکات، سەلیم پاشا هەڵدێ، سولەیمان پاشای کوڕی خالید پاشا ساڵی ١٧٥٤ دەکەن بە میر.

سولەیمان پاشای بابان وەك ئەمین زەکی دەڵێ: پیاوێکی خواناس و مەرد و دلێر و توند و بەزەبر و زەنگ بووە، شوێن متمانەی والی بەغداش بووە، ناوچەی کۆیە و حەریر و زەندئابادی خستۆتە سەر فەرمانڕواکەی، لەو باج و خەرەجەش خۆش دەبێ کە بڕیار بوو بیدرێتێ، تا بتوانی کەرەستەی پێویست و چەك و تفاقی سوپای بابانی پی دابین بکات، فەرمانڕەواکەی نزیك یازدە ساڵی خایاند و لە مەزنترین میرەکانی بابان دەژمێردرێ. سوپاکەی هەردەم بۆ کۆمەکی و یارمەتی والی بەغدا لە کاتی پێویست و تەنگاویدا ئامادە بووە، کە والی بەغدا سلێمان "ئەبو لەیلە" دەمری -١٧٦١- عەلی پاشا جێگای دەگرێتەوە، ئەم والیە داوای ئەو باج و خەراجەش لە سلێمان پاشای بابان دەکاتەوە کە لە ساڵانی رابردوو لەسەری کۆ بووتەوە... دووبەرەکیش لەناو ئەندامانی خێزانی بابان روودەدات.

سلێمان پاشا لە رووی حکومەتی بەغدا رادەوەستێ، سوپاکەی نشوستی دێنی و هانا دەباتە بەر کەریم خانی زەند لە ئێران، والی بەغدا ساڵی ١٧٦٢ ئەحمەد پاشای برای سلێمان پاشا دەکاتە میری بابان، بۆ ساڵی ئاییندە والیی بەغدا سوپایەك بۆ گرتنی عەشیرەتی کەعب کۆ دەکاتەوە، داواش لە ئەحمەد پاشا دەکا لە تەکیا بڕوا، سلێمان پاشا بە دیار نەبوونی برای لە ئیمارەتەکەدا بە هەل دزانی و هەڵمەت دەباتە سەر قەڵاچوالان و داگیری

دەکات، بەڵام کە ئەحمەد پاشا لە شەڕی "بن کعب" دەگەڕێتەوە ئیمارەتەکەی لێ دەستێنێتەوە، والی بەغدا عەلی پاشا لە ساڵی ١٧٦٣ دا دەکوژرێ و عومەر پاشا دێتە جێی و دەستبەجێ سلێمان پاشا بۆ هەرێمی بابان دەگەڕێنێتەوە: کۆیە، حەریر، هەولێر، ئاڵتون کۆپری، قەرەحەسەن، زەنگاباد و بەدرە و جەسانی بۆ دەخاتە سەر ئیمارەتەکەی، بەڵام سلێمان زۆر بە ئیمارەتەکەی شادمان نابێ، لە شیرین خەو دا لە ماڵی خۆیدا دەکوژرێ، محەمەد پاشای برای لە١٧٦٥ دا جێگای دەگرێتەوە، ئیمارەتی بابان کە وا ١٨٠ساڵی خایاند مێژوویەکی پڕ لە هەرا و ئاژاوە و پشێوی عەشیرەتگەری و شەر و ناکۆکی نێوان بەغدا و ئێرانی دراوسی و ململانی و رکەبەری درێژخایانی نێوان ئەندامانی خێزانەکە هەمیشە لە هەڵکشان و داکشان دا بووە، چوونە سەر کار و فەرمان، لابردن و لێکەوتن، ملکەچی و یاخی بوون، زۆر کاریان کردبووە سەر بارودۆخی ئیمارەتەکە. میرەکان سوودیان لە دەرفەتی بەرەنگاربوونی بەردەوامی عوسمانی و ئێرانی بینیوە، بە هەر حاڵ و بارێك هێزێکی سوپایی ئەوتۆ بوو کە حسابی بۆ بکرێ، گەلێ جار والی بەغدا داوای کۆمەك و یارمەتی لێ کردوون و هانایان هێناوە بەریان بۆ تەمبی کردن و داپڵۆسینی عەشیرەتە یاخی بووەکان، یاخود بۆ جەنگی ئێرانی پەنای بردۆتە بەر سوپاکەیان.

محەمەد پاشا لایەنگری ئێران بوو، دەکەوێتە نامە ناردن بۆ پاشای ئێران، کەریم خانی زەند، عومەر پاشای والی لێی دەرەنجێ، مەحمود پاشای لە جێ دادەنێ، ئەویش دەچی ئەحمەد پاشای برای کە لە قەڵای سروچێك بەند کرا بوو رزگار دەکات و بۆ ئیمارەتەکەی دەنێرێتەوە، پاشان بۆ جاری دووەم محەمەد پاشا دێتەوە سەر حوکم.

حکومەتی عوسمانی ساڵی ١٧٧٦ بڕیاری جەنگی لەسەر ئێران راگەیاند، سوپا لە دیاربەکر و ناوچەکانی تر بەرەو بەغدا کشا، بەڵام لەم ئانەدا تاوانی فیتنەگەری خرایە پاڵ عومەر پاشا و لێیان خست لە دووایشا کوژرا، کەریم خانیان دڵنەوا و رازی کرد، فەرمانڕەوایی درایە عەبدوڵا پاشا، لە دوو ساڵی زیاتر نەخایاند، حەسەن پاشای والی

کەرکوك بووە جێنشین، لە ١٧٧٧ ئەحمەد پاشا دووای شەری ئێران بۆ دووەم جار دەگەڕێتەوە سەر نیمارەتەکەی، ئەمین زەکی بەگ دەڵێ: والیەکانی عوسمانی لە سوپای ئینکیشاری دڵنیا نەبوون و سوپای کۆلەندی (المملوکی) نوی بوو، رێك و پێك نەبوو، لەبەر ئەوە پێویستیان بە یارمەتی هێزی شارەزوور دەبوو، هەر کە ناچار دەبوون داوای کۆمەکیان لێ دەکردن و دەڵێ: سوپای بابان بایەخی یەکجار زۆری پێدرا بوو، راهێندرا بوو لەسەر بەرزترین شێوازی مەشق و راهێنانی جەنگی، ژێر دەستەی دەسەڵاتی بنەماڵەیەکی خانەوادەی فەرمانڕەوا بوو، چەکدار و پڕچەك کراو هەر دەم ئامادەی کۆڕ و مەیدانی جەنگ بوو، گەلێ لە سوپای هاوچەشنی ئەوسای عێراق بەرزتر بوو، پۆشتە و پەرداخ بوو، میر و سەرکردەکانی سوپا جل و بەرگی ئاوریشم و نایابیان لە ناو شار لەبەر دەکرد، کەرەستە و شتومەکی نەخشکراو، رەخت و جبەخانەی زۆر و گران بەها.

ئەمانە هەموو شکۆداری و قەشەنگی دابووە شانشینەکەیان، بەڵام سەرەرای ئەم هەموو رووکەشی و توانا و هێزەشیان رووداوی داگیرساوی بەردەوامی ناو خۆیان، هەر جار نا جاری هێنانی هێزی بێگانە بۆ دەست خستنە ناو کاروباری وڵاتەکەیان، ئەمە وای لێ کردبوون کە گومان لێ کراو بن، داخۆ سەر بە چ لایەك و ژێر دەسەڵاتی کام حکومەت بن، تەنانەت ئەو هێزەشیان بوو بە سەرچاوە و هۆیەکی گەورە بۆ گەف و هەرەشەی سەر حکومەتەکەی خۆشیان.

ئەحمەد پاشا دەمری و مەحمود پاشا جێگای دەگرێتەوە، سلێمان پاشا ساڵی ١٧٨٠ بە والیەتی بەغدا دادەمەزرێ، مەحمود پاشا پێنج سەد سواری بە سەرکردایەتی عوسمان بەگی کوڕی بۆ دەنێرێ، بەرهەڵستکارانی والی لەناو دەبەن، سولەیمان پاشا لە مەزنترین والییەکانی مەمالیك بوو و بیست و دوو ساڵ فەرمانڕەوایی بەغدای کردووە. ئەم والییە گومان لە مەحمود پاشا دەکا و لە میرایەتی دەخات، ئیمارەتەکە لە ساڵی ١٧٨٢ بە حەسەن پاشا کوڕی خالید پاشا دەسپێردرێ، پاشان زۆری پێ ناچی مەحمود پاشا ئاشت دەکاتەوە و

دەیهێنێتەوە سەر تەختی فەرمانڕەوایی، لە ساڵی داهاتوودا دووبارە لای دەباتەوە، ئیبراهیم پاشای کوڕی ئەحمەد پاشای برازای دەکاتە جێنشینی. ئیبراهیم پاشا ماوەیەك ژیانی لە بەغدا بەسەر بردبوو، لە ژیانی شارستانیەتی و رابواردنەکەی راهاتبوو لای گران بوو لە گوندێکی پەڕپوتی وەك قەلاچوالان بژی، ساڵی ١٧٨٥ هەستا لە تەنیشت دێی مەڵکەندی کەوتە خانووبەرە دروست کردن، سەرای حکومەت و مزگەوت و بازاڕ و حەمام و میوانخانەی لی بنیات نا، ناوی لێنا "سلێمانی "[٣] لە رێزبادی ناوی سولەیمان پاشای والی بەغدا، لە ساڵی ١٧٨٧ ئیبراهیم پاشایان لی خست، عوسمان پاشایان لە جی دانا، ئەمەشیان بە فەرمانی والی ژهەری دەرخوارد درا و مرد، بۆ ماوەیەکی کەم ئیبراهیم پاشایان گەڕاندەوە ئیمارەتەکەی، پاشان لە١٧٨٩ لایان بردەوە، عەبدولڕەحمان پاشا لە جێی دانرا، بۆ جاری سێیەم ئیبراهیم پاشایان گەڕاندەوە سەر تەختی فەرمانڕوایی، هەتا ساڵی ١٨٠٣ لە موسڵ سەری نایەوە، بۆ دووەم جار عەبدولڕەحمان پاشا هاتەوە سەر کار، والی بەغدا عەلی پاشا، داوای کۆمەك و بەگەڵ کەوتنی سوپاکەی لی دەکات بۆ مەبەستی سەرکوت کردنی وەهابیەکان کە بەسەر شاری بەسرەیان دادابوو، سوپای بابان گەیشتە "احسا" هەرچەندە سەدان جەنگاوەر و سەربازیان لەبەر گەرما و تینوویێتی گیانیان لەدەست دا، بەلام شەری شێرانە و کاری دلێرانەیان ئەنجام دا، کاتی عەبدولڕەحمان پاشا دەگەڕێتەوە سەیر دەکا والی بەغدا لەبەر هەندێك کاروباری نابەدڵ کە هاتۆتە کای گۆڕاوە و نیازی خراپەی هەیە، بۆیە ئەویش لێی هەڵگەرایەوە و خۆی بۆ دەستەوکەری ئامادە کرد. هانای بردە بەر حکومەتی ئێرانی، والی بەغدا بە خۆی و سوپاکەیەوە بەرەو کەرکوك بەری کەوت عبدولڕەحمان پاشاش خۆی لە دەربەندی بازیان قایم کرد. بەلام کاتی سەیری هێزی سوپای دوژمنی کرد

---

3– مێژوو نووسان بەلای ئەوەوە چوون کە شاری سلێمانی بە ناوی "بابا سلێمان" باپیرە گەورەی بنەماڵەی بابان و دامەزرێنەری ئیمارەتەکە کراوە.(وەرگێڕ)

گەڕایەوە سلێمانی، بەڵام لە شەڕەکە شکا و خالید پاشا برای ئیبراهیم پاشای لە شوێنی دانا(١٨٠٥) پاشان بۆ سێیەم جار عەبدولڕەحمان پاشای گەڕاندەوە میرنشینەکەي (١٨٠٦)

لە ساڵی ئایندەدا والی عەلی پاشا دەکوژرێ، سلێمان پاشا ناسراو بە "بچوك" دەکری بە والی، عەبدولڕەحمان پاشا سەرپێچی دەکا و لێی یاخی دەبێ، والی بۆ سەرکورت کردنی کەوتەرێ، هەر دوو سوپاکە لە دەربەندی بازیان بەرەنگاری یەکتر دەبن، عەبدولڕەحمان پاشا دەشکی و بەرەو سنووری ئێران هەڵدێ، سلێمان پاشا کوڕی ئیبراهیم پاشای لە ساڵی ١٨٠٨ کردە میری سلێمانی، زۆری نەخایاند بۆ جاری چوارەم عەبدولڕەحمان پاشا کرایەوە بە میر، عەبدولڕەحمان پاشا بە خۆی و سوپاکەیەوە بۆ پشتگیری لی کردنی دەچێ.

نێردراوی ئاستانە "حالت ئەفەندی " بۆ لادانی سلێمان پاشای والی کە لاساری لە ناردنی باج و خەراجی بۆ سوڵتان کردبوو، شەر لە نێوان ئەم و والی لە دەرەوەی بەغدا روودەدا، والی لە ڕێی گەڕانەوەیدا بۆ پایتەختەکەی دەکوژرێ، عەبدولڕەحمان پاشا داوای لە حکومەتی ئاستانە کرد کە بیکەن بە والی، خواستەکەی نەهاتە جی بەڵکو لە میرایەتیشیان خست.

بۆ جاری دووەم کاروباریان بە خالید پاشای کوڕی مامیان سپاردەوە، لە١٨١١ بۆ جاری پێنجەم عەبدولڕەحمان پاشا گەڕایەوە سەر تەختی فەرمانڕەوایی، لە١٨١٢ زۆری نەخایاند لێیان خستەوە و خالید پاشایان گەڕاندەوە، ئیتر عەبدولڕەحمان پاشا لەشکری کۆ کردەوە و بەرەو بەغدا کشا، لە کفری لەگەڵ سوپای والی عەبدوڵڵا پاشا بەگژ یەکدا چوون، لە شەڕەکەدا تێکدەشکی و بە بیست سواری دوست و پەیوەندی تایبەتی خۆیەوە هەڵدی و روو دەکاتە ئێران.

بۆ جاری سێیەم خالید پاشا فەرمانڕوایی بابان دەگرێتەوە دەست، دیسان بۆ جاری شەشەم عەبدولڕەحمان پاشا سەبارەت بە هەرەشەی عەلی میرزا جێگری شای ئێران پایەکەی پێدراوە، دوای ساڵێك مەرگ جیهانی پی بەجی دێڵێ، ئەمین زەکی بەگ دەڵێ: بێگومان

عەبدولڕەحمان پاشا لە گەورە و سەروەرترین میرەکانی بابان بوو چاو نەترس و ئازا و هۆشمەند و وردبین بوو، هەر چۆنێك بێ مەرج و مەزایەی فەرمانڕەوایی لی هاتبوە جێ، بەڵام خیانەتکاری و هەلپەرستی و دووڕوویی و خۆ گۆڕینی خزمەکانی، تەڵەکەبازی والیەکانی بەغدا، نامەردی میرەکانی ئێران، دژایەتی باری هەڵکەوتەی جوغرافیای وڵاتەکەی، هەرا و ئاژاوەکانی کە لە ناوچەکەدا بەرپا دەبوون، ئەمانە هەمووی بونەتە کۆسپی نەهاتنە دی ئاواتەکانی -لەبەر ئەوانەی کە باسمان کرد- پیاوێکی خواناس و ڕێزگری کاروباری ئایینی و زاناپەروەر بوو، ئەوپەری گیان و هەستی نەتەوەپەرستی تێدا بوو.

نزیکەی بیست و چوار ساڵی پچڕپچڕ فەرمانڕەوایی ئیمارەتی بابانی کردووە، لە بەسەرهات و ڕووداوە گەورە و بچوکەکانی ئەو ماوەیەدا لە ئەندازە بەدەر بەهرە و توانای بەدەرخستووە، میستەر ریچ دەڵێ: عەبدولڕەحمان بۆ دەرباز بوونی لە والیەکانی بەغدا کە وا میرەکانی بابانیان کردبووە داردەستی خۆیان چۆنیان بویستبا رایان دەپەراند، لێیان دەخستن و دەیانکردنەوە میر و فەرمانڕەوا، ئەو هەوڵی دەدا ئیمارەتەکەی ڕاستەوخۆ ببەستێتەوە بە "بابی عالی " لە ئاستانە.

میستەر ریچ دەڵێ: حالت ئەفەندی زۆری لەگەڵ عەبدولڕەحمان پاشا کرد والیەتی بەغدا قبوڵ بکات. بەڵام نەی کرد و وتی: شتێکی باشە ببمە وەزیرێکی پایەبەزر بەڵام کەژ و کێوی سەرکەشی بەفر گرتووی نیشتمانم لا بەرزتر و گرانبهاترە.

# ئیمارەتی مەحمود پاشا

لە ئاکامی کۆچی دوایی عەبدولڕەحمان پاشا لە ۱۸۱۳دا رای هەموو لایەك هاتە سەر ئەوەی کوڕی مەحمود پاشا ببێتە جێنشینی، لەو کاتەشدا حکومەتی بەغدا بە هۆی سەرگەرمی گەنجایەتی سەعید پاشای والی توشی ئالۆزی و شڵەژانی هاتبوو، وەڵلاش زاوەکەشی دەفتەردار داود ئەفەندی دوایی بوو بە "داود پاشا" لێی یاخی دەبێ، لەگەڵ دەست و پەیوەندەکانی بەغدا بەجی دێڵی و روو دەکاتە کوردستان، مەحمود پاشا بانگ هێشتی بۆ چوونە سلێمانی لی دەکات و پێشوازی و بە پیریەوە چونێکی گەرم و بالآیان بۆ کرد، دوای چل رۆژ مانەوەیان لە سلێمانی لەگەڵ مەحمود پاشا و پیاوەکانی بۆ کرکوك بەری کەوتن، چەند لە رێگا بەرەو پێش دەرۆیشتن لایەنگریان زۆرتر دەبوو، لە کۆتایی شوباتی ساڵی ۱۸۱۷ گەیشتنە بەغدا، دوای ئەوەی سەعید پاشا دەکوژرێ... داود لەسەر تەختی والیەتی دادەنیشێ، مەحمود پاشا لە ترسی هەرەشەی حاکمی کرماشان لە داود پاشا هەڵگەرایەوە، ئاژاوە لە نێوان هەردوو حکومەتەکەی بەغدا و ئێران بەرپا دەبێ، پاشان جەنگ لەگەڵ حکومەتی عوسمانی هەڵگیرسا، لەشکری ئێران کشا تا گەیشتە "دەڵی عەباس" بەڵام نەخۆشی رشانەوە قڕانی بە سوپاکەی ئێران هێنا، هەردوو لا رێکەوتن بەو مەرجەی عەبدوڵلا پاشا ببێتە میری سلێمانی. بەڵام زۆری نەبرد مەحمود پاشا پاش ماوەیەکی کەم گەرایەوە ئیمارەتەکەی، لە ساڵی داهاتوو(۱۸۲۲) عەبدوڵلا پاشا دووبارە دەرپەرانەوە و دەستی بەسەر ئیمارەتەکەدا گرتەوە.

# موقیمی بەریتانی بە کوردستان دەگەڕێ

کلۆدیۆس جیمس ریچ بە موقیمی بەریتانی لە بەغدا دادەمەزرێ (١٨٠٨) دەمەقاڵێ و شەرە ئاخاوتنێك لە نێوان ئەم و والی بەغدا روودەدا، لە ئازاری ١٨٢٠ بڕیاریدا گەشتێك بە کوردستان دا بکا، ئەو سەردانەشی لە کتێبەکەیدا لە ژێر ناوی "چیرۆکی نیشتەجێ بوون لە کوردستان" تۆمار کردووە، دوای مردنی ژنەکەی لە ساڵی ١٨٣٦ بە چاپی گەیاندووە، ئەم کتێبەش بهائەددین نووری وەریگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی لە ژێر ناوی "رحلە ریج فی العراق عام١٨٢٠" و لە ساڵی ١٩٥١ چاپی کردووە. موقیمی بەریتانی لە گەشتەکەیدا نووسەرە فارسییەکەی "محەمەد کوڕی حوسێن" ناودار بە "المنشئ البغدادی " لەگەڵ خۆی دەبا، هەروەها گەشتەکەی بە زمانی فارسی بۆ تۆمار کردووە. عەباس عەزاوی وەریگێڕاوەتەوە سەر زمانی عەرەبی و ناوی ناوە "رحلە المنشئ البغدادی " و لە ساڵی ١٩٤٨ بە چاپی گەیاندووە.

ریچ لە تشرینی یەکەمی ١٨٢٠ لەگەڵ "المنشئ البغدادی " سەردانی سلێمانی دەکات و چەندین جار دیدار و چاپێکەوتنی لەگەڵ مەحمود پاشا دا بووە، لە باسکردنی شارەکەشدا: ژمارەی دانیشتوانی بە دەهەزار کەس و خانوەکانیشی بە ٢١٤٤ خەملاندووە و لەمانە ١٣٠ماڵە جوولەکە و نۆ ماڵ کلدانی و پێنج ماڵ ئەرمەنی بووە، پێنج مزگەوت، کەنیسەیەکی بچوك، شەش ئوتێل و پێنج گەرماوی تێدا بووە، لە دەوروبەری شارەکەشدا گەلێ کەلاوە و خانوی روخاوی لێ بەدی کردووە. لەوی توشی پیاوێکی پیری خەڵکی گوندی دارشمانەی نیشتمانی خێزانی بابانەکان دەبێ، چیرۆکی فەقی ئەحمەدی باپیرە گەورەیانی بۆ دەگێڕێتەوە گوتویەتی: فەقی ئەحمەد لە دوژمنکاریەتی عەشیرەتی بلباس کە بەهێزترین عەشیرەتی پشدەرە بێزار دەبێ و روودەکاتە ئاستانە، خۆی تێکەڵ بە سوپاکەی دەکا، لەو کاتەشدا سوڵتان لەگەڵ "فرەنج" لە ناحەزی و شەر و جەنگدا بووە، فەقی ئەحمەد بۆ یەکێك لە سوارچاك و ئازاکانی فرەنج دێتە مەیدان و بە سەریدا زاڵ دەبێ و لە عاردی

دەدا، کە سەیر دەکا ئەوا ئافرەتێکە جلی پیاوانی پۆشیوە، ئەم ژنە مارە دەکا، لەسەر خواستی خۆی سوڵتان ئیمارەتی گوندی دارەشمانە و دەورووبەری پی دەبەخشێ... ئیتر لەگەڵ ژنە فەرەنگیەکەی دەگەرێتەوە گوندی خۆی، دوو کوری لەو ژنە دەبێ، یەکیانی ناو ناوە بابا سلێمان و ئەوی تریان بوداق کیغان، پاشان ژنەکەی پاش ئەوەی هێرش دەباتە سەر بڵباسەکان چواریان لێ دەکوژرێت و بۆی دەردەچێت و دەگاتەوە وڵاتەکەی خۆی، فەقی ئەحمەد بەدوایا دەچی و دەیدۆزێتەوە، دەیهێنێتەوە پشدەر.

"منشئ البغدادی " دەڵێ: لە سلێمانی ٣٠٠ ماڵە جوولەکە، پەنجا ماڵە دیانی کلدانی و شەش هەزار ماڵی کوردی شافیعی لێیە و دەڵێ: فەرمانرەواکان پاشاکانی بابانن، خەڵکەکەی تریش کرمانجن، هەر چوار لای شارەکە بە چیا دەورە دراوە، دووسەد گوندی لە دورروبەرە، تەنیا خورما و نارنج نەبی دەنا هەموو جۆرە میوەجاتێکی هەیە، ئاوەکەی کارێز و کانیاوە، سوارەی بابان لە وڵاتی "رۆم" بە ئازا و نەبەرد ناسراون.

ریچ باری نالەباری ئیمارەتی بابان و شاری سلێمانی دەردەخات و دەڵێ: یەك لە میرەکان پیی گوتم: حەسادەتی خۆبەخۆیی میرەکانی بۆتە هۆی نزمی و پەرێشانیان ئەگەر حەسوودی و رکابەریان لە نێوان دا نەبوایە ئەوا حکومەتی عوسمانی و ئێرانی پێیا نەدەوێرا و نەیاندەتوانی بییان بەزێنن، مەحمود پاشا پێی دەڵێ: گەشە کردن و راست کردنەوەی باری حکومەتی بابان زەحمەتە مەگەر خوا بۆ میرەکانی بابان دەردی تاعون بنێری تاکە کەسێکی لی دەربچی ئەوانیتر هێچیان هەڵ نەبوێری و هەموویان لەناو ببا. ریچ میری لەبارەی وێران بوونی سلێمانی دوواندوە.

مەحمود پاشا بەداخ و حەسرەتێکەوە وڵامی داوەتەوە: ئەگەر پشوێك بدەن و دەرفەتی ئاسودە و حەسانەوەیان ببی ئەوا ئاوەدانیان دەکردەوە و خانوبەرەی جوان و قەشەنگیان لی بنیاد دەنا، خۆ ئەگەر فەرمانرەواییەکەی کات و دەرفەتی مانەوەی زۆر بێ، ئەوا بۆ بەختەوەری و خۆشگوزەرانی خەڵکەکە و بڵاو کردنەوەی هێمنی و ئاسایش کاری دەکرد، بەڵام کێشە و ئاژاوەی بەردەوام بۆتە هۆی کزی و کەسادی بازرگانی و ئیش و کار.

## دووا رۆژانی دەوڵەت

مەحمود پاشا بۆ جاری سێیەم فەرمانڕەوایی سلێمانی گرتە دەست. عەبدوڵلا پاشا ساڵی ١٨٢٣ بۆ حاکمیەتی کۆیە گواسترایەوە، پاشان شەر لە نێوان مەحمود پاشا و محەمەد پاشای رواندوزی بەرپا بوو، بەڵام بابانی بە یارمەتی سوپای ئێرانی توانی بە تێکشکاوی بیانگەڕێنێتەوە. داود پاشای والی کەوتە ناحەزی دەوڵەتی بابان و هەوڵ و تەقەلای لەناو بردنی دەدا. سوپایەکی بە سەرکردایەتی محەمەد پاشا کوڕی خالید پاشا بۆ بەگژچوونیدا نارد، هەرێمی بابان خاپور و وێران بوو، مەحمود پاشا بۆ پاراستنی حکومەتەکەی چاری ناچار بوو دیسان هانا بباتەوە بەر ئێران، پاشان کێشە و ناکۆکی لەگەڵ رواندوزی پەیدا بۆوە. سلێمان بەگی برای مەحمود پاشا ئەوەی بە هەل زانی لە١٨٢٧ سلێمانی داگیر کرد، مەحمود پاشا پایتەختەکەی بەجێهێشت، چووە قزڵجە و دوایی بە ناچاری ئەم جارەش رووی کردەوە ئێران، حکومەتی ئێران بە هانای هات و توانی بگەڕێتەوە سلێمانی و براکەی لێ دەرپەڕاند. بەڵام سلێمان ملکەچی بار و ئەمری واقیع نەبوو، دووبارە بە یارمەتی داود پاشا هێرشی هێناویەوە بۆ سەر برا گەورەکەی، شکاندی و وای لێکرد دیسان بۆ ئێران هەڵێت، شەر لە نێوان دوو برا بەردەوام بوو، مەحمود پاشا پشتی بە عەباس میرزا جێگری ئێران و سلێمان ... لە دوایيدا بووبە "پاشا" پشتی بە والی بەغدا دەبەست. لە ئەنجامدا مەحمود پاشا سەرکەوت و لە١٨٣٠ گەڕایەوە بارەگای فەرمانڕەواکەی.

محەمەد ئەمین زەکی دەڵێ: ئەم شەرە بەردەوامەی نێوان دوو برا ئیمارەتەکەی لاواز کرد و هێزی لەبەر بڕی، وڵاتەکەشی بەرەو وێرانی و کاول کردن برد. زیانی گیان و ماڵ و سامان نایەتە سەر ژمارە، جڵەوی کاروباری وڵاتی بابان لە دەست میرەکانی بابان چووبووە دەر، دەسەڵاتی حوکمڕانی کەتبووە ژێر دەستی ئێران و بەغدا، ئەو هێز و توانایەی کە لە سەردەمی عەبدولڕەحمان پاشا هەیبوو گیانی بەغدای هەژاند بوو، تا ئەوەی کار و باری

عێراق لە ژێر ئارەزووی میرەکانی بابان بەڕێوە دەچوو، ئێرانی تۆقاندبوو، کەچی لەم سەردەمەدا لە ژێر دەستی چەند هەزار سەربازێکی شڕ و پەرێشانی ئێرانی مل کەچ بوون، تووشی نەهامەتی و وێرانکاری و نەبوونی و بێدەسەڵاتی هاتن، گێچەڵ و فیتنە و ئاژاوە بوونی هەمیشەیی نێوان خۆبەخۆیی، میرەکانی بابانی کردبووە بڵقی سەر ئاو. لەو کاتەش دا ئیمارەتی سۆران بەهۆی محەمەد پاشای ڕەواندزی تەواو پێشکەوتبوو نەخۆشی تاعون لە هەموو ناوچەکانی عێراق و کوردستان و ئێران بڵاو ببۆوە، بە جاری وەك گەڵاڕێزانی پایز خەڵکی دادەوەراند، لەگەڵ ئەوەشا شەر لە نێوان مەحمود و سلێمانی برای هەر بەردەوام بوو، بەڵکو گەرمتر بوو هەردووك بارتەقای یەکتر تا ئەوەی مەحمود ناچار دەبێ لە١٨٣٤ وڵاتەکەی بەجێ بهێڵێ و بچێتە ئاستانە[4]، لەو کاتەدا دەوڵەتی عوسمانی توانی کۆتایی بە حوکمڕانی مەمالیك بێنی لە بەغدا، سوپاکەی ئابڵوقەی شارەکەی دا بەسەر داود پاشا زاڵ بوو، جێگرە نوێیەکەی عەلی ڕەزا پاشای والی لە١٨٣١ بۆ ئاستانە راپێچ درا، ڕەواندوزی هەوڵی دا باری ئاڵۆزی ئیمارەتی بابان هەلێکی ڕەخساوی دەست بەسەر داگرتنی بێ، والی بەغدا و حکومەتی ئێرانی بۆ بەربەستی مەبەستی پاشای ڕەواندوزی ڕێك کەوتن کە وا پشتگیری سلێمان پاشای سلێمانی بکەن، لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کە هێڵی رانیە و زێی گچکە، سنوور و تخوبی نێوان هەردوو ئیمارەتەکە بێ، لای راستی بۆ ڕەواندوزی و لای

---

4- لە ئاکامی بەردەوامی شەر و ناکۆکی ئەو دوو برا میرە، دانیشتوانی کەم بوونەوە، تاعونیش بۆتە سەری نەگبەتییەکە، کە "فریزەر" لە سەردەشتەوە بەرەو سلێمانی بەری دەکەوی بە درێژایی ڕێگا گوندێکی ئاوەدان بەدی ناکات، تەنانەت کە دەگاتە سلێمانی بە ناو کەلاوەی خانووی رووخاو دا دەیبەن بۆ ئەو خانووە داتەپیوەی بۆی تەرخان کرابوو، بەریەك نابی بۆی رابخەن!! سلێمان پاشاش لە کەناری شاردا لەناو خێوەتێکی هەژارانەدا بی هیچ دەبدەبەیەکی پاشایانە پێشوازی لەم میوانە دەکات، خەڵك ئەوەندە هەژار و نەدار دەبن کاتێك سەرکردە ئێرانییەکە روو لە پاشای بابان دەنی ٢٠٠ تمەنیان بۆ پێویستیەکانی ژیانیان بۆ پەیدا بکا، سلێمان پاشا بە خۆی و هەموو دەوڵەمەندەکانی سلێمانی ئەم پارە کەمەیان بۆ هەڵ ناسوورێ!! (وەرگێڕ)

چەپی بۆ بابان، بەشی رۆژئاوای دەربەند بۆ حکومەتی رەواندوز و لای رۆژهەلأتی بۆ حکومەتی سلێمانی بێ، لەو کاتەش دا حەمە(محەمەد شەریف) سەرۆکی هەمەوەند کە بە ئازا و جەربەزە و چەتوونی ناسرا بوو کەوتە بەربەرەکانی سلێمان پاشا، بەلأم محەمەد شەریف لە نزیك سلێمان دەکوژرێ، ئیتر دنیا بۆ ئەو ئەمیرە بابانییە ئاسودە و هێمن دەبێ تاکو لە ۱۸۳۸ کۆچی دوایی دەکات، ئەحمەد پاشای کوڕە گەورەی دەبێتە جێنشینی، وەك محەمەد ئەمین زەکی دەڵێ: ژیر و هۆشمەند و لاوچاك بوو، هەندێك ئارەزوومەندێتی زەبر و زەنگ و چوونە مەیدانی هەبوو، سوپایەکی مەزنی پڕچەکی نوێی دامەزراند، ئۆردوگای لە دەرەوەی شار بۆ دانا. بەلأم مەحمود پاشای مامی بە پشتیوانی سوپای ئێرانی دەگەڕێتەوە سلێمانی و داگیری دەکا، حکومەتی ئێرانی کە ناچار دەبێ هێزەکانی خۆی بکشێنێتەوە ئەحمەد پاشا لە۱۸٤۲ دەگەڕێتەوە سلێمانی، ئەوەی شایانی باسە میری سۆران محەمەد پاشای رەواندوزی هێرشی بردە سەر یەزیدیەکان سەری لە دونان تا گەیشتە ناوچەی موسڵ، دەوڵەتی عوسمانی بڕیاری لەناو بردنی دا، سوپایەکی گەورەی بە سەرکردایەتی والی سیواس سەردار رەشید محەمەد پاشای هەناردە سەری، فەرمانیش بە والی بەغدا و موسڵیش درا کە پشتگیری بکەن، بەر لەوەی بکەونە جەنگ و بەرەنگار بوون سەردار رەشید محەمەد پاشا داوای سەرپێچی و یاخی نەبوونی لە محەمەد پاشا کرد. بە بی شەر خۆی بەدەستەوە دا و رەوانەی ئەستەنبوڵی کرد، دوای ئەوە هەر چۆنی بووبی لە -ترازبوون- یان سیواس دەکوژرێ... ئیتر ئیمارەتی سۆران ساڵی ۱۸۳٦ لەناو دەچێ، لە هەمان کاتیشدا ئیمارەتی عەمادیەش لە لایەن ئیسماعیل پاشا کوڕی تەیار پاشا کە لە عەلی رەزا پاشای والی هەڵگەرایەوە ئابڵوقەی ئامێدی داو ئەمیرەکەی گرت و بۆ بەغدای دوور خستەوە، بەم جۆرە ئیمارەتی ئامێدیش لەناو برا، ولأتەکەشیان خستە سەر موسڵ.

دوارۆژانی ئەحمەد پاشا لە ئاشوب و شەر و شوڕ بەدەر نەبوو کە محەمەد نەجیب پاشا لە۱۸٤۲ لە جێگای عەلي رەزا پاشا بە والیەتی بەغدا دانرا، بڕیاری لەناو بردنی ئیمارەتی بابانی دا و خستیە سەر دەوڵەت و سەبازی تورکی لە ئۆردوگای شارەکە دانا، داوای لە

ئەحمەد پاشا کرد بێتە بەغدا، لە ساڵی ١٨٤٧ عەبدوڵڵا پاشای کردە قایمقامی قەزای سلێمانی، والی گەورە نامیق پاشا ساڵی ١٨٥١ عەبدوڵڵا پاشای لە قایمقامی خست و رەوانەی ئاستانەی کرد، بۆ ماوەیەکی کەم لە بنەماڵەی بابان عەزیز بەگی لە جێگا دانا، پاشان میر لیوای سوپای عوسمانی ئیسماعیل پاشای کردە قایمقامی سلێمانی، بەمەش کۆتایی بە ئیمارەتی بابان هات.

عەباس عەزاوی لە کتێبەکەیدا "*عشائر العراق الكردية-الجزء الثاني*" لە ئەحمەد حەمدی کوڕی خالید کوڕی بابا سلێمانی بیستووە و دەڵی کە وا: سەرەتای ئیمارەتی بابان دیار نییە، بەڵام مێژووەکەی لەوەتەی ساڵی ١٤٩٥ هەتا لەناو چوونی لە١٨٤٧ زاندراوە، میری ئیمارەتی بابان سلێمان پاشا ساڵی ١٨١٠ بەغدای داگیر کردووە. دەڵێن گوایە لەگەڵ هۆزی بلباس و پشدەر دەچنەوە سەر خالید-ناوێك- بەڵام "*ابا الثناء الالوسي*" ئەوە بە راست نازانێ، لە بنەماڵەی بابان زۆر پیاوی هۆشمەند و ناودار دوای لەناو چوونی دەوڵەتەکەیان هەڵکەوتن، پایەی بەرز و گەورەیان لە دوڵەتی عوسمانی، دوای ئەوە لە حکومەتی عێراق لە سەردەمی پاشایەتی دا بەدەست هێناوە، لەوانە: موفتی بەغدا، فەیزی زەهاوی (نەوەی میر سلێمان پاشا) و کوڕەکەی جەمیل سدقی شاعیری گەورەی عێراق.

# ناودارانی بابان دوای نەمانی دەوڵەتەکەیان

## ئەحمەد پاشا

ئەحمەد پاشا کوڕی سلێمان پاشا دوا میری بنەماڵەی بابانەکان بوو، ساڵی ۱۸٤۷ لە ئیمارەتەکەیان لادا، ڕەوانەی ئەستەنبوڵیان کرد، لە۱۸٥٦ کردیانە والی یەمەن، پاشان والی وان۱۸٦۳، جارێکی تر بە پایەی وەزیر دەیکەنەوە والی یەمەن۱۸٦٤، دوایی بە والیەتی دەگوازرێتەوە بۆ ئەرزەرۆم۱۸٦۷-۱۸۸۰، دوای ئەوە دەبێتە والی ئەتەنە، لە کۆتایی ئەو ساڵەدا کۆچی دوایی دەکات. کوڕەکانی: ئەحمەد پاشا، خەلیل خالید پاشا، میرلیوا مستەفا پاشا و عیزەت پاشا بووە.

## عەزیز بەگ بابان

عەزیز بەگ کوڕی عەبدولڕەحمان پاشای مامی ئەحمەد پاشای دوا میرەکانی بنەماڵەی بابانە. لە ئاکامی دامەزرانی عەبدوڵڵا پاشا بە قایمقامی سلێمانی عەزیز بەگ لەگەڵ مەحمود بەگی ساحێبقڕان سلێمانی بەجی دێڵن، لەگەڵ هەندێك لە عەشیرەتی هەمەوەند بۆ مەبەستی بەگژدا چوونی لەشکری عوسمانی ڕێك دەکەوێ، هەردوو لەشکر لە نزیك کرپچنە و دەربەندی بازیان بەرەنگاری یەکتر دەبن، مەحمود بەگ دوای ئەوەی هەمەوەندەکان وازی لی دێنن لە دەوروبەری ساڵی ۱۸٤۸ یا ۱۸٥۰ لە کەرکوك دەکوژرێ، بەڵام عەزیز بەگ لە بەربەرەکانی سوپای تورکی بەردەوام دەبێ... تا لەو هات وهەرایەدا ئەویش لەناو دەچێ.

## عەبدوڵڵا موسیب پاشا

برای هەرە بچوکی ئەحمەد پاشایە، والی بەغدا دەیکاتە قایمقامی سلێماني(۱۸٤۷-۱۸٥۱) پاشان دەینێرنە ئاستانە، دوای ئەوە بە پایەی بەرێوەبەرایەتیەکان دادەمەزرێ، قایمقام پاشان موتەسەریفی چلدر، عرش، بەنی غازی و خەربوت، دوایی بە پایەی وەزیر دەبێتە والی بەسرە(۱۸۷۷)، کاروبارەکەی دوو ساڵ هەڵسوڕاندووە، پاشان دەچێتە بەیروت، لەوی لە ۱۸۸۱ کۆچی دوایی دەکات.

## محەمەد رەشید پاشا

کوڕی سلێمان پاشای کوڕی عەبدولڕەحمان پاشایە، ساڵی ١٨٢٢ لە شاری سلێمانی هاتۆتە دنیا، فەرمانی بەڕێوەبەرایەتی لە ولایەتی بەغدا بینیوە، دوو جار دەبێتە موتەسەریفی حیللە و مونتەفیك و موتەسەریفی تەعز(لە یەمەن) و دێرزور، پاشان بووەتە والی بەتلیس(١٨٨٢-١٨٨٦) دوای ئەوە لە ئاستانە نیشتەجی دەبێ و لەوی لە١٨٩٥ کۆچی دوایی دەکات.

یەعقوب سەرکیس دەڵێ: کە محەمەد رەشید پاشا موتەسەریفی حیللە دەبێ، بە زەبر و توند و تیژی دەناسری تا ئەوەی پێیان وتووە "خدێو" واتە ئەمیر. موڵك و زەوی و زارێکی زۆری لەو لیوایەدا هەبووە.

## خەلیل خالید پاشا

کوڕی ئەحمەد پاشای دووا میرەکانی بابانە لە شاری سلێمانی بە دیل دەگیرێ، بۆ والی بەغدا نەجیب پاشای دەنێرن، ئەویش رەوانەی ئاستانەی دەکات و لەوی دەچێتە خوێندگای جەنگی، بە ئەفسەر دەردەچێ، ماوەیەك دەبێتە مامۆستا پاشان بە وەرگێڕ لە وەزارەتی دەرەوە دادەمەزری ١٨٧٣، دوایی بە نووسەر دەگوازرێتەوە بۆ باڵیۆزخانەی تورکی لە پاریس و لەندەن، بۆ ئاستانە دەگەرێتەوە و دەبێتە مامۆستای ئەمیر محەمەد رەشادی جێنشین "*ولی العهد*"، دوایی بە دەست نیشان کردنی سنووری قەرەداغ ئیمارەتی "جبل الأسود"یان یان"مۆنتغرۆ" هەڵساوە، دەیکەنە سەفیر لە شاری "جتینجە" پایتەختی ئەو ئیمارەتە، بە باڵیۆز بۆ بولگراد دەگوازرێتەوە، پاشان بۆ تاران، نزیکەی دە ساڵی لی دەمێنێتەوە، لە ساڵی ١٨٨٩ دەبێتە والی ئەتەنە بەڵام لەو پایەدا دەست بەکار نابێ، بەڵکو بە والیەتی بەیروت دادەمەزری و نزیکەی دوو ساڵی لی بەسەر دەبا، لە ساڵی ١٨٩١، بۆ والی قەستمونی دەگوازرێتەوە بەڵام بێپرس و را بەجێی دێڵی و دەگەرێتەوە ئاستانە و واز لە

پایەکەی دینی بەلام "باب العالی " بە واز هێنانەکەی قایل نابێ. حکومەت لێی دەکەوێتە گومانەوە، لە١٨٩٣ بۆ قەیسەری ئاوارەی دەکەن، لەوی دەمێنێتەوە هەتا مەرگ لە١٨٩٩ یەخەگیری دەبێ.

محەمەد ئەمین زەکی دەڵێ: ئەو پیاوە ئەدیبێکی بەرز و بەتوانا بوو، ئاگاداری حاڵ و بار و نەریتی ئەورووپا بووە، پێنج شەش زمانی دەزانی و شارەزایی ئەدەبەکەشیان بووە.

## محەمەد شەریف پاشا

گەورە کوڕی سەعید پاشای کوڕی حوسێن پاشای کوڕی ئەحمەد ئاغای بنەماڵەی خەندانە، هەندێك جار بە جەنەراڵ شەریف سەبری پاشا ناوبراوە، ساڵی ١٨٦٥ لە ئەستەنبوڵ هاتۆتە جیهان، چۆتە ناو سوپا، گەیشتە پایەی "فەریق-سوار"، لە ساڵی ١٨٩٠ چۆتە خوازبێنی "ئەمیرە ئامینە"ی کچی محەمەد عەبدولحەمید پاشا کوڕی محەمەد عەلی پاشای والی میسر کە دەکا خوشکی محەمەد سەعید حەلیم "سەدری ئەعزەمی ی تورك) ئەو خاتوونە ساڵی ١٨٦٨ لە قاهیرە لەدایك بووە و لە ئەستەنبوڵ مارەیی براوە، لە ١٩٢٦ لە پاریس کۆچی دوایی کردووە.

شەریف پاشا لە ساڵی ١٨٩٨ بە وەزیری مفەوەزی تورکی لە ستۆکهۆڵم دامەزراوە... هەتا ساڵی ١٩٠٩ لەم پایەدا دەمێنێتەوە، لە ساڵی ١٩١٣ تاوانی بەشدار بوونی لە کوشتنی مەحمود شەوکەت پاشای خراوەتە پاڵ. پاشملە حوکمی لە سێدارە دانی بەسەر دا دەدرێ، ناگەڕێتەوە تورکیا بەڵکو هەر لە دەرەوە دەژیا هەتا لە ساڵی ١٩٤٤ کۆچی دوایی دەکات.

کە کۆنگرەی ئاشتی لە ساڵی ١٩١٩ لە پاریس دەبەسترێ، یاداشتێکی داواکاری مافی نەتەوەی کوردی بە هاوبەش بوونی "بوغوس نوبار پاشا"ی نوێنەری ئەرمەن(١٨٥٨-

۱۹۳۰) پێشکەش کردووە. هەردوو نوێنەرەکە لەسەر ئەوە رێککەوتن لە هەوڵ و کۆششیان بۆ وەدەست هێنانی مافی نەتەوەکانیان بکەن بە یەك.

شەریف پاشا لە۱۹۲۰ لیژنەیەکی بە سەرۆکایەتی خۆی بە ناوی خۆیبوون لە پایتەختی فەرنسا پێك هێنا، هاوپەیمانەکان لە ۱۰ی ئابی ۱۹۲۰ دا (پەیمانی سیڤەر) یان لەگەڵ تورکیا دا بەست، تورکەکان دانیان بە دەوڵەتی ئەرمەنی سەربەخۆ نا، پەیمانەکە ئەوەشی گەیاند کە وا لیژنەیەك لە نوێنەرانی بەریتانیا، فەرەنسا و ئیتالیا لە ئەستەنبول پێك بهێنرێ بۆ دانانی پرۆژەی بەڕێوەبەرایەتییەکی ناوخۆیی سەربەخۆ بۆ ئەو ناوچە کوردییانەی کە کەوتوونەتە رۆژهەڵاتی فورات و باشووری ئەرمینیا و باکوری سنووری تورکیا و سوریا و عێراق، بەڵام مستەفا کەمال (ئاتاتورك) سەرکردایەتی بەرگری کردنی دژ بە سوڵتان و هاوپەیمانەکانی لە ئەنەزۆڵدا کرد، بەسەر یۆنانیەکاندا زاڵ بوو، پەیمانی سیڤەر نەبەسترا، بەڵکو پەیمانی "لۆزان" لە ٢٤ی تەممووزی ۱۹۲۳ لە جێگای ئەوا مۆر کرا.

بەندەکانی پەیمانی پێشوی تایبەت بە ئەرمینیا و کوردستان لادرا، شەریف پاشا بۆ دوورەپەرێزی و لاتەریك بوونەکەی خۆی دەگەڕێتەوە[5]، جەنەراڵ حەسەن ئەرفەع لە

---

5- دڵپاکی و خۆشبڕوایی ئێمەی کورد گەلی هەلومەرجی لەباری مێژوویی لەدەست داوین، دوژمنانمان توانیویانە بە ناوی ئایینەوە یان برایەتی و پەیمان و بەڵێنی بە درۆ لەخشتە براوین و بۆیان کردووین بە هەوێنی بە ئاوات گەیشتنمان. وەك دکتۆر وەلید حەمدی لە کتێبەکەیا(*الكرد وكردستان في وثائق البريطانية*) دا لە لاپەرە٢٥ دەڵێ: لە ئابی ۱۹۱۹ یەك لە جەنەراڵەکانی سوپای تورکی مستەفا کەمال پاشا توانی هێزەکەی لە ئانازۆڵ کۆ بکاتەوە کە پێکهاتبوو لە ۳٥هەزار سەرباز -وە لە بارەگاکەی لە شاری "سیواس" دامەزرا بە مەبەستی بەرگری و دژایەتی هاوپەیمانەکان- لە کاتێك دا لە ئایاری ۱۹۱۹ شاری "سمیرنا"ی تورکی لە لایەن یۆنانیەکانەوە داگیر کرابوو -بە پەیدا بوونی مستەفا کەمال سەرکردەکانی کورد کەوتنە خۆیان و هەستیان بە مەترسی ئەنجام نەگەیشتنی مەسەلەی کورد کرد لە "*محطة*" نزیك شارۆچکەی "مەلاتیا" کۆبوونەوە، هێزێکی کوردیان بۆ رووبەروو بوونەوە و لەناو بردنی هێزەکەی

کتێبەکەیدا (الاکراد) کە وا لە ساڵی ١٩٦٦ لە نیویۆرك بە زمانی ئینگلیزی دەرچووە، لەسەر شەریف پاشای نووسیوە کە وا دۆستایەتی و شوناسی کەسایەتی لەگەڵیا هەبووە.

**حەسەن ئەرفەع:**
سوپا سالاری سوپای ئێرانی بووە، پاش ئەوە پایەی دەکری بە باڵوێزی ئێران لە تورکیا

---

مستەفا کەمال پێك هێنا، کەچی لەو ئانەدا مودیری موخابەراتی بەریتانی "عقید بیل" لە حەلەبەوە دەگاتە ئەوێ. بە ناوی حکومەتەکەیەوە -واتە حکومەتی بەریتانیا- پێیان رادەگەیەنی کە بە هیچ کارێکی سوپایی دژ بە مستەفا کەمال هەڵنەستن، چونکە هاوپەمانەکان هەروەك بەڵێنیان پێداون رشتن لەسەر جێبەجی کردنی مەسەلەی کورد. ئیتر ئەوە وای لە کوردەکان کرد لە بە تەفروتونا کردنی هێزی جەنەرال مستەفا کەمال بە هاوکاری ئەرمەنیەکان هەڵنەستن. لە کاتێکدا کۆماری یەریڤان بە ئاسانی دەیتوانی ئەرمینیای تورکی داگیر بکا. بەم جۆرە کوردەکان و ئەرمەنیەکان بە هۆی پشت بەستن بە نیازپاکی هاوپەمانەکان و دڵنیا کردنیان کەوتنە هەڵەیەکی گەورەوە. "وەرگێڕ"

# مەسەلەی کورد لە کۆنگرەی قاهیرە

لە مانگی ئازاری ساڵی ١٩٢١ کۆنگرەی قاهرە بە سەرۆکایەتی وەزیری موستەعمەرات ونستون چەرچڵ بۆ نەهێشتنی گیروگرفتەکانی رۆژهەڵاتی ناوەراست بەسترا، بڕیاری پالاوتنی ئەمیر "فەیسەڵ" بۆ پاشایەتی عێراق درا لە ١٥ی ئازار لە کۆبوونەوەی پێنجەمدا باسی دوارۆژی کوردستانی تێدا کرا، مەندووبی سامی سێر (برسی کۆکس) ئەوەی دەرخست کە: ئەو ناوچانەی کوردنشینن کەرکوك و سلێمانی و هەندێك قەزای باکوری موسڵ بەشێکن لە عێراق و جیاناکرێنەوە، لەم رایەشیدا سکرتێری کاروباری رۆژهەڵات (میسس بیل) لایەنگری دەکات، بەڵام مێجەر (هیوبرت یانگ) کە یەکێك بوو لە فەرمانبەرانی وەزارەتی موستەعمەرات- بەشی رۆژهەڵاتی ناوەراست- دواتریش لە عێراق کارمەند دەبێ بەرهەڵستی دەکا و وای پێشنیار کرد کەوا دەستبەجی دەوڵەتێکی کوردی دامەزری و راستەوخۆ لە ژێر چاودێری مەندووبی سامی بەریتانی بی نەك سەر بە حکومەتی عێراق، لەمەشدا مێجەر نۆئیل کە لە کوردستانا کارگوزار بووە و لە شارەزاترین فەرمانبەرانی بەریتانییە لە کاروباری کوردیدا پشتگیری رای یانگ دەکا و دەڵێ: کوردەکان وایان لا باشترە کەوا بەرێوەبەرایەتییەکی ناوخۆی سەربەخۆییان هەبی و ناوچەیەکی بێلایەن لە نێوان تورکیا و ئێران پێکبێنن.

پاش وتوویژ کۆنگرەکە بڕیاری لە سەر راکەی مێجەر یانگ دا کە ناوچەی کوردەکان لە بەرێوەبەرایەتیەکەی عێراق جیا بکرێتەوە، بەڵام لە هەمان کاتیشدا بڕیاری ئەوەشی دا کە ئەو تەرتیباتە کاتێك ئەنجام بدری کە دەستەیەك بە رێکوپێکی لە کوردەکان پێکدەهێنری، کە ئینگلیزەکان کوردستانیان لە کۆتایی ساڵی ١٩١٨ داگیر کرد شێخ مەحمود بەرزنجییان لی کردە فەرمانڕەوا، بەڵام هەندەی نەبرد لە ١٩١٩ سەربەخۆیەتی خۆی راگەیاند، هێزی

بەریتانیایان بە گژەوە نا، شاری سلێمانیان دوبارە داگیر کردەوە، شێخ مەحمود دەگیرێت و بۆ هندستیان دوور دەخرێتەوە.

لە ئەیلولی ١٩٢٢ دەگەرێتەوە سلێمانی، دووبارە دەسەلاتداریتی کەوتەوە دەست، کەچی هەندەی پێنەچوو شۆرشی نایەوە و خۆی کردە مەلیکی کوردستان، سوپای عێراق بە یارمەتی ئینگلز بەرەنگاری بوو لە تەموززی ١٩٢٤دا سلێمانی داگیر دەکەن، لەگەڵ ئەوەشدا شێخ مەحمود لە راپەرینەکانیدا هەر بەردەوام بوو، بەڵام لە راستی و واقیعدا سلێمانی و ناوچە کوردییەکان بوونە بەشێك لە مەملەکەتی عێراق بی ئەوەی گوی درێتە بریارەکانی قاهرە.

## شێخ مەحموود



ناسراو بە حەفید کوڕی شێخ سەعیدی کوڕی کاك ئەحمەدی شێخ مەعروفی نۆدێیە، ئەو شێخ مەعروفەش کوڕی مستەفا کوڕی ئەحمەدی نۆدێی شارەزووری بەرزنجیە، لە پیاوە بەرزەکانی (تەسەوفی) ناوچەی سلێمانیە، چۆتە گوندی نۆدێ. لە ساڵی ۱۷۵۳ لە شارەزوور هاتۆتە دنیا، لە ۱۸۳۸ لە سلێمانی کۆچی دوایی کردووە، زۆر کتێبی لە سەر: عەقائید، فەرائیز، مەنتیق و (عیلم الاصول) داناوە، هەروەها تەخیسی بوردەشی هەیە. دوای ئەو کاك ئەحمەدی شێخ (۱۷۹۳-۱۸۸۸) ناوبانگی پەیدا کرد، پاشی ئەو شێخ سەعیدی کوڕی سەرۆکایەتی رۆحی لە سلێمانی بۆ مایەوە.

شێخ سەعید لەو هەرا و ئاژاوەیەی کە لە یەکەم رۆژی ساڵی نوێی ۱۹۰۹ کە لە موسڵ بەرپا دەکری دەکوژرێ.[6] شێخ مەحمود لە ساڵی ۱۸۸۱ لە سلێمانی هاتۆتە دنیاوە،

---

[6]– شێخ سەعیدی حەفید پیاوێکی ئاینی و بەتوانا و هۆشمەند بوو، وە بە پێی ئەو پارچە شیعرەی کە بە بۆنەی شێخ مستەفای برای دایناوە توانای شاعیریەتی هەبووە و، شعرەکەش بەم شێوە دەست پێدەکا:

مردنە بێ تۆ ژیانم زەلیلە بێ تۆ عیزەتم

دەردە خۆراکم بە بێ تۆ ژەهری مارە شەربەتم

تۆش وەکو من قوڕ ئەپێوی گەر بزانی عیللەتم

ئەو هەرا فەرتەنەیەی کە لە شاری موسڵ قەوما و ئەنجامەکەی شێخ سەعیدی تێدا دەکوژری بەمجۆرەیە: لە دووەم رۆژی جەژنی ۱۹۰۹/۱/۵ خەڵك بە عادەتی جەژنان لە سەر شەقامەکان لە هاتوچۆدا دەبن. بەهانەدەدین ئەفەندی ناوێك وا پێدەچی سەرخۆش بوو بێت، تواڵێك دەگرێتە ئافرەتێك، ئەویش هاوار

زانیاری شەرع و فقە و تەفسیر و دەستوری سۆفیەتی خوێندووە. لە ١٩٠٤ لەگەڵ باوکیدا دەچێتە ئاستانە، چاویان بە سوڵتان عەبدول حەمیدی دووەم دەکەوێ، لە ئاکامی کوشتنی باوکی لە موسڵ لەگەڵ شێخ ئەحمەد عەلی برای دەگیرێ. لە هەموو ناوچەکانی کوردستاندا جۆش و گڕی ئاگری شۆڕش تینی سەند، ناچار حکومەتی تورکی لە ١٩١٠ بەری دەدا، شوێن و پایەی شێخ مەحمود چەسپا، دەسەڵاتی لە ناو عەشیرەتەکان بەهێز بوو.

کە ئاگری جەنگی یەکەمی جیهانی هەڵگیرسا بانگەوازی جیهاد راگەیاندرا. شێخ راپەری، بە خۆی و سەدان سوارەی ئازای لایەنگرانی لە ١٩١٥ کەوتە شەری دژ بە ئینگلیز لە (شعێبە). دوای هەشت مانگ دەگەرێتەوە سلێمانی، پاشان کاتی لەشکری رووسی گەیشتە سەر سنووری باکوری عێراق، پیاوە جەنگاوەرە ئازا و چاو نەترسەکان بەریان لە سوپاکە گرت و شەرێکی دلێرانە لە پێنجوێن بەرپا بوو، لی نەگەرا تێپەرن، پاشەو

---

دەکا، خەڵك لە دەوری کۆ دەبنەوە. بەهائەددین بۆ خۆ دەرباز کردن چەند تەقەیەك دەکات ئیتر شەڕ و ئاژاوە بەرپا دەبێ. گۆیا شەرەف و نامووس پێشێل کراوە!! هێستر سواریش کە زۆربەیان کورد بوون جلکی سەربازی و هەندێك جلی کوردییان لە بەر بووە. رووبەرووی خەڵکەکە دەبنەوە ئیتر شەر و کوشتار روو دەدات و تا نیوەی شەو بەردەوام دەبێ. بۆ رۆژی سێیەم شێخ سەعید لە سەر داواکاری والی روو دەکاتە سەرا بە مەبەستی ناوبژی و هێور کردنەوەی باردۆخەکە. چەند جندرمەیەك لە پشت و پێشەوەی و خەڵکیش بە دواوەی دەبن. کە دەگەنە بەر دەرگای سەرا سەیر دەکەن داخراوە !! لەو ئانەدا کابرایەك بەردێکی زل بە سەری شێخ دادەدات و گیانی خەلتانی خوێن دەبێ. بەوەش ناوەستن دەچنە ئەو خانوەی کە شێخ سەعید لێ دابەزیوە، شێخ ئەحمەدی کوڕی و شێخ عەزیز دەکوژن. تاقمی شەرفرۆش شاڵاو دەبەنە سەر ئەو خانوەی دەس و پێوەندی شێخانی لێ بووە سێزدە کەسیان لی دەکوژرێ. شەر و ئاژاوە بەردەوام دەبێ. سەیر لەوەدا بووە کاربەدەستان لەم رووداوە خوێناویەدا دەستە و ئەژنۆ وەستان و بێگومان کەین و بەین و نەخشە و پیلانێك بۆ ئەم کارەساتە لە ئارادا بووە کە شێخ سەعید و چەندین کەسانی تێدا لەناو چوون. سەرجەمی کوژراو لە هەر دوولا (٧٠) کەس و (١٠٠) کەسێکیش برینداربوون (وەرگێر).

پاشی کشاندنەوە. ئینگلیزەکان ساڵی ١٩١٨ کەرکوکیان داگیر کرد و بەجێیان هێشت. پاشان دوای شەش مانگ هاتن دەستیان بەسەردا گرتەوە، لە تشرینی هەمان ساڵدا شێخ مەحمودیان کردە فەرمانڕەوای کوردستان بەڵام زۆری نەبرد کە دیتی لە وڵاتەکەیدا توانا و دەسەڵاتی پەیدا کردووە پشتی تێکردن و لێیان هەڵگەڕایەوە.

لە ١٩ی ئایاری ١٩١٩ سەربەخۆیی ڕاگەیاند، شەر لە نێوانی ئەو و ئینگلیز لە تەنگەبەری تاسڵوجە ڕوویدا، مانگونیوێك شەرەکە گڕی سەند، لە ئەنجامدا ئینگلیزەکان دەگەڕێنەوە شاری سلێمانی، شێخ مەحمود دەستگیر دەکەن و بۆ شاری (بۆمبای) دوور دەخەنەوە، نزیکەی ساڵونیوێك لە هیندستان بەسەر دەبا.

ستیڤن لۆنگریك لە کتێبەکەیدا "العراق١٩٠٠-١٩٥٠" دەڵێ: *"گیروگرفتی کوردستانی باشور لە تشرینی دووەمی ١٩١٨ وای دەخواست کە یاسا شوێنی ئاشوب و ئاژاوە بگرێتەوە، دوور لە زیانبەخشی خەڵکی دراوسی لە فارس و عێراقیەکان، ئەمەش بە بێ بەکارهێنانی هێزی سوپایی نەدەکرا، ئەو هێزەش ئەوسا لە بەر دەست نەبوو..* مێجەر نۆئێل کە ئەفسەرێکی بە توانا و فارسیزان بوو ناردیانە سلێمانی کە شێخ مەحمود بەرزنجی بە فەرمانڕەوای سلێمانی دابمەزرێنێ، پاشان ببێتە یاریدەدەری، هەر لە زێی گەورە هەتا دیالە بانگراهێشتنی سەردار و سەرەك خێڵ و عەشیرەتەکانیش بکرێن، ئەو ڕێوڕەسمەش لە یەکی کانوونی یەکەم لە کۆبوونەوەیەکی گشتی لە سلێمانی بە بەشداربوونی میر و بەگ و ئاغاکان ڕاگەیەندرا، کوردەکانی ئێران بە پێی ڕەگەزنامەکەیان بۆیان نەبوو بکەونە گەڵ ئەو ڕژێمەوە، کوردەکانی کەرکوك و کفری و هەولێر لێی لاتەریك بوون، چونکە ژێردەستبوونیان بۆ حاکمێکی شاخاوی جێگای هۆشمەندی نەبوو[7]، بەڵام هەر لە هەڵەبجەوە تا ناوچەی ڕەواندوز بە دەیان سەرۆك پاڵیان پێدا، لەگەڵ هەندێك تێبینی تەنانەت بۆ

---

7- ئەوە بیروڕای لۆنگیریك خۆیەتی (وەرگێڕ)

ماوەیەکی کەمیش دەسەڵاتی تا ناوچەکانی کۆیە و رانیە و رەواندوزیش چوو، زیانکاریەکانی شەری جیهانی لە شاری سلێمانی بە یارمەتی بەریتانیا زوو چارەسەر کرا، خانووەکان ئاوەدان و چاککرانەوە، تۆ و خواردەمەنییان هێنا موچە و بەراتیان دابەش کرد، کاروان کەوتە هاتووچۆ، کوردی بووە تاکە زمانی رەسمی، لە رۆڵەی کوردیش زیاتر کەسیان لە فەرمانبەران دانەمەزراند- لونگریك- لە سەر ئاخاوتنەکەی دەڕاو دەڵێ: خەریك بوو خەونی کوردەکان لە ژێر چاودێری بەریتانیا بێتەدی، کەچی لە چەند هەینییەك زیاتری نەخایاند. چونکە ئەو تاقیکردنەوەیە مادەیەکی عەمەلی و سەرکەوتووی گەرەك بوو، مێژوونووسی ئینگلیزی دەیخاتە پاڵ ئەوەی کەوا شێخ مەحمود لە سەرداریەتیدا کەسی رکەبەر نەبوو، هەروەك ئەو دەڵێ: پیاوێکی سەرگەرم و پشوو تەنگ و زوو توڕە دەبوو لە سەر بیروڕایەکی دیاریکراودا نەبوو[8]، سەرۆکەکان ئامادەبوون دیاری و نیشانەی شکۆداری لی وەربگرن کەچی ئامادەی هەڵگرتنی ئەنجامەکانی نەبوون، ملکەچی هیچ دەستەڵاتێکی رێکوپێك نەبوون، لە کۆتایی ئەیلولی ١٩٢٢ شێخ مەحموود گەڕایەوە سلێمانی، دووبارە دەسەڵاتی کەوتەوە دەست، بەڵام زۆری نەخایاند لە تشرینی دووەمی ١٩٢٢ لە رووی حکومەتی عێراقی راپەرییەوە، خۆی لە سەر کوردستان کردەوە مەلیك. لە کانوونی دووەمی ١٩٢٣ نووسراوێکی لە ژێر مۆری مەلیکی کوردستان بۆ قونسلی روسیای سۆڤیەتی لە ئازربایجان نووسی، تێیدا هاتووە کەوا: حکومەتەکەیان یارمەتی بدا و پی لە مافە رەواکانی نەتەوەی کورد بنی و چەك و تفاقی بداتی و پەیوەندی دۆستایەتیان لە نێواندا دامەزرێ.

لە تەموزی ١٩٢٤ سوپای عێراقی شاری سلێمانی داگیر دەکات بەڵام شێخ مەحمود توانی بۆ پشت گەڵوی دەربەند رایان ماڵێ. بەردەوام بوو لە بە گژاچوونی سوپای عێراقی

---

[8]- ئەو سەرنج و رایانەش دەربارەی شێخ مەحمود هی مێژوونووسی ئینگلیزییە (وەرگێڕ)

که هێزی بەریتانی پشتگیری دەکرد. لە تشرینی ١٩٢٦ راوێژکاری وەزارەتی ناوخۆ لەگەڵ شێخ مەحمود کۆدەبێتەوە، پاشان شێخ نوێنەرێکی خۆی بۆ مەبەستی رێککەوتن لە سەر مەرجەکانی ئاشت بوونەوە ناردە بەغدا. لە حوزەیرانی ١٩٢٧ رێکەوتننامەیەکی مۆر کرد، ئەوەی دەگەیاند: کەوا شێخ مەحمود بە خۆی و خێزانەوە لە دەرەوەی عێراقدا بژین، وە خۆی لە کاروباری سیاسی نەگەیەنێ، کورێکی بۆ خوێندن بنێرێتە بەغدا، حکومەت هەموو موڵك و سامانەکانی بۆ بگەرێنێتەوە، لەو ساڵەدا شێخ سەردانی بەغدا دەکا و لە خواروی عێراق نیشتەجی دەکرێ. لە ساڵ ١٩٢٩ رێی پێدرا بگەرێتەوە کوردستان، بەڵام بۆ ساڵی ئاینده کەوتەوە شۆرش نانەوە، دەگیری و دەینێرنە باشور. لە تەموزی ١٩٣٠ کۆمەڵێك لە رووەتدیارەکانی سلێمانی عەرز و حاڵێکیان پێشکەش بە (عصبه الامم) کرد لە جنێڤ داوای دامەزراندنی حکومەتێکی کوردیان تێدا کرد، لە ژێر چاودێری دەوڵەتان بێ، بەڵام داواکاریەکەیان بەلاوە نراو پێی قایل نەبوون. ساڵی ١٩٣٣ ری بە شێخ مەحمود درا بێتە بەغدا، لە ١٩٤١ گەرایەوە سلێمانی[9]، بە بزوتنەوەیەکی یاخیبووانەی

---

9– لە کاتی خۆیا کەسانێك بە شێخیان گوتووە کە هەندێك بە نەرمی لەگەڵ ئینگلیزەکان رەفتاربکا بەڵکو هەڵوێستیان دەگۆرری و بەرژەوەندی کوردی تێدا دەبی، شێخیش بەم شێوەیە وەڵامی دەداتەوە دەڵێ:

نامەوی ژینی ئەسارەت بەسەمە عومری گومرەهی

نایکەمە سەرخۆم بە ئەمری موددەعی تاجی شەهی

قەت بە ئەمری دوژمنانم نامەوێ فەرماندەهی

بەراستی ئەمە سەرنجی راکێشام ناچار ئەم چەند تێبینییە سەر پێیە بخەمە بەرچاوی خوێنەر: لەگەڵ رێز و نەوازشتم بۆ گشت پێشەوا و سەرکردە و سەردارانی کورد کە لە بارودۆخ و سەردەمی جیاجیادا لە رووی دوژمنانی نەوەکەیان راپەریون. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کە کار هاتە سەر نوسینی مێژوو وە بۆ سودمەندی و پەند وەرگرتن لە بەسەرهاتەکان، دەبی لە هەموو روویەکەوە هەڵبسەنگێندرێ. نەك بە گیانی گەرم و سۆز و عاتیفەوە بنوارینە روداوە ترسناکەکانی گەلەکەمان و بێشومار وشەی قارەمان و پاڵەوان و نەبەرد و دانا و زانا بخەینە پاڵ سەردارەکانمان. (وەرگێر).

کەمخایەن هەڵسا، پاشان خۆی بە دەست حکومەتەوەدا. ئیتر خۆی لە ژیانی گشتی گۆشەگیر کرد، لە ٩ی تشرینی یەکەمی ١٩٥٦ لە بەغدا جیهان بەجی دێڵێ، تەرمەکەیان گواستەوە و بۆ سلێمانی و لەوی بەخاك سپێردرا. شێخ مەحمود سەرەرای زمانی کوردی عەرەبی و تورکی و فارسی دەزانی، هەندێك لە دۆست و شوناسانی وەسفی دەکەن کەوا: سەردارێکی رۆحی و دنیایی بوو، قسە خۆش و حازر بە دەست، ئەدەب دۆست و شیعرزان، شۆرە سوارێکی دلێر بوو، بە ئازایی و مەردی دەچووە کۆری جەنگەوە، دکتۆر عوسمان ئەبوبەکر دەڵێ: ( شێخ مەحمود دەچێتە پاڵ کاروانی ئەو سەرکردە مەزنانەی کەوا لە تەك گەلەکەیان دەوەستن و لە ریزی هەرە پێشەوەیان دەبێ، لە کاتی تەنگانە و نائومێدیدا جڵەوی سەرکردایەتیان دەگرێتە دەست، ئومێد و هیوای سەرکەوتنیان پی دەبەخشی). دکتۆر سێرهاری سندرسن لە کتێبەکەیا (عشره الاف لیله و لیله) کە بە دووردرێژی باسی خزمەتگوزاری خۆی لە عێراقدا دەکات، جارێ داوای لێدەکری چارەسەری شێخ مەحمود بکا، لەو کاتەی کە لە بەغدا نیشتەجی دەبێ. سەیری دەکا دەبینی شوێنەواری برینێکی بچوك لە پشتی دایە، کە لێی دەپرسێ: ئەوە چییە؟ سەرداری کورد کەوا دوای جەنگی یەکەمی مەزن بەرێوەبەرایەتیەکەی بەریتانیای گێژ کردبوو، لە وەڵامدا بە دکتۆر دەڵێ: ئەوە شوێنی گوللەیەکی بەریتانیە ئەوەش ئەی ئینگلیزینە وەکوو ئێوەیە کە چوونە جێگایەك مەگەر شەیتان لاتان بدات دەنا بەری نادەن!!

خاتوو فریا ستارك لە کتێبەکەیدا "_غبار برلن الاسد_" باس دەکا کەوا لە هاوینی ساڵی ١٩٤٣دا سەردانی سلێمانی و ناوچەکانی کوردستانی کردووە، چاوی بە شێخ مەحمودیش دەکەوی لەو کاتەی کەوا شێخ سەردانی گوندە وێرانبووەکانی دەکا، دەڵێ: دیتم مرۆڤێکی بە تەمەنی بەتین، لە دەوری شێستوسی ساڵاندایە، هەر چەندە نیشانەی پیریەتی پێوە دیار بوو بەڵام گیانی خاباتگێری هەر پێوە مابوو،جلوبەرگێکی سەوزی تاریکی پۆشیبوو، سمێڵەکانی بۆیەی رەش کرابوو، دەموچاوی خشت، لوتی بچوکی روخساری

منالێکی خوێنشیرینی پی بەخشیبوو، مەشرەب خۆشی نوکتەبێژ، هەستی دۆستانەی بەرامبەر ئینگلیزی کۆنە دوژمنی هەبوو، ئەگەرچی سیاسەتەکەشیانی بەدڵ نەبوو، شێخ بە خاتوو ستارك دەڵێ: ئێوە ئاشنایان دەگرن و هەڵیان دەخەڵەتێنن، وایان لێدەکەن ئامادەبن لە پێناوی ئێوەدا هەموو شتێك بکەن. پاشان بە لایەوە دەنێن، شعرێکی چوار خشتەکی بۆ دەخوێنێتەوە کە باسی ئەشکەنجە بینیوی شەیتان لە دۆزەخ دەکا، (پاش رۆژگارێکی درێژ خوا رێگا بە شەیتان دەدا بەرامبەر بارەگاکەی بوەستێ، کەچی بێزاری دەرنابڕی بەڵکو کڕنووش بۆ خوای بەرز و مەزن دەبا، پێی دەڵێ: لە سەر چی نەوازشتم بۆ دەکەی؟ لە وەڵاما دەڵێ: چونکە بە بەغدایی ئافەریدەت نەکردوم) خاتوو فریا ستارك دەڵێ: بە فارسی لەگەڵ شێخ مەحمود دەدوام، دوای نان خواردنی نیوەرۆ لەگەڵ ئایشە خانی خێزانی ئاخاوتنم بوو[10]. دیسان فریا ستارك لە نامەیەکی تردا کە لە کەرکوکەوە لە ئایاری ١٩٢٤ نوسیویەتی دەڵێ: بۆ سلێمانی پاشان بۆ پێنجوێن چووم، نانی نیوەرۆم لەگەڵ شێخ مەحمود خوارد، وەکو دەڵێ: هەموو سیحر و تەلیسمێك لە شەخسیەتی کۆبوەتەوە وا پێدەچی تاوانبارانی ئەم جیهانە بۆ خۆیان داگیریان کردوە.

## بنەماڵەی بارزانی

بنەماڵەی بارزانی دەگەڕێتەوە سەر عەبدوڵا کوڕی مەلا بەکر ناسراو بە (تاجەددین) کە دامەزرێنەری تەکیەی نەقشبەندیە لە گوندی بارزان. لە ساڵی ١٨٢٥ عەبدولسەلامی کوڕی لە ئیرشاد و رابەریدا جێگای گرتۆتەوە. پاشی ئەو شێخ محەمەدی کوڕی شێخ عەبدولسەلام کە هەردوو دەسەڵاتەکەی ئاینی و دنیایی کۆ کردبۆوە دەست رۆیشتوی

[10]– دووەم ژنی شێخ مەحمود ئایشە خانی کچی مامی بووە. ئایشە خان لە پێشدا ژنی شێخ ئەحمەدی برای شێخ مەحمود دەبی و شێخ جەلالی لێ بووە، دوای کوشتنی شێخ ئەحمەد لە کارەساتی موسڵ شێخ مەحمود مارەی کردووە، تەنیا شێخ لەتیفی لێ دەبێت. (وەرگێڕ)

ناوچەکە بووە، لە دوا رۆژانی ژیانیدا کاربەدەستانی تورکی بە هۆی روودانی فیتنە و ئاژاوەکانی نێوان عەشیرەتەکان لە موسڵ زیندانی دەکەن، پاشان بەری دەدەن و بۆ بارەگاکەی خۆی دەگەرێتەوە، لە کورە دیار و ناسراوەکانی: شێخ عەبدولسەلامی دووەم کە لە ساڵی ١٩٠٨ لە دەسەڵاتداریەتی تورکی هەڵدەگەرێتەوە و دەگیری و لە ٤ی ئەیلولی ١٩١٤ لە موسڵ لە سێدارە دەدرێ.

## شێخ ئەحمەد بارزانی



کوڕی محەمەد کوڕی عەبدولسەلامە، لە دەورروبەری ساڵی ١٨٩٢ هاتۆتە دنیا، لە ئاکامی لە سێدارەدانی شێخ عەبدولسەلامی برای لە موسڵ بە هۆی راپەرینەکەی دژ بە دەسەڵاتداریەتی تورکی -شێخ ئەحمەد سەرداریەتی عەشیرەتەکانی کوردی بارزان لە ناوچەی زێبار دەگرێتە دەست- لاپەرەی ژیانی شێخ ئەحمەد پڕە لە شۆڕشنانەوە و راپەرین، لە سەرەتادا ساڵی ١٩١٩ دەستی بە ناردنی نوسراو کرد بۆ تورکەکان و هەڵمەت بردنە سەر کاربەدەستانی بەریتانی لە (وان)، دیسان لە ساڵی ١٩٢٧ کەوتەوە راپەرین و پچڕانی کۆتی ملکەچی. دواجار لە تەموزی ١٩٣٠ و بەهاری ١٩٣٢ پەیتا پەیتا هەڵمەتی هێزی سوپایی دەچووە سەر ناوچەی بارزان. شێخ ئەحمەد لە حوزەیرانی ١٩٣٢ ناوچەکە بەجێ دێڵی و روو دەکاتە تورکیا، لەوێش دەدرێتەوە دەست کاربەدەستانی عێراقی و بۆ باشوری دوور دەخەنەوە و لێی نیشتەجێ دەکەن. دوای چەند ساڵێك رێگای پێدرا بگەرێتەوە ناوچەکەی خۆی، بەڵام دووبارە لە ١٩٤٣ لەگەڵ مەلا مستەفای برای شۆڕشی بەرپا

کردەوە، لە سەرەتای ساڵی ١٩٤٤ کاروبار هێور و هێمن دەبێتەوە و، مەلا مستەفا دەچێتە بەغدا نیاز پاکی خۆی بۆ حکومەت نیشان دەدا، شێخ ئەحمەدیش خۆی دەدات بە دەستەوە و دەکەوێتە ژیانی ئاسودەیی و ئاسایی، بەڵام لە تشرینی یەکەمی ١٩٤٥ ناچار دەبێ پەنا بەرێتە بەر سنوری ئێران، پاشان هاتەوە عێراق و ژێر دەستبوونی خۆی راگەیاند.

لە پاش شۆڕشی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ ڕێی پێدرا بگەڕێتەوە بارزان، کاتی مەلا مستەفا لە ئەیلولی ١٩٦١ شۆڕشی نایەوە شێخ ئەحمەد بێلایەنی و بەشدار نەبوونی خۆی بۆ عەبدولکەریم قاسم راگەیاند، دوانێکیدا گوتی:( شۆڕشی کورد خوێنرژانێکی خۆڕاییی کوردەکانە). لە ١١ی کانوونی دوهەمی ١٩٦٩ لە بەغدا کۆچی دوایی کردوە.

# مەلا مستەفا بارزانی



مەلا مستەفا کوڕی شێخ محەمەدی بارزانییە، ساڵی ۱۹۰۳ لە گوندی بارزان هاتۆتە جیهان بە ماوەیەکی کەم پێش لە دایکبوونی باوکی کۆچی دوایی دەکا، هێشتا تەمەنی نەگەیشتبووە سێ ساڵان کە تورکەکان لە ۱۹۰٦ هەڵمەتێکی سوپایی دەهێننە سەر عەشیرەتەکانی کورد، شێخ عەبدولسەلامی برا گەورەی بە دیل دەگرن، ئەویش لەگەڵ دایکی دەخەنە بەندیخانە نۆ مانگی تیا بەسەر دەبەن، بزوتنەوە شۆڕشگێڕانەکەی لە ۱۹٤۳وە دەست پی دەکات، دووابەدووای خۆبەدەستەوەدانی شێخ ئەحمەدی برای، ئەو سەر لە نوی تێهەڵچۆوە. حکومەتی عێراقی بڕیاری دوور خستنەوەی بۆ ئێران دا. لە شوباتی ۱۹٤٥ دێتە بەغدا حکومەت بە داواکاریەکەی قایل دەبێ، کە بگەڕێتەوە ناوچەکەی خۆی و چەکەکان کۆ بکاتەوە، بەڵام کەوتە سەردان و گەڕان لە ناو گوندەکان و هاندانی خەڵك بۆ شۆڕش نانەوە. لە شوباتی ۱۹٤٥ هێزێکی سوپاییان ناردە سەری، بۆ ناوچەی زێبار و بارزانیان ڕەتاند، ناچاریان کرد لە تشرینی یەکەمی ئەو ساڵەدا لەگەڵ

شێخ ئەحمەدی برای پەنا بەرنە بەر سنوری ئێران، پاشان شێخ ئەحمەد دەگەڕێتەوە عێراق[11]، بەڵام مەلا مستەفا بە خۆی و دووهەزار لایەنگرانی بەرەو مەهاباد دەروا، لە کاتێکا قازی محەمەد لە ١٥ی کانونی یەکەمی ١٩٤٥ دامەزراندنی حکومەتێکی نەتەوەیی کوردی بە یارمەتی سۆڤیەت ڕاگەیاند، هاوسنور بوو لەگەڵ حکومەتی ئازەربایجان کە لە تەورێز پێکهاتبوو. کاتی حکومەتی ئێرانی لە ١٩٤٦ کۆماری مەهابادی لەناوبرد، مەلا مستەفا و جەنگاوەرانی پەنایان بردە بەر روسیا، دوازدە ساڵیان لی بەسەر برد. لە سەرەتاوە مەلا مستەفا لە ئازەربایجان و ئەزبەکستان نیشتەجی بوو، پاشان بۆ مۆسکۆ گواسترایەوە، زمانی روسی و هونەرکاریەکانی سەربازی زانیاری ئابووری خوێندووە، لە ٢٦ی تشرینی یەکەمی ١٩٥٨ گەرایەوە عێراق. سەروەری و رێز و نەوازشێکی زۆری لی نرا، بەڵام کە گەرایەوە ناوچەکەی خۆی لە ئەیلولی ١٩٦١ شۆڕشی ڕاگەیاند، لە بەگژداچوونی حکومەتی عێراقی بەردەوام بوو. هەتا لە ١١ی ئازاری ١٩٧٠ لەگەڵی پێکهاتن و چەکی دانا.

مەلا مستەفا لە کۆنگرەی حیزبی دیموکراتی کوردستان وتارێکی دا وتی:( ئێستا دەوری کاری بنیادنان و ئاوەدان کردنەوە و پیشەسازی هاتووە، تەنیا هەر بەمەش دەتوانین خزمەتی نەتەوەکەمان بکەین، هەموومان برای یەکین نابی جیاوازی و دووبەرەکی لە نێوان رۆڵەکانی گەلدا بکەین، با هەوڵ بدەین هەموومان ببین بە برایەك کە یەك ئامانج و یەك دەستور پێکمان ببەستی ئەویش بەختەوەر کردنی گەلی عێراقە بە کورد و عەرەبییەوە). لە ٢٩ی ئەیلولی ١٩٧١ هەوڵی کوشتنی درا، بارەگاکەیان لە حاجی ئۆمەران هەڵتەکاند، بە سەیروسەمەر لە مەرگ رزگاری بوو.

---

[11] – لە کاتێکا شێخ ئەحمەد دەگەڕێتەوە عێراق کە کۆماری مهاباد لەناو دەبری و مەلا مستەفا روو لە یەکێتی سۆڤیەت دەکات، نەك وەك دانەر نوسیویەتی. "وەرگێر"

حکومەتی عێراقی لە ١١ی ئازاری ١٩٧٤ حوکمی زاتی بۆ کوردستان راگەیاند، بەڵام مەلا مستەفا بە شێوە حوکمە زاتیەکە قایل نەبوو، کەوتەوە شۆڕشنانەوە، بەڵام بزوتنەوەکەی نشوستی هێنا، حکومەتی عێراقی لەناوی برد، زۆربەی لایەنگرانی خۆیان بە دەستەوە دا یان روویان کردە ئێران. پاشان ئەویش لە ٣٠ی ئازار بۆ ئەوی چوو لە تاران نیشتەجی بوو، بەر لە بەجی هێشتنی بارەگاکەی لە چۆمان دوانێکی بۆ رۆژنامەنووسان دا وتی: (ئێمە بە تەنیا بی دۆستماینەوە چ یارمەتی و پارێزگاریمان لە ئەمریکاوە پێنەدرا، وا دەزانم رۆژگارێکی رەشمان لەپێشە) رۆژنامەی تایمزی لەندەنی لە ٢٧ی ئازاری ١٩٧٥ نووسیویەتی دەڵێ:( مەلا مستەفا لە ناو کوردەکاندا بۆتە کەسایەتیەکی نیمچە ئەفسانەیی، ئەوەش بە هۆی خەباتی دووردوردرێژی و بەرگری کردنی لە رووی کاربەدەستانی تورکی و بەریتانی و عێراقیدا، و سەلماندویەتی کە توانای بەردەوامبوونی شەری پارتیزانی لە چیاکانی باکوری عێراقدا بۆ ماوەیەکی دیارینەکراو هەیە، پاشان دەڵێ: مەلا مستەفا و هاورێکانی بریاری شەر راگرتنیان دا هەروەك قەدەر تەڵەی بۆ دانابنەوە) دوایی لە ساڵی ١٩٧٦ بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشیەکەی بەرەو واشنتۆن پایتەختی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا دەروا لە ٢ی ئازاری ١٩٧٩ لەوی جیهان بەجی دێڵی تەرمەکەیان بۆ ئێران گواستەوە لە یەکێك لە سەنگەرەکانی چیای کوردستان لە سەر سنووری رۆژئاوای نزیك عێراق نێژرا[١٢].

دێڤید ئەدامسن رۆژنامەنووسی ئینگلیزی سەردانی مەلا مستەفا دەکا کە پاڵی بە چیاکانەوە دابوو، بە گژ عەبدولکەریم قاسم دا چوبوو، لە کتێبەکەیا (الحرب الكردیە) باسی دەکا و دەڵێ: بەوەی باشە ئازایەتی و دلێریەکەی لە سەر شێوازی کۆنە تا ئەوەی

٧- لە ١٩٩٣/١٠/١٦ بەرێوڕەسمێکی شکۆدارەوە تەرمی سەرەك بارزانی و ئیدریسی کوریان هێنایەوە بۆ کوردستان و لە بارزان بە خاك سپێردرانەوە. "وەرگێر"

ئینسان تا رادەیەك سەرسامی بەرزی و سەروەریەتیەکەی دەبێ، بەڵام پەیڕەوکردنی دابونەریتی وای لێ کردووە پتر نەروانێتە بیروڕای بەرفراوانتر و زۆر ئاڵۆزتر، سەرکردایەتی شۆڕشێکی نوی دەکا بە شەرەف. بەڵام بە شێوازێکی سەردار عەشیرەتێك بێ.

مەبەست تەنیا بۆ سەروەری و سەربەخۆیی بوونە، شەرەکانی کەوا بەرپا دەبوون خێلە ساتی تێکەڵ بە نیشتمانیەتی. خۆی لە مەهاباد دیتەوە کە سەرکردەی سێهەزار چەکداری ئاوارەیە و دەوڵەتێکی بێسوپا کە بیپارێزێ، بۆیە رۆژگار وای لێ کرد بە گیانێکی عەشایری ببێتە سەرکردەیەك لە شەری نیشتمانیەتیدا، ژیانی سەراپا زنجیرەیەك بووە لە شەروشۆڕ و تێکشکان و ئاوارەبوون، ئەوەش شێوە ژیانی زۆربەی کوردەکانە کە وای کردووە سیفەتێکی بەهێز بەڵکو ترسناك لە گیانی کوردی بڕسکی چارەنووسێکی ماتەم و غەمگینە[13]. ئەو سیفەتەش لە مەلا مستەفا بەدی دەکرێت. مێجەر ئەدغار ئوبالانس پسپۆڕی سوپای ئینگیلز کە خاوەنی چەندین کتێبە لە سەر جەنگی یەمەن و هیندی و کۆریا و جەزایر و شەری خۆبەخۆی یۆنان و سوپای سووری سۆڤیەتی،... هتد، سێجار سەردانی عێراق و ناوچە کوردیەکەی کردووە، لە کتێبەکەیا (الثورة الكردية ١٩٦١-١٩٧٠) کە ساڵی ١٩٧٣ دەرچووە دەڵێ:

چەندین جار چوومەتە دیداری، خوێندەوارێکی واش نەبوو بەڵام جڵەوی شۆڕشەکەی توند لە دەست گرتبوو، کەس نەیتوانیوە لە سەرکردایەتیەکەی لای بدا، دەسەڵاتی خۆی بە سەر هۆزەکانی دەوروبەری بارزاندا بڵاو کردۆتەوە، بۆتە سەردارێکی دانپێداهاتووی نەتەوەی کورد، بەشداری گەلەکەی کردووە لە زەحمەتکێشان و مەترسیەکانیدا، بالا بوو لە نەخشەکێشان و جۆش پێگرتنی گیانی خۆڕاگری سەربازەکانی و بەرزکردنەوەی ورە و،

13– ئەمانە بیروڕا و بۆچوونی رۆژنامەنووسەکەیە، بۆ ئەمانەتی وەرگێڕان ئەمانویست دەستکاری بکەین. "وەرگێڕ"

متمانە پێکردن و گوێدێر بوونیان بۆ خودی خۆی و هاندانی ناحەزانی بۆ بەگژداچوونی یەکتر، بۆ دەرکردنی بڕیارەکانی پشتی بە سەلیقە و ئیلهام دەبەست، لە زۆربەی کاتا جێگایەکی دیاریکراوی بۆ خۆی نەدەکردە بارەگا، بەڵکو لە شوێنێك دەیگواستەوە بۆ شوێنێکیتر، زۆر بە خەفەتیان و پارێز بوو، هەڵپە و خۆهەڵکوتانی کەم بوو، خۆی لە چیا لاتەریك و لابەلایەکانا قایم دەکرد، چاوەڕێی تێکشکانی هێزەکانی حکومەتی دەکرد، لی نەدەگەڕا ئامێر هێزەکانی بۆ دەشتەکان شۆڕ ببنەوە، چاوگەی سستی هێزەکانی باش دەزانی... پارێزگاری لە دابونەریتە کۆنەکانی کورد کردبوو، لەگەڵ لاوەکانی شارنشین نەدەرۆیشت کەوا چاکسازی کۆمەڵایەتی کوردەواریان گەرەك بوو، لەگەڵ ئەوەشا توانی لەنگەر لە نێوان پیاوی عەشایر و گەنجە پێشکەوتووخوازەکان رابگرێ- لە کۆتاییدا دانەر مەلا مستەفای بە یەکی لە سەرکردە مەزنەکانی سەدەی بیستەم داناوە- لە بەر گەشی و درەوشانەوەی عەزیمەتی و خەباتی لە پێناو سەربەخۆیی و حوکمی زاتی بۆ کورد و هەستکردنی بەوەی کە دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کورد عەناسیری ژیانی ئابووری لی نایەتەجێ. توانی کۆنترۆڵ بە سەر هەوڵ و تەقەلای شیوعیەکاندا بکا کە دەیانویست جڵەوی سەرکردارییەتی لی وەربگرن و شۆڕشی کورد بۆ لایەکیتر ئاراستە بکەن کە زۆربەی زۆری گەلی کورد پێی قایل نەدەبوون، هەروەها یازدە ساڵ مانەوەی مەلا مستەفا لە یەکیەتی سۆڤیەتدا پاڵی پێوەنەنا بیروباوەری شیوعیەت وەربگرێ.

محەمەد مەهدی جەواهیری روو لە ئەحمەد حەسەن بەکر سەرکۆماری عێراق دەکات و دەڵێ:

| | |
|---|---|
| جاذبت من صقر الشمال و إنه | بالعز أمنع من مطا عقاب |
| و مسحت غضبة قسور عن وجهة | ولقطت من فمه مرارة صاب |
| مستشرقا كبد السماء جبينه | للنيرات و دجلة فى الزاب |
| وسط الجبال طأن صم صخورها | من بعض ما استصفى من الحجاب |

پێش ئەوەش پارچە هەڵبەستێکی لە کۆنگرەی خوێندکارانی کورد ساڵی ١٩٦٢ لە مونیخ خوێندویەتیەوە و دەڵێ:

*قلبي لكردستان يهدى و الفم — وقد يجود بأصغريه المعدم*
*يا ابن الشمال و ليس تبرح كربة — بالبشر تؤذن عندما تتأزم*
*سر في جهادك فالجهاد مفازة — يهدى الضليل بها وينجده الدم*
*من بعد الف من سلالة ظالم — من قبل الف يثأر المتظلم*



وەك دەزانرێ لە کوڕانی مەلا مستەفا دووانیان ناویان دەرکردووە، ئیدریس بارزانی کە لە ساڵی ١٩٤٤ لە دایك بووە و لە ساڵی ١٩٨٧ کۆچی دوایی کردووە و مەسعود بارزانی کە لە ساڵی ١٩٤٦ لە دایك بووە، دووای ساڵێك لە بەرپابوونی جەنگ لەگەڵ عێراقدا هاوکاری لەگەڵ ئێران کرد.



ئێستا کاك مەسعود سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستانە، وە لە ئاکامی هەڵبژاردنە ئازادەکەی ساڵی ١٩٩٢ بە هاوبەشی لەگەڵ یەکێتی نیشتمانی کوردستان بە سەرۆکایەتی مام جەلال تاڵەبانی بۆ یەکەمجار لە مێژووی کورددا حکومەتێکی تایبەتمەند بە کوردستانی باشوور پێك هێنا، دامەزرێنەر و سەرەك وەزیرانی ئەو حکومەتەش دکتۆر فوئاد مەعسوم بوو (وەرگێڕ).

## د. عەبدورەحمان قاسملۆ



سەرداری کوردی ئێران عەبدورەحمان قاسملۆ لە مانگی کانونی یەکەمی ١٩٣٠ لە دۆڵی قاسملۆ نزیك شاری (رەزائیە) ئورمیای ئێستا هاتۆتە دنیا، باوکی پیاوێکی موڵکداری حاڵخۆش بووە، لە سەردەمی خوێندکاریدا لەگەڵ بزوتنەوەکەی قازی محەمەد دەرۆیشت کەوا لە سەرەتای ساڵی ١٩٤٦ کۆماری مەهابادی کوردی لە ژێر سایە و سێبەری سۆڤیەتی راگەیاند. پاشان بە ماوەیەکی کەم ئەم کۆمارە روخا سەرۆکەکەشی لە سێدارە درا. دوای ئەوە رووی کردە عێراق لەوێشەوە بۆ ئەوروپا، لەوی خوێندن تەواو دەکات، لە ساڵانی شێست و حەفتاکانا هەوڵی دا رابەری لە راپەرینەکانی کوردی ئێران بکا، بەڵام سەرکەوتنی بە دەست نەهێنا لە ساڵی ١٩٧٣ کە لە زانکۆی پراخ دەیخوێند هەڵبژێردرا بە سکرتێری گشتی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران. دوای ئەوە رووی کردە پاریس سی ساڵی لی دەمێنێتەوە، لە سۆربۆن موحازەرەی لە سەر زمانی کوردی دەدا، لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٨ گەرایەوە کوردستان. شانە و لقەکانی حیزبەکەی دامەزراند، کە ئاژاوە سەرانسەری وڵاتەکەی گرتەوە لایەنگرانی دەستیان بە سەر چەکی سوپا و پۆلیسدا گرت. لە کاتێکا رەزا شا چووە دەرەوە ئایەتوڵڵا خومێنی جڵەوی کاروباری فەرمانڕەوایی گرتە دەست.

قاسملۆ سودمەند نەبوو لە یارمەتیدانی عێراق و جەنگ لەگەڵ ئێراندا هەڵگیرسا، کەوتە بەرهەڵستیکردنی عێراق سەبارەت بە داپڵۆسینی نەتەوەکەی و بەکارهێنانی کیمیاوی بۆ لەناوبردنی شۆڕشەکەیان، ئیتر گەرایەوە بۆ پاریس، پاشان بۆ بەردەوامبوون لە خەبات و

هەوڵ و کۆششی سیاسی، روو دەگاتە شاری (ڤیەنا) پایتەختی نەمسا، لەوی لە ۱۳ی حوزەیرانی ۱۹۸۹ دەکوژرێ.

قاسملۆ سەردارێکی رۆشنبیر بوو بە چەندین زمانی ئەورووپی و رۆژهەڵاتی دەدووا[14]. سیاسیەکی مامناوەندی بوو، داوای بەرێوەبەرایەتی ناوخۆیی بۆ سی ملیۆن کوردی ئێران دەکرد، بەڵام لە شەرە ناوخۆیەکەدا ناهومێد بوو، پاش خەبات و تێکۆشانێکی دووروودرێژ گیانی خۆشی لە پێناو بیروبڕواکەیا بەخت کرد. لە کوشتنەکەیدا ئێران تاوانبار کرا، ئەگەرچی کاربەدەستانیان ئەوەیان نەسەلماند.

## تەسەوف و زانیاری ئاینی لە کوردستانا

زانیاری ئاینی لە گوندەکانی کوردستانی عێراقدا گەشەی کرد، تەسەوف زەمینەیەکی بەپیتی لەم وڵاتەدا دۆزیەوە، محەمەد ئەمین زەکی بەگ (لە مێژووی سلێمانی و دەوروبەریدا) دەڵێ: ئەوانەی ئاگاداری حاڵ و باری کوردستانن دەزانن کەوا دڵی زۆربەی دانیشتوانەکەی بەند و گیرۆدەی ئەو دوو رێبازەیە: قادری و نەقشبەندی، بەند بوونێکی گیانی و مەعنەوی، ئەگەرچی لەناو خەڵکەکەدا هەندێك کۆمەڵی نائاسایی هەیە وەك بابەتی (عەلی خواهی) یە توندڕەوەکان، بەشێکیش پەیڕەوی مەزهەبی یەزیدی دەکەن.

**رێبازی قادری:** دامەزرێنەری ئەم رێبازە شێخ عەبدولقادری گەیلانیە (۱۰۷۷-۱۱٦٦). لە بنەماڵەی خانەدانەکانە، باپیری لە نەقیبەکانی ئەشرافی بەغدایە، مەزارەکەی لە گەرەکی (باب شێخ) لە بەغدا بە سەروەری و نەوازشتەوە زیارەت دەکرێ، لە خواناسە مەزنەکانی تەسەوف بوو، بە گەنجیەتی دەچێتە بەغدا پاشان لەوی دەبێتە سەردەستەی

[14]- بە پێی سەرچاوەی ئاگادار تاکو ئێستا هیچ کوردێك بە قەدەر قاسملۆ زمانزان نەبووە (ئینگلیزی، فەرەنسی، روسی، چیکی، ئاسوری، فارسی، تورکی، عەرەبی و کوردی بە هەموو شێوە و زارەکانییەوە زانیوە، جگە لەوەش رۆشنبیرێکی بە توانا و سەرکردەیەکی بەهرەوەر بوو. نەمانی لە کۆڕی خەباتی کوردایەتیدا خەسارەتێکی گەورە بوو، کە لە بەرێکی فراوانی خستە ریزی تێکۆشەرانی کوردی ئێرانەوە "وەرگێڕ".

مامۆستایان و فتوادەر، پایە و ڕێزێکی ئەوتۆی لێنراوە، بۆ کەم کەس ئەو دەرفەتە دەرەخسێ، لە سۆفیەتیدا بالاّ دەبێ و (*خرقة*[15]) ی پێدراوە و نازناوی (*باز الاشهب*) وەردەگرێ، موریدەکانی چ لە ژیانیدا چ دوای مردنی گەلی زۆر بوون، ڕێبازەکەی لە دوور و نزیکی ولاّتی ئیسلامیدا هەر لە هیند و پاکستانەوە تا دەگاتە ناوچەکانی ڕۆژئاوای ئەفریقا بلاّو بۆوە.

١- **ڕێبازی نەقشبەندی:** دامەزرێنەرەکەی شێخ محەمەد کوڕی محەمەد بەهائەدینی بوخاریە، بە نەقشبەندی ناسراوە (١٣١٧-١٣٨٩ز) لە نزیك گوندێکی بوخارا هاتۆتە جیهان، بۆ مەبەستی خوێندنی دەستوری تەسەوف ڕودەکاتە دێی (سلماس) لەسەر دەستی بابە سەلماسی فێری زیکرو تهەلیلە دەبێ. دوای ئەوە لە سەمەرقەند لای سوڵتان خەلیل دەمێنێتەوە، پاشان وەك لێی دەگێرنەوە دەچێتە چەند گوندێك بە نیازی خزمەتگوزاری مرۆڤایەتی و بایەخ بە ئاژەلٚ بەخێوکردن و چاك کردنی ڕێگا وبان و لابردنی ئازار و مەینەتی لەسەر بێ نەوایان دەدا، هەر لەو دێیەی کە چاوی لە ژیاندا پێهەڵدێنی کۆچی دوایی دەکا. مەزارو گۆڕەکەی لە (باوەدین) ی بوخارایە. لە هەموو لایەکەوە خەڵك بۆ بەجێ هێنانی دەستوری زیارەت دێنە سەری. هەردوو ڕێبازەکە لە سەردەمی ئیمارەتی بابان لە هەموو ناوچەکانی کوردستان بلاّو بوونەوە، ڕابەر و موریدیان زۆر بوو، شێخ مارفی نۆدێ (١٧٥٣-١٨٨٧). بە بلاّو کردنەوەی ڕێبازی قادری لە ناوچەی سلێمانی هەڵساوە، شێخ خالید زیائەددین کوڕی حوسین (١٧٧٦-١٨٢٧) ڕێبازی نەقشبەندی بلاّو کردۆتەوە.

## شێخ مارفی نۆدێ

لە شارباژێڕ هاتۆتە دنیا لە لای بەناوبانگترین زانایانی سەردەمی خۆی دەخوێنێ-شارەزایی لە زانیاری ئایینی و ئەدەبی پەیدا دەکات. محەمەد ئەمین زەکی دەڵێ: بەشی هەرە

---

15- جۆرە لیباس و جلێکی ئایینداری و سۆفیەیە. "وەرگێڕ"

زۆری ئەو کتێبانەی کە دایناون بە شێوەی هەڵبەستە و بە تێکڕایی شەیدابوونی چاکە و بڕوای بە تین و هێزی ئایینپەروەری و فرە ئەدەبی و دڵ لە جۆشی (الوجد) دەگەیەنێ. ئەو کتێبانەی دایناون (*عقائد، فرائض، اصول، منطق، بلاغ و معان*) یە جگە لە بابەتی سۆفیەتی و ستایشی پێغەمبەر و سەلەواتیخواهی. بەرهەمەکانی ئەم باسانەشی بە خۆیەوە گرتووە (*بیان، بدیع، علم التجوید و عروض*)... ئەم زاتە دەچێتەوە سەر بەرەبابی سەید عیسای بەرزنجی حوسنی و لە شاری سلێمانی کۆچی دوایی کردووە. کاکە ئەحمەدی کوڕی ناوبانگی دەرکرد(١٧٩٣-١٨٨٧)، لە شاری سلێمانی هاتۆتە دنیا، لای باوکی زانیاری (*تفسیر و حدیث و فقه*) دەخوێنێ، پیاوێکی یەکجار خواناس و ئایینپەروەر بووە، ناوبانگی بە هەموو لایەکدا بڵاو بۆوە، محەمەد ئەمین زەکی دەڵێ: دڵنەواکەری خەڵك و خزمەتکارێکی سەروەری مرۆڤایەتی و پشتیوانی کەساس و بێنەوایان بوو، ناوبانگی گەیشتە بارەگای سەڵتەنەتی عوسمانی، سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم ئارەزووی دیدەنی کردووە، بەڵام لە بەر پیری و بێتاقەتی نەیتوانیوە روو بکاتە ئاستانە، کاتی جەنگ لەگەڵ روسیا بەرپا بوو(١٨٧٧)، کۆمەڵێکی گەورەی لە مورید و هۆگرانی بە سەرکردایەتی شێخ سەعیدی کوڕی بۆ جیهاد لە تەك سوپای عوسمانیدا هەنارد.

## شێخ خالید نەقشبەندی

ئەم زاتە لە هۆزی میکائیلی عەشیرەتی جافە، لە دێی قەرەداغ هاتۆتە دنیاوە. لە لای باوك و زانایانی سەردەمەکەی دەخوێنێ، ئیجازەی زانستی لای شێخ محەمەد قەسیم سەرەك زانایانی شاری(سنە) وەردەگرێ، ساڵی ١٨٠٧ لەگەڵ یەك لە دەروێشەکانی روو دەکاتە هیند، پەیوەندی بە سۆفیەکانی ئەوێوە دەکا، رێباز و سونەت و رابەرایەتی ئەوانی پەیڕەو کردووە، سەبارەت بە توندوتیژی و رکەبەری نێوان هەردوو رێبازە سۆفیەکە بۆ بەغدا کۆچ دەکا، لە تەکیەی خالیدی نیشتەجی دەبێ. لە ساڵی ١٨١٣ بەرەو دیمەشق دەروا،

زیارەتی (بیت المقدس) دەکا، پاشان دەگەڕێتەوە شام لەوی توشی نەخۆشی تاعون دەبێ و کۆچی دوایی دەکا. ڕابەرێکی ڕۆحی و گیانی و شاعیرێکی ڕەوانبێژ بوو، نامە و هەڵبەستی زۆری بە کوردی و عەرەبی و فارسی هەیە، لە شیعرە سۆفیەتیەکەی کەوا (محەمەد جەمیل ڕۆژبەیانی) وەریگێڕاوە، لە سەرەتاکەیدا دەڵێ: *لیس لي عشیق کعشیق، رفیع المقام، بهي الطلعة، ایسل الخد و ضاء المحیا کالبدر.*

## شێخ عوسمانی تەوێڵە

ناسراو بە سەراجەدین (١٧٧٥-١٨٦٧) لە بەناوبانگترین خەلیفەکانی شێخ خالید بووە، دوو کوڕەکەی شێخ محەمەد بەهائەدین (١٨٢٠-١٨٧٢) شێخ عومەر زیائەدین (١٨٣٩-١٩٠٠) دەچێتە گوندی بیارە، تەکیە و خەڵوەتخانەیەکی بۆ مەبەستی ڕابەریکردنی خەڵك لێ دروست دەکا. ئیتر هەر بە هۆی ئەوانەوە ڕێبازی نەقشبەندی لە تەوێڵە و بیارە و شوێنانیتر بڵاو بۆتەوە. شاعیری ناودار شێخ ڕەزای تاڵەبانی لە شێخەکانی ڕێبازی قادری بووە، شێخ عەبدوڵڵای کوڕی جێگای دەگرێتەوە، ئەو شێخ عەبدوڵڵایە باوکی حەسەن تاڵەبانییە کە ساڵی ١٩٣١ لە دایك بووە، لە حکومەتی عەبدولکەریم قاسم بووە بە وەزیری ڕێگاوبان، تەکیەکەی شێخ عەبدوڵڵا لە بەغدا لە گەڕەکی مەیدان لە بەرامبەر وەزارەتی بەرگری هەڵکەوتبوو، هەموو شەوانی هەینی ئەڵقەی زیکری دادەبەست، دێتەوە یادم جاری لەگەڵ مەحمود فەهمی دەروێش و چەند برادەرێکیتر چوینە سەردانی، شەکری قەند و چا و قاوەمان بە دیاری بۆ برد، سەر لە ئێوارە بوو گەیشتینە لای، هەیوانی تەکیەکە فەرش و مافوری لێ ڕاخرابوو، جێگایان لە تەنیشت شێخ لە سەر سەرینی نەرم و توکن بۆ چۆڵ کردین، فنجانی قاوە گێڕدرا، پاشان شێخ ئیشارەتی بۆ دەروێشەکانی کرد، هەموو وروژانە گۆڕەپانە والآکەی بەردەمان، لە ژێر ئاواز و دەنگی دەف لێدان کەوتنە هەڵپەڕین، هاواریان دەکرد- *لااله الا الله، یاهویاهو، لااله الاهو*، زۆری پێنەچوو جۆشیان خوارد و گەرم داهاتن وەك گەردەلوول کەوتنە سوڕان، تا ئەوەی بینەر جگە لەوەی کە شەپۆلی لەش بوو دەسوڕا چیتری نەدەدیت، هەر ڕمبەی قاچ بوو بەرز و نزم دەبۆوە،

هاواری بەسامیان لی هەڵدەستا هەر چاوە سوور هەڵگەراوەکان بوو زەق زەق دەینواڕی، وەك سەیروسەمەری غەیبی ببینی، *لااله الا الله- یاهویاهو لااله الاهو*، دوای ماوەیەکی کەم چا دانرا، جا شیر بە دەستان دابەزینە مەیدانەکە، ئەڵقەی زیکریان پێك هێنا کەوتنە گێژەن و جۆلان و سوڕانی بەردەوام، پاشان هەندێکیان خۆیان لابەلا کرد کەوتنە زەرگ و شیرلەخۆدان چەندین سەعاتی شەو بەسەرچوو پەردەی دوایی لە سەر زیکردا درایەوە، جا هەڵسان ساجێکی پڕ لە رەژوی گەش کراوەی سوورهەڵگەراویان هێنا، هەندێك سۆفی دابەزینە گۆڕەپانەکە و کەوتنە گێژەن و سوڕان و هەڵپەرین، بە دەم هاوار هاواری (*لا اله الا هو*) هەتا تەواو جۆشیان خوارد و گەرم داهاتن، ئینجا بە پێخاوسی و قاچی روت بە هەڵپە و داپەرینی شێوە سۆفیەتیەکەیان بە سەر پشکۆ ئاگرەکاندا کەوتنە هاتوچوونی بەردەوام، نیوەی شەو ئاهەنگ کۆتایی پێهات ئیتر سوپاسی شێخمان کرد و بە سەرسوڕماوی لەوەی دیمان هاتینەدەر.

## شێخ عەبدوڵلای بێتوشی

عەبدوڵلا کوڕی محەمەد بێتوشییە لە پیاوچاکانی کوردە، ١٧٤٨ لە (بێتوش) ی سەر بە ناوچەی (سەردەشت) ی ئێران هاتۆتە دنیا، لەوی پێدەگا: زانیاریەکانی ئایینی دەخوێنێ، پاشان بەرەو بەغدا دەڕوا، ساڵی ١٨٠٦ لە دەڤەری (ئەحسا) ی عەرەبستان جیهان بەجی دێڵێ. گەلێ کتێبی داناوە لەوانە- *شرح الفاکهي*- لەسەر قەتەر کوڕی هشام و هەڵبەستی "*کفایة المعاني* " لە سەر "نحو" تا دوایی، شیعری بە زمانی عەرەبی هەیە، یەك لە هەڵبەستەکانی ئەو پارچە هۆنراوەیە کە بۆ شێخ عەبدوڵلای کوڕی سیفەتوڵلا حەیدەری نوسیوە، سۆز و یادی بۆ عێراق تێدا دەربڕیوە، دەڵێ:

*إني أحن العراق و لم اکن – لا من رصافتة و لا من کرخه*

*لکن لي بغداد لي من قربة – واسهي الی من الشباب و شرخه*

## نامی عەبدوڵڵا ئەفەندی

لە زانایانی شاری هەولێرە، ساڵی ١٧٧٥ لەوی هاتۆتە دنیا هەر لەوێش دەبێتە قازی، بەڵام لەگەڵ "متسلم" حاکمی هەولێر تێکدەچێ. لە سەردەمی والی داود پاشا روو دەکاتە بەغدا، هاموشۆی والی دەکا، دەرس بە خوێندکاران دەڵێتەوە، پاشان والی دەیکاتە قازی بەسرە، ساڵێك بە قازیەتی لەوی بە سەر دەبا، بەڵام سەبارەت بە ناسازی ئاووهەواکەی واز دەهێنی و دەگەڕێتەوە بەغدا، لەوی ١٨٢٥ کۆچی دوایی دەکات، سەربوردەکەی بە کورتی لە "*تذکرة الشعراء*" دا هاتووە کە دانەرەکەی عەبدولقادر خەتیب شەهرەبانییە، ئەنستاسی کەرملی لە ١٩٣٦ بلاَوی کردۆتەوە.

## حاجی ئەسعەد ئەفەندی حەیدەری:

ئەسعەد کوڕی سیفەتوڵڵا حەیدەری گەورەیە، ساڵی ١٧٦٢ لە بەغدا هاتۆتە دنیا، لە لای ئەحمەد تەبەقچەلی سوختەی باوکی دەخوێنێ، پاشان دەکەوێتە دەرسوتنەوە پەراوێزی لە سەر هەندێك لە زانیارییەکان داناوە.

گەلێ خوێندکاری بەهرەوەر لە سەر دەستی پێگەیشتن، لە پێش هەموویانەوە داود پاشای والییە و ئیجازەی زانستیشی هەر لەو وەرگرتووە، پاشان داود پاشا دەیکاتە موفتی بەغدا، بە ئەرکی ئەو پایە هەڵدەستێ لە ١٨٣٩ بە نەخۆشی تاعون کۆچی دوایی دەکا.

## سەعید پاشا



سیاسەتمەداری دەوڵەتان کورد سەعید پاشا کوڕی حوسێن پاشا لە بنەماڵەی خەندان ناسراو بە (کوردی) ساڵی ١٨٣٤ لە سلێمانی هاتۆتە جیهان، باوکی نوێنەری ئەحمەد پاشا دوا میری بابان بووە، لە ساڵی ١٨٤٧دا داوا دەکری بۆ ئاستانە، پاشان ئیمارەتەکەی لەناو دەبریٚ(١٨٥١)، وا پێدەچی کە حوسێن بەگ دەچێتە پایتەختی عوسمانی، سەعید پاشای کوڕی لەگەڵ خۆی دەبا، لە خوێندنگاکانی تورکی دەخوێنیٚ، فێری زمانی فەرەنسی، عەرەبی، فارسی و ئەڵمانی دەبێت. بە پایەی ملازم لە نوسینگەی وەرگێڕان لە (بابولعالی) دادەمەزریٚ، پاشان دەیکەنە موتەسەریفی لیوای بانیە (١٨٦٧)، دوایی لە (مەدلی) لە دورگەی قبرس، سەعید پاشا لە پایەکانی پێشدەکەویٚ، تا ئەوەی ساڵی ١٨٨٢ دەبێتە وەزیری دەرەوەی تورکیا، لە ساڵی ئایندەدا دەیکەنە باڵوێز لە بەرلین، دەگەڕێتەوە بە وەزیرایەتی دەرەوە (١٨٨٥)، پاشان بریکاری سەرەك ئەنجومەنی شورای دەوڵەت، ئینجا سەرۆکایەتییەکەی (١٨٩٣) هەتا پایانی ژیانی لەم پایەدا بەردەوام دەبیٚ، لە ٢٩ تشرینی یەکەمی ١٩٠٧ لە ئاستانە ماڵئاوایی لە ژیاندا دەکات.

سەعید پاشا برای وەزیری دەوڵەتی تورکی عیزەت بەگ و مامی دیپلۆماسی عێراقی سەیفوڵلا بەگە، محەمەد ئەمین زەکی لە مێژووی سلێمانیدا دەڵیٚ: سەعید پاشا پیاوێکی بەرز و زانا بوو، شارەزایی تەواوی لە سەر نەریت و داب ودەستووری رۆژئاوادا هەبوو، چەند زمانێکیانی دەزانی، نیشتمانەکەی لا خۆشەویست بوو، بە رۆڵەی وڵاتەکەی خۆی دەنازی، چین و توێژی هەژاری لا بەقەدربوو، رێزی لی دەنا، بە راستی نابی ئینکاری

خزمەتگوزاریە مەزنەکانی کە بۆ شاری سلێمانی و خانەدانەکانی نواندووە بکرێ، بە سایە و هیمەتی ئەو پیاوە مەرد و دلێرە بوو کە قوتابخانەی روشدیەی سەربازی لە شاری سلێمانی کرایەوە.

کوڕە هەرە گەورەکەی، محەمەدشەریف پاشا ناوبانگی بە هۆی هەوڵ و کۆششەکانی کە لە لای ئەنجومەنی باڵای سوێندخۆران لە پاریس دوای جەنگی یەکەمی مەزن بۆ بڕیاردان لە سەر مافی سەربەخۆ بوونی کوردەکان دەرکرد.

## سەعید پاشای کورد

ئەوە سەعید پاشایەکیترە، لە (١٨٣٨-١٩١٤) لە سەردەمی حەمیدی دەبێتە سەرەك وەزیران (صدر الاعظم) دوای ئەوە سێجاریتر لە سەردەمی دەستورەکەدا هەمان پایەی پێسپێردراوە.

## ئەحمەد سورەییا

کوڕی ئەبیبەکر کوڕی عەبدولقادرە، لە شاری هەولێر هاتۆتە دنیا، روو دەکاتە ئاستانە، لە بەڕێوەبەرایەتی پەروەردە دەبێتە پشکنینەر، لە ساڵی ١٩٠٧ لە پایتەختی تورکی جیهان بە جی دێڵێ. "الاسماء الحسنه"ی هۆنیوەتەوە، لێکدانەوەی لە سەر "*الروض الاعلى*" دا هەیە.

## رەسوڵ مستی

رەسوڵ ئەفەندی نازناو بە گەورەی دانایان (*شیخ الحکماء*)، کوڕی مەحمود بەگە کە دەکا باپیری وەزیری زانا تۆفیق وەهبی، خەڵکی شارەزوورە، ساڵی ١٨٢٣ لە گوندێکی سەر بە هەڵەبجە هاتۆتە دنیا، لە لای زانایانی هەورامان و سنە و رەواندوز خوێندویەتی، لەو ماوەی کە لە رەواندوز دەمێنێتەوە، نامیلکەیەکی لە سەر (*تسریح الافلاك*) و کتێبی (*اثبات واجب الوجود*) ی داناوە، پاشان بەرەو ئاستانە بەری دەکەوێ، لە خوێندنگاکانی خوێندووە (*علمالطبیعة*) ی داناوە، دەبێتە مامۆستا لە قوتابخانەی رۆشدیە لە موسڵ و کەرکوك و بەسرە، دەگەرێتەوە ئاستانە دەیکەنە پشکێنەری پەروەردە لە (وان)، دوایی بەرێوەبەری خانەی مامۆستایان لە موسڵ، پاش ئەوە بەرێوەبەری پەروەردە، دوای بەسەر بردنی حەفت

سالێ لەم فەرمانەیدا روو دەکاتە میسر، زمانی فەرەنسی فێر دەبێت، گەشتێك بە ئەوروپادا دەکات، دەچێتەوە ئاستانە، هەر لەوی دوای جاڕدانی دەستورەکە لە ١٩٠٨ جێهان بەجێدێڵێ.

## یوسف زیاء پاشا

لە زاناکانی کورد و شاعیرانی سۆڤیەتییە، لە دەوروبەری ساڵی ١٨٣٩ لە سلێمانی هاتۆتە دنیا، لەوی پێدەگا و لە پەیمانگاکانی خوێندووە، لە هەرەتی لاویەتیدا هاتۆتە بەغدا، دەبێتە کارمەند لە دەزگای پۆستەدا کەوا بۆ یەکەمجار لە ١٨٦١-١٨٦٦ تەلی لە عێراق بۆ راکێشراوە.

یوسف زیاء لە فەرمانەکەیدا پێش دەکەوێ، تا ئەوەی دەبێتە بەڕێوەبەری تەلەگراف(برق). دوای ئەوە دەگوازرێتەوە بۆ بەڕێوەبەرایەتی (ئەملاکی سنیە) کە موڵك و سامانەکانی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم بووە، بەڕێوەبەرایەتییەکەی لە بەسرە و تەرابلوسی رۆژئاوا و حەلەب و موسڵ و دواییەکەی لە بەغدا پێدراوە، هەر لەم شارەدا ماڵئاوایی لە ژیان دەکا(١٩٠٩). عەلی عەلائەدین ئالووسی لە کتێبەکەیا باسی دەکا و دەڵێ: پیاوێك بوو لە سەر وێرد و سڵاوات و خواناسی خۆی بەردەوام بوو، زانا و سۆفیەکانی لا خۆشەویست بوو. چوار زمانی بە باشی دەزانی: کوردی و عەرەبی و فارسی و تورکی.

## یوسف زیاء

ئەمەیان یوسف زیبایەکیترە (١٨٤٢-١٩٠٦)، خاوەنی "*الهدیة الحمیدیة فی اللغة الکردیة*" لە قودس لە دایك بووە، هەر لەوێش کۆچی دوایی دەکات، دەرسی عەرەبی لە قوتابخانەی زمانە رۆژهەلاتیەکاندا لە ڤیەنای پایتەختی نەمسا گوتۆتەوە، ساڵی ١٨٧٦ ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی عوسمانی بووە.

محەمەد ئەمین زەکی لە کتێبەکەیا (مێژووی سلێمانی) بە ناوی *یوسف ضیاء* ئەفەندی باسی دەکا و دەڵێ: ئەوە لە نەوەی شێخ خالید نەقشبەندیە، لە دیمەشقی شام نیشتەجی بووە. بە نازناوی (المقدس) ناسراوە، "*عكاز الادب*" و "*التحفة الحميدية*"ی داناوە.

## ئەحمەد فایز

کوڕی سەید مەحمودی کوڕی ئەحمەد کوڕی عەبدولسەمەد فەزڵەددین کوڕی حەسەن گلەزەردەییە سەعدانی لە سەیدەکانی بەرزنجەیە، ساڵی ١٨٤٢ لە گلە زەردەی نزیك سلێمانی هاتۆتە جیهان، لە لای باوکی و حاجی کاك ئەحمەدی خاڵی و زانایانیتر دەخوێنێ، لە ١٨٦١ دەبێتە مامۆستا پاشان دەیکەنە قازی و، پایەکەی لە کۆیە، قەرەداغ، کوت، ناسریە، کەربەلا، دەرسیم و ئورفە بینیوە، لە ساڵی ١٨٩٠ روو دەکاتە ئاستانە ساڵێکی لی دەمێنێتەوە، دوایی بە قازیەتی دەنێردرێتە ویلایەتی قەستە موونی.

ئینجا بۆ موسڵ ١٨٩٥ چەند ساڵێك لەو فەرمانەیدا دەمێنێتەوە، دەگەڕێتەوە ئاستانە دەبێتە ئەندام لە ئەنجومەنی "مەعاریف" دواجار لە ساڵی ١٩١٨ لە پایتەختی عوسمانی کۆچی دوایی دەکات، کتێبی بە عەرەبی و کوردی و تورکی و فارسی داناوە: *خلاصة العقيدة فى شرح الدرة الفريدة، (فى العقائد) تحفة الاخوان، فى المعانى و البيان، خيرالاثر فى مدح ال سيد البشر، جلاء الطرف فى اختصار الصرف، انفس الفوائد(فى علم الكلام) السيف المسلول- الدر المنظوم ارشاد العباد الى صحيح الاعتقاد، السحر الحلال فى تعريفات العلوم، كنز اللسن المكنوز*-... هتد.

## عیزەت بەگ خەندان

عیزەت بەگ کوڕی حوسێن پاشای خانەوادەی خەندانە، برای سەعید پاشای وەزیری دەرەوە و سەرۆکی ئەنجومەنی شورای دەوڵەتی عوسمانییە، ساڵی ١٨٧٠ لە ئاستانە هاتۆتە دنیا، لەوی خوێندویەتی، ساڵی ١٨٨٦ دەچێتە کاری فەرمانبەرایەتی وەزارەتی دەرەوە، لە پلەوپایەکانیدا پێش دەکەوێ، کاتی دەستوری عوسمانی لە ١٩٠٨ ڕاگەیەندرا نزیکەی نۆ

مانگ لە فەرمان لادەدرێ، پاشان دەیگەڕێننەوە بە بەڕێوەبەری فەرمانگەی رەگەزناسی (جنسیە)، پاشان لە سەردەمی وەزارەتی غازی ئەحمەد موختار دەیکەنە والی وان١٩١٢، بەڵام دوای ماوەیەك لە پایەکەی دەخەن، لە سەرئەنجامی ئاگربەستندا، لە وەزارەتی ئەحمەد تۆفیق پاشا دەیکەنە وەزیری ئەوقاف ١٩١٨، دوای ئەوە بریکاری وەزیری (تەموین) و ناوخۆیی لە وەزارەتی داماد فەرید پاشا پلەی وەزیری ناوخۆیان پێداوە بەڵام نەیکردووە، دامەزرا بە والی ئیزمیر، کە سوپای یۆنانی ئەو شارە داگیر دەکات، سوکایەتی و ئازار و ئەشکەنجەیەکی زۆری پێ دەگەیەنن. هەر لەو پایەدا سەردەنێتەوە(کانونی دووەم ١٩٢٠).

## سلێمان بەگ خەندان

سلێمان بەگ خەندان برای عیزەت بەگ و بچووکترین کوڕانی حوسێن پاشایە، ساڵی ١٨٧٩ لە ئەستەنبول هاتۆتە دنیا، کە باوکی دەمری تەمەنی نۆ ساڵ دەبێت، خوێندن تەواو دەکا، لە خوێندنگەی جەنگی دەردەچێت دەیکەنە یاوەری (مرافق) سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم، دەگاتە پلەی میر ئالای (زەعیم یا عەمید) لە ئاکامی راگەیاندنی دەستوردا لە خزمەتگوزاری سوپایدا دەست بەردار دەبێت، خووی داوەتە لێ توێژینەوەی مێژوویی.

بە ئەندامی کۆڕی زانیاری مێژووی تورکی هەڵدەبژێردرێ، دەبێتە مفەوەزی سنوور لە (یانە) ی سەر ئاقاری رۆمانی ١٩١٢، دوای ئەوە دەیکەنە قایمقامی دهۆك، دەگەڕێتەوە ئەستەنبول، سەبارەت بە چوونە ناو حیزبی هەمەلایەنەی بەرهەڵستکارەوە دەگیرێ، دوای بەردانی دەیکەنە یاریدەدەری بەڕێوەبەری گشتی ئاسایش. کە عیزەت بەگی برای دەبێتە والی ئیزمیر ئەویش لەگەڵی دەچێت. پاش مردنی بە هەفتەیەك براکەشی کۆچی دوایی دەکات١٩٢٠.

## ئیسماعیل پاشای بابان

ئیسماعیل پاشای بابان ناسراو بە بەغدادی کوڕی محەمەد ئەمین پاشا کوڕی سەلیم پاشای بابانە، لە بەغدا هاتۆتە دنیا. لە قوتابخانەی سوپایی ئەستەنبول دەخوێنێ، پێبەپێ لە پایەکانی سوپادا بالاّ دەبێت تا دەگاتە پایەی میرلیوا (عمید)، بۆتە پشکنینەری پۆلیس. واز لە خزمەتگوزاری دێنی و خۆی خەریکی لێکۆڵینەوە و دانان دەکات، دوو کتێبی داناوە کە هەردووکیان لە دوو بەش پێکهاتوون، (*هدیة العارفین فی السماء المؤلفین و اثار المصنفین*) و ئەوەی تریان (*ایضاح المکنون فی الذیل علی کشف الظنون*)، ساڵی ١٩٢٠ لە ئەستەنبول جیهان بەجێ دەهێڵێ.

## مستەفا زهنی پاشای بابان

مستەفا زهنی پاشا کوڕی حسێن بەگ کوڕی محەمەد پاشا کوڕی خالید پاشایە، لە میرەکانی بنەماڵەی بابانە، لە دەوروبەری ساڵی ١٨٥٠ لە سلێمانی هاتۆتە دنیاوە، لە تەمەنی نۆزدە ساڵیدا لە ویلایەتی بغداد لە سەردەمی مەدحەت پاشا دەبێتە فەرمانبەر، لە پایەکانیدا پێش دەکەوێت تا ئەوەی دەبێتە (موتەسەریف) ی تەرابلوس و کەربەلا و والی لە ئەدەنە و بانیە و حیجازدا.

پاش جاڕدانی دەستور لە ١٩٠٨، وەزیری ناوخۆیی ویلایەتی بغدای پێ دەسپێرن، بەلاّم نەیکردووە، فەرەنسی و زمانی تری باش زانیوە، کتێبی بە زمانی تورکی داناوە، ساڵی١٩٢٦ لە ئەستەنبول کۆچی دوایی دەکات.

# ئیسماعیل حەقی بەگ بابان

کوڕی مستەفا زهنی پاشای بابانە، ناوبانگی بەنوێنەری و نووسەرو مامۆستای حقوق دەرکرد، سالی ١٨٧٦ لە بەغدا هاتۆتە دنیا، دەچێتە ئەستەنبۆل، لەوی لە حقوق دەخوێنێ و بڕوانامەکەی لی وەردەگرێت (١٩٠٢)، بیروڕای ئازادیخوازانی تورکی کاری تێدەکا، هەر لە هەرەتی لاویەتیەوە لایەنگری ئازادی و حوکمی دەستوری بووە، لە دەزگای چاپەمەنی دەبێتە کارمەند، کە دەستور لە ١٩٠٨ راگەیەندرا لە فەرمان دەستبەردار دەبێ. دێتە مەیدانی رۆژنامەگەری، مژدەی بیروڕای نوی رادەگەیەنێ، داواکاری چاکسازی بووە، کاری نووسەری لە رۆژنامەی (طنین) کە خاوەنەکەی حوسێن جاهید یالچین بوو کردووە، پێکەوە لەگەڵ عەلی رەشاد بەگ کتێبێك لە سەر (بسمارك) دادەنێن، دەرسی مافەکانی بنچینەیی لە حقوق پێدەسپێرن. بە نوێنەری بەغدا بۆ ئەنجومەنی نوێنەران هەڵدەبژێردری (المبعوثین) کانونی یەکەمی(١٩٠٨)، ئینجا نوێنەری دیوانیە لە دەورەی دووەمدا (نیسانی ١٩١٢)، خەیری عومەر دەڵێ: دوو دەورە نوێنەرایەتییەکەی ئیسماعیل حەقی ئەوەی سەلماند کە چەند سەرگەرمی نیشتمانپەروەری بووە. هەر لە سەرەتادا بەرهەڵستی پرۆژەی هێلی ئاسنینی شەمەندەفەری بەغدای کردووە، کە ئەڵمانیا بە نیاز بووە پێی هەڵبەستێ. هەستی قوڵی بەرپرسیار بوونی بە ئەرکی نوێنەرایەتیەکەی وای لی کردووە کە بچێتە ناوچە هەڵبژێردراوەکەی خۆی و دیراسەتێکی وردی لە سەر گیروگرفت و پێداویستی و چۆنیەتی چارەسەر کردنی کردووە، رۆژنامەی (طنین) بە زنجیرە وتارێك لە ژێر ناوی (رسائل الوان) بۆی بلاو کردۆتەوە، پاشان لە کتێبێکی بچووك کۆ کرایەوە و بە چاپ گەیاندرا (١٩١٣)، ساڵی ١٩١٣ کردیانە وەزیری "مەعاریف"ی تورکی، کەچی کتوپڕ لە کاتی دەرس وتنەوە لە کۆلیجی شاهانەدا دڵە مەزنەکەی لە لێدان دەوەستی (٢٥ کانونی یەکەم١٩١٣)، موحازەرەکانی یاسایی بە زمانی تورکی لە کتێبێکدا بە ناوی (الحقوق الاساسیە) کۆ کراوەتەوە.

پەیوەندییەکی دۆستایەتی بەتینی لەگەڵ شاعیری ناوداری کورد جەمیل سدقی زەهاوی هەبووە. بە پارچە هەڵبەستێکی پڕ سۆز شیوەنی بۆ دەکا و دەڵێ:

*جاءت الصحف حاملات نعيا اكبرته الاسماع في بغداد*

*فبكت في بغداد حقي عيون كان حقي منها مكان السواد*

*كان مندوبها وكانت تباهي برجاحاتة جميع البلاد*

*فبكينا شبابة و بكينا جلدا فية راسخ الاوتاد*

*بابي انت من اديب شجاع نام في اللحد بعد طول الجهاد*

## سلێمان نەزیف بەگ

والی بەغدا شاعیری گەورەی تورك وندكار سلێمان نەزیف بەگ كوڕی سەعید پاشای والی ئەدیب و دانەری "*میزان الادب*" و "*مرات عبر*" لە نەژادی كوردی دیاربەكرە، سلێمان نەزیف لە ساڵی ١٨٦٨ هاتۆتە جیهان. لە سەردەمی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمدا لە ئەوروپا ژیاوە، بە بیروڕای ئازاد و دەستوور پەروەری ناسراوە. دەیكەنە بەڕێوەبەری (تەحریر) لە بروسە و جەدە، پاشان دەبێتە والی بەسرە (تشرینی یەكەمی ١٩٠٩)، لە ساڵی داهاتوودا واز دەهێنی (تشرینی یەكەمی ١٩١٠)، دەبێتە والیی قەستەمونی، ئینجا موسڵ (تشرینی دووەمی ١٩١٣) و بەغدا (٥ی كانونی دووەمی ١٩١٥)، ئاهەنگی بوونە والیەتی بۆ دەگێڕدری (٦ی ئازاری ١٩١٥)، دوانێكیدا ئاواتەخوازی خۆی تێدا دەربڕی كەوا بتوانی لەم ناوە پیرۆزەدا خزمەت بكا كە پێشتر لە ویلایەتی بەسرە و موسڵ كارمەند بووە. ئێستاش وا هاتۆتە بەغدا لە كاتێكا هەوری رەشی شەر بەری ئاسمانی داگرتووە، بەسرەش لە جەستەی دەوڵەتی عوسمانی دابڕاوە، داوای كارگوزاری و هۆشیاربوونی لێكردن. هیوای سەركەوتن و بڵاو كردنەوەی ئاوەدانی و خۆشگوزەرانی خواست، بەڵام سەردەمەكەی لە بەغدا زۆرخایەن نەبوو.

حکومەتی تورکی بڕیاری یەکبوونی هەردوو بەڕێوەبەرایەتیەکەی سوپایی و شارستانیەتیدا، میر ئالآی (عەمید) نورەدین بەگ بە والیەتی و سەرکردەیی داندرا. سلێمان نەزیف لە پێنجی ئەمموز لە پایەکەی لادرا، بەرەو ئەستەنبول دەگەڕێتەوە. مەحمود سوبحی دەفتەری وەزیری داد و وەزیری دەرەوەی عێراقی بۆی باس کردم گوتی: (ساڵی ۱۹۱۷ پێکەوە لەگەڵ سلێمان نەزیف لە هەیوانەکانی کۆشك و تەلاری (باب العالی) لە ئەستەنبول دەرۆیشتین، تەلعەت پاشای سەدرِی ئەعزەمیان پێدەگا زۆر بە ڕێز و نەوازشتەوە سلاو لە والی پێشو دەکات، بەلام ئەو واتا- سلێمان نەزیف- ڕووی خۆی لی وەردەگێڕی و وەلامی ناداتەوە، چونکە تەلعەت لە والیەتی بەغدای خستبوو.. پەیوەندی بەتینی دەفتەری لەگەڵ سلێمان نەزیف ئەدیب لە بەغداوە دەست پێدەکات و لە ئاستانەش پتر دەبێ، تا ئەو پەیوەندییە بۆتە دۆستایەتی و ئاشنایەتیەکی خۆشەویستانە. سلێمان نەزیف لە کاتی جەنگا دێتە بەغدا و، بۆ مەبەستی ناسین و شوناسی پێشوازی لە فەرمانبەر و مامۆستایان دەکا، لە ناویاندا مامۆستای ئەدەبی تورکی لاو مەحمود سوبحی دەفتەری سەرنجی ڕادەکێشی و لە لای خۆی دەیهێڵێتەوە، دەربارەی کاروباری ئەدەبی دەیدوێنێ. والی هەموو سبەینانی هەینی بۆ چاوپێکەوتنی خەڵکەکە لە دیوان دادەنیشت.

ناودار و زانا و پیاوچاکانی بەغدا دەهاتنە لای، لە پێش هەموویانەوە جمیل سدقی زەهاوی، قونسلی دەوڵەتەکان و هیتر، ڕۆژێکی هەینی دیوەخانەکەی پڕ میوان دەبێ، لە ناکاو سکرتێرەکەی دێتە ژوورەوە، لە بن گوێی والی دەچرپێنی کەوا پیاوەکەیان هێناوە. سلێمان نەزیف بەگ یەکسەر هەڵدەستی و دەچێتە ژوورەکەیترەوە فەرمان دەدا کابرا دارکاری بکەن، دارکاریەکی شل و کوت، کە دەگەڕێتەوە کۆڕی مەجلیسەکە هەموو چاوی پرسیاری تی دەبڕن، دەڵێ: دەسەلاتداریەتی سوپا فەرمانی دەرکردووە کە دەبێت ئاگادار بکری لەو گەنم و دانەوێڵەیەی خەڵك بۆ خۆیان داکردووە. بۆ ئەوەی بیبەن و بیکەنە ئازوقەی سوپا. ئەو پیاوەش وەك زانیم پیشەی چاوتێبڕینی هەژار و بێوەژن و

پێوەستەمەندەکان بووە، خەبەریان لێ بدا لەو گەنم و برنجە کەمەی کە بۆ گوزەرانی ژیانی خۆیان هێشویانەتەوە، ناچار تەمبێی بکەم بەو شێوەیەی کە دیتتان..... دکتۆر محەمەد سدیق جەلیلی بۆی باس کردم و گوتی: سلێمان نەزیف سێزدە مانگ بە والیەتی لە موسڵ دەمێنێتەوە. ( لە تشرینی ١٩١٣ هەتا کۆتایی کانونی یەکەمی ١٩١٤)، لەوێوە لە سەرەتای ١٩١٥ بە (کەلەك) لە زێی دیجلەوە دەگاتە بەغدا. کە هەندێك جادە و شەقامی نوی لە موسڵ دەکاتەوە خەڵکەکە پێیان ناخۆش دەبێت. عەبدولمەجید متەوەلی دەڵێ:

*ما للرجاله ساكتين أراهم لزموا عن الحق المبين سكوتهم*

*قوم بأيديهم وايدى غيرهم اضحوا فأرخ يخربون بيوتهم*

مێژووەکەش بە حیسابی (الجمل) دەکا (١٣٣١ك.١٩١٣ز). سلێمان نەزیف بەگ گەلێ کتێبی داناوە لەوانە: نامیق کەمال، *فضولي*، *فراق عراق*، جالمش أوكله، (موڵکە دزراوەکان لە زەوی و زاری سنیە) کە سوڵتان عەبدولحەمید بەگەڵ موڵکەکانی خۆی داوە. *الشاه ناصرالدين و البابية- بطارية ايلة ايتش* (تۆپەکان و ئاگر١٩١٧)... هتد، گەلێ وتاریشی لە گۆڤاری (*ثروة الفنون*)، (*تصوير افكار*) دا بلاّو کردۆتەوە، سلێمان نەزیف لە شاعیرە بەرزەکانی کوردە بووە. عەباس عەزاوی دەڵێ: پەرۆشی خۆشەویستی عێراق بوو (باشترین نیاز و ئاواتی پیرۆزی بۆ لە دڵدا بوو، پەرۆشی دابڕین بوو لە جەستەی دەوڵەتی عوسمانی، ئەمەش بە چاکی لە بەرهەمە دووایییەکانیدا دەردەکەوێت، دەڵێ: وەك بزانم داکی ئێزدی بووە مەلیك تاوسی بۆ یەزیدیەکان گەڕاندۆتەوە).

لە کانونی دووەمی ١٩٢٧ لە ئەستەنبول جیهان بەجێ دێڵێ: سلێمان نەزیف پارچە هەڵبەستێکی داناوە کە داخی دابڕانی بەغدای لە باوەش ئالی عوسمانی تێدا دەربڕیوە، مەعروف رەسافی کە ئەوسا نوێنەر بووە لە پایتەختی تورکی بە هەڵبەستێك (نواح دجله) وەڵامی داوەتەوە دەڵێ:

*هی عینی و دمعها نضاح کل حزن لمائها یمتاح*

*کیف لاأذرف الدمع و عزی بید الذل هالك مجتاح*

سلێمان نەزیف عەرەبی خۆش دەویست وداوای برایەتی تورك و عەرەبی دەکرد، کە تورکە توندڕەوەکان دوای ڕاگەیاندنی دەستور و ئالاَّ و بەیداخی تۆرانیەتیان بەرز کردەوە، گیانی شێتگریەتی نەتەوایەتییان بلاَّو دەکردەوە و بانگەوازی پاکساز کردنی زمانی تورك لە وشەکانی عەرەبییاندا، چەند کەسایەتیەکی ئازادیخواز لێیان ڕاست بوونەوە، لەوانە: سلێمان نەزیف و ئەبو زییاء تۆفیق بەگ خاوەنی ڕۆژنامەی "تصویر افکار" و عەلی کەمال بەگ، دژیان وەستان، درۆ و دەلەسەکانیان پوچەڵ دەکردنەوە. داوای لێبوردن و تەبایی و یەکگرتنیان لەگەڵ میللەتەکەیان دەکرد، هەروەك ئەحمەد عیزەت ئەعزمی لە بەشی یەکەمی کتێبەکەیا (*القضیة العربیة*) باسی کردووە، مەحمود سوبحی دەفتەری ئەدیبێکی زمانی تورکی بوو، کە ڕۆژنامەکانی ئەستەنبول وتارەکانی لە بەرگری کردنی عەرەب و ڕەتکردنەوەی ئەو تاوان و تۆمەتانەی کە بە ناحەق و خۆڕایی خراونەتە پاڵیان بلاَّو دەکردەوە، غۆستاف غۆترو لە کتێبەکەیا (فەرەنسا لە سوریا و کلیکیا) کە لە ساڵی ١٩٢٠دا چاپ کراوە دەڵێ: لە ئاکامی تێکشکانی تورکیا لە جەنگی گشتیدا (١٩١٨) و داگیرکردنی ناوچەی کلیکیا و بنکەی "ئەتەنە" لە لایەن فەرەنسا و بەریتانیاوە، تورکەکان کەوتنە جموجۆڵی هاندانی سەردارانی کورد لە ناوچەی ماردین و دیاربەکر، بۆ خواستی سەربەخۆبوونی کوردستان، سلێمان نەزیف لەگەڵ عەبدوڵلاَّ جەودەت و هیتر لە پێشەوەی هەموو داواکارانی ئەم بیروڕایەدا بوو.

## فایەق عەلی بەگ

شاعیری ڕۆمانسی برای سلێمان نەزیف ناوبانگی دەرکرد، ساڵی ١٨٧٥ لە دیاربەکر هاتۆتە دنیاوە. لە قوتابخانەی (الملکی الشاهانی) لە ئاستانە دەرچووە. فەرمانی بەڕێوەبەرایەتی

گرنگی وەرگرتووە، لە کاتی جەنگی یەکەمی مەزندا موتەسەریفی ئاستانە دەبێ دوای ئەوە دەبێتە والی، کتێبەکانی کە دایناون: *الحان الوطن*، مەدحەت پاشا، کۆمەڵە شیعرێك.

## ئەمیر لیوا مستەفا پاشا یاملکی



مستەفا شەوقی کوڕی عەزیز یاملکی کوڕی مەلا مستەفای کوڕی مەلا عەزیز کوڕی مەلا حەیدەر لە عەشیرەتی بڵباسە، ساڵی ١٨٦٦ لە سلێمانی هاتۆتە جیهان. دەچێتە بەغدا لەوێ خوێندنی ئامادەیی تەواو دەکات. پاشان بۆ ئاستانە دەڕوات، لە خوێندنگای سوپایی و قوتابخانەی ئەرکان دەخوێنێ. ساڵی ١٨٨٨ بە پایەی رەئیس روکن دەردەچێت، ساڵێك لە وەزارەتی جەنگ خزمەت دەکات، پاشان دەگوازرێتەوە بە ئەفسەر روکن لە تیپی حیجازدا و ئەندازیار لە مەکەدا. دوای ئەوە ساڵی ١٨٩٣ دەیکەنە قونسل لە (خوی و سلماس) – لە ساڵی داهاتوودا دەگوازرێتەوە بۆ (سنە) دوایی بۆ قارس (١٨٩٧). دەگەڕێتەوە سوپا و دەکرێتە بریکاری سوپاسالاری لەشکری شەشەم لە بەغدا (١٩١٠)، لە ساڵی ئایندەدا دەیگوازنەوە بۆ (سیواس)، ئەرکی رێکەوتنی تخوب و سنوری ئێرانیان پی سپاردووە، پاشان دەبێتە سەرەك ئەرکانی تیپی سوپا لە ئەنقەرە (١٩٠٨)، بۆ پایەی ئەمیر لیوا باڵا دەکرێ. دەیکەنە سەرکردەی تیپی بیستویەك لە بەغدا، پاشان ساڵی ١٩١٠ دەگوازرێتەوە بۆ تیپی سێیەم لە ئازەربایجان، لەوێ، دەبێتە سەرکردەی (فەیلەق) ی دەیەم. ساڵی ١٩١١ شەری تورکی و ئیتالی بەرپا دەبێ، سەرکردایەتی تیپی پێنجەمی پی دەسپێرن، بە ئەرکی

بەرگری و خۆسەپاندن لە دەربەندی دەردنێل هەڵدەستێ، بە سەرکردایەتی تیپی بیستوحەوتەم بەشداری لە شەری بلقان دەکات. تووشی جەنگی غالیپولی و بولایر و ستاندنەوەی ئەدرنە هاتووە. ساڵی ١٩١٤ بە فەرمانی وەزیری جەنگ ئەنوەر پاشا خانەنشین دەکرێ. لە ١٩١٨ جەنگ وەستێنرا. کردیانە ئەندام لە مەحکەمەی عورفی سوپایی، دوایی بووە والی بروسە.. داماد فەرید پاشای سەدرِی ئەعزەم فەرمانی پێك هێنانی ئەنجومەنێکی سوپایی بە سەرۆکایەتی مستەفا پاشا دەرکرد بۆ مەحکەمەکردنی مستەفا کەمال پاشا (ئەتاتورك) و هاورێکانی لە سەردارانی نیشتمانی، کە لە رووی دەسەڵاتداریەتی حکومەتی ئاستانە لە ئەنازۆل راوەستاون، لە ٢٠ی ئایاری ساڵی ١٩٢٠ فەرمانی خنکانی پاشملەی بە سەر مستەفا کەمال و ئەمیر لیوا فوئاد پاشا و فەریق مستەفا پاشا (چقماق) و حوسێن رەئووف بەگ هیترِدا سەپاند، بە پێی ئەوەی ئەوانە یاخیگەرن.

کاتی بزوتنەوەکەی مستەفا کەمال کەوتە برەو و سەرکەوتنی تەواوی وەدەست هێنا، لە ئاکامەکەی ترسا.. لە ١٩٢١ پایتەختی تورکی بەجی هێشت و گەرایەوە عێراق. بە وەزیرایەتی (مەعاریف) بەشداری لە حکومەتی کوردی کرد، کەوا شێخ مەحمودی حەفید لە سلێمانی پێکی هێنابوو (تشرینی یەکەمی ١٩٢٢). رۆژنامەیەکی لەوی بە ناوی "بانگی کوردستان" بە زمانی کوردی و فارسی و تورکی دەردەچوواند (٢ی ئابی ١٩٢٢)، دووبارە ئەم رۆژنامەیەی بە کوردی لە بەغدا دەرکردووە (٢٨ی کانونی دووەمی ١٩٢٦). لە بەغدا لە ٢٥ی کانونی دووەم جیهانی بەجی هێشت.

هاوسەرەکەی سەفیە خانم کچی حوسێن پاشای خەندانە، خوشکی سەعید پاشا وەزیری تورکی بەناوبانگ بوو، مستەفا زۆر بە نەتەوەکەی خۆی دەنازێ، گوتوویەتی:" گەلی کورد بە بی سیاسەت و زانست ژیانی نابی "، دەڵێن لە کاتی سەرەمەرگا گوتوویەتی:" ئامادە بووم لە پێناوی هەتیوێکی بێکەسی کورد بە رووی پاشایەکدا بچم". مستەفا پاشا لە دوا رۆژانی ژیانیدا شیعری هۆنیوەتەوە لەوەی کەوا نوسیویەتی:" ئەترسم بمرم نەی وەتەن

نەبینم بەختیاری تۆ- با بنوسن لە سەر گۆڕم وەتەن غەمگین و من غەمگین". بوێر و دلێرانە نەفرەتی خۆی دژ بە توندڕەوی ڕەگەزپەرستییەتی ڕاگەیاندووە، هاندەر و لایەنگری بزوتنەوەکانی کورد بووە. لە سەر وەسیەتی خۆی لە سلێمانی لە گردی سەیوان نێژراوە، هەروەك لە پارچە شیعرێکدا گوتوویەتی:

دەترسم ئەی وەتەن بمرم لە داخ هیجری تۆ

بە ئاواتم لە باوەشتا بکەم رۆحم سپردەی تۆ

لە وەختی غەرغەرە توخوا دوو قەترە ئاوی کانێسکان

فەقەت تابوتەکەم دانێن لە بەرزی گردەکەی سەیوان

"وەرگێڕ"

## ئەمیر لیوا ئەمین پاشا ڕواندوزی

ئەمین ڕواندوزی لە دەوروبەری ساڵی ١٨٦٥ هاتۆتە جیهان. لە خوێندنگای سوپای تورکی و قوتابخانەی (ئەرکانی جەنگ) دەخوێنێ، بە ئەفسەری تۆپ دەچێتە ناو سوپای عوسمانییەوە. لە پلەوپایەکانی پێش دەکەوێ تا بە پایەی لیوا دەگات. لە ماوەی جەنگە مەزنەکەدا سەرکردە دەبێ، پاش کۆتایی جەنگ دەگەڕێتەوە عێراق، بە نوێنەری هەولێر هەڵدەبژێردری (ئابی ١٩٣٥). دەیکەنە سەرەك لێژنەی کاروباری سوپایی. لە ساڵی ١٩٤٣ لە بەغدا کۆچی دوایی دەکات. خۆم دیتبووم کەوا پیاوێکی پیری بەساڵاچوو بوو، هاموشۆی کۆڕ و مەجلیسە کۆمەڵایەتییەکانی دەکرد، لە کاتی جەنگی دووەمی جیهانیدا ڕاکانی خۆی لە سەر ڕووداو و بەسەرهاتەکان دەردەبڕی. شێوەی ڕووچوونی شەرەکەی لێك



دەدایەوە. سامی خوندە بۆی باس کردم گوتی ساڵی ١٩٣٥ بۆ مەبەستی پشکنینی دارایی دەچێتە (ڕمادی) لە کاتێکا لە هۆڵی ئۆتێلەکە دادەنیشن، لەولاشەوە لیوا بەکر سدقی سەرکردەی تیپی دووەمی لێ دەبێ لە ناکاو پیاوێکی لێوەشاوەی بەهەیبەت دێتە ژوورەوە، لە لایەکی ساڵۆنەکە دادەنیشێ، بەکر سدقی گوتی: ئەوە لیوا ئەمین پاشای رەواندوزییە. هەستا چوو بە سڵاوێکی سوپایی بەخێرهاتنی لێکرد. بە ڕێزەوە بە زمانی تورکی پێی گوت: گەورەم پاشا دەمناسییەوە؟ ئەمن بەکر سدقیم، لە کاتی جەنگی گشتیدا من (ڕائد) بووم لە لات!! ئەمین پاشا گوتی: بە داخەوە تۆم نایەتەوە بیر. تۆ دەزانی ئەفسەران سەرکردەکانیان لە یاد ناکەن. بەڵام چۆن سەرکردەکان هەموو ئەفسەرانی ژێر فەرماندەی خۆیان لەبیر دەمێنێ!! [١٦]

---

[16]- شایانی گوتنە کە ئەمین رەواندزیەکی دیکە هەیە کە ئێمە لە نزیکەوە دەیناسین (١٨٩٨-١٩٥٥) ، نازناوی پاشایەتی نەبووە، یەکێك بووە لە ئەفسەرە کوردپەروەرەکان، دلێرانە لە پێناو ئامانجە پیرۆزەکانی نەتەوەکەی تێکۆشاوە، چۆتە ریزی رێکخراوە کوردیەکانی سەردەمی خۆی، هەڵوێست و رۆڵی بەجەرگ و بوێرانەی نواندووە، دوای دابڕانی لە سوپادا، سەردەمێك سەرەك شارەوانی شاری رەواندوز بووە، هەر لەوێش سەری ناوەتەوە. کوڕەکانی د.وریا لە ڤیەننا دادەنیشی، د.زۆزك لە ئیماراتە، چەتۆ ساڵی ١٩٩٤ لە نێوان بەغداد و کوت کوژرا، کچەکانی (هێدی) خێزانی تەیموری ساڵح زەکی بەگ بوو لە لەندەن کۆچی دوایی کرد، پیرۆزە لە بەغدایە. "وەرگێڕ"

# کوردەکانی میسر

بۆ هەر بار و نیازێك بووبی کوردەکان بۆ میسر ڕەویان کردووە، جگە لە قارەمانی (حطین) و ڕزگارکەری قودس سولتان مرۆڤپەروەری سەروەر سەلاحەدینی ئەیوبی (١١٣٧-١١٩٣) کەوا لە تکریت، لە عێراق دەچێتەدەر، دەبێتە خاوەنی میسر و شام و وڵاتی جەزیرە و موسڵ. سەردەستە و میری شاعیران ئەحمەد شەوقی بەگ (١٨٦٨-١٩٣٢) کورد نەژادە. وەك لە باوکی گوێ بیستبووە.

## عەباس بازارلی

عەباس بازارلی ناسراو بە (سەرباز) : ئەفسەرێکی کوردە، دەست بەکار دەبێ لە خزمەت محەمەد عەلی پاشا والی میسر، بەشداری لە شەری سودان دەکات، لە دەوروبەری ساڵی ١٨٠٢ هاتۆتە دنیا. لە ساڵەکانی ١٨٣٢-١٨٣٥، ١٨٣٦-١٨٣٨ بەڕێوەبەری (بەربەرە) دەبێت و هەر لەوی ساڵی ١٨٣٩ کۆچی دوایی دەکات. هەروەها سلێمان بازارلی برای لە ئەفسەرانی سوپای محەمەد عەلی پاشا دەبێ، بۆ مەبەستی هێنانەوەی ماڵ و خێزانی براکەی دێتە (بەربەرە)، کەچی لەوی لە هەمان ساڵدا دەکوژرێ.

## عەلی رەزا بەگی کورد

عەلیرەزا بەگی کورد ناسراو بە (کوردی)، دەڵێن هاتنە دنیای ساڵی ١٨١٤ بووە، لەو هەڵمەت و بەرەنگاربوونەوەی میسرِ بە سەرکردایەتی ئیسماعیل کامیل پاشا، کوڕی سێیەمی والی محەمەد عەلی پاشا لە ساڵی ١٨٢٠ لەگەڵ باوکی دێتە سودان. لە هەرەتی نەوجەوانیدا دەچێتە ناو سوپا، زۆر ناخایێنێت دەبێتە "بلوك باشی " واتە ئەفسەر لە هێزی "غەیرە نیزامی "، باج و خەراجی لە ناوچەی رۆژهەڵاتی نیلی شین پی دەسپێرن، چەند ساڵێك بەو ئەرکە هەڵدەستێ، ساڵی ١٨٦٥ بۆ پایەی (سنجق) کە بەرانبەر–میر لیوا–یە باڵا دەکرێ. لە ژێر فەرماندەی موسا حەمدی پاشا، حاکمی گشتی سودان بە چەند بزوتنەوەیەکی سوپایی لە "سووق ئەبووسن" هەڵدەستی و پاشان بۆ قایمقام دەگۆڕدرێ، ساڵی ١٨٦٦ دەیکەنە حاکمی ناوچەی نیلی سپی، تا ساڵی ١٨٧١ لەو پایەی دەمێنێتەوە.

حوکم دەدرێت بە تۆمەتی خراپەکاری دەسەڵاتدارییەکەی، پاشان بێتاوانی لی دەردەکەوێت، بەری دەدەن و دەیگەڕێننەوە بۆ فەرمانی حاکمییەتی نیلی سپی (١٨٧٥)، یاخیبوونەکەی "الشلوك"دا دەمرکێنێتەوە.

کە شۆڕشی مەهدی لە جەزیرە بەرپا دەبێ و بەشداری لە قەڵاچۆکردنیدا دەکات، ساڵی ١٨٨٤ لە شاری خەرتووم گەمارۆی دەدەن، بەڵام توانی لەگەڵ ئەوانەی کە بە هۆی ئەو کەشتیانەی لە ژێر فەرماندەی (محمد نصحی) پاشاوە چوونەدەر ئەویش خۆی دەرباز بکات.

لە کاتی شۆڕشەکەی سودان ئامیریەتی هێزی (غەیرە نیزامی) بۆ پاراستنی سنوری باشووری میسرِ وەردەگرێ، ئیتر لە ١٨٩٠ لە فەرمان دەستبەردار دەبێ و پاشان لە قاهیرە کۆچی دوایی دەکات.

## فەریق ئیسماعیل حەقی پاشا- ئەبوجبل

ئیسماعیل حەقی کوڕی ئەبیبەکر عەلەمدار سوڵتان مەحمود خانە، لە خێزانیکی کورد نەژادە، لە ویلایەتی (معمورە العزیز) لە ئەنازول نیشتەجی بوون، باوکی قایمقامی شارەکە

دەبێ، ئیسماعیل حەقی لە ساڵی ١٨١٨ هاتۆتە دنیا، باوکی لە ساڵی ١٨٣٣ دەینێرێتە میسر دەچێتە قوتابخانەی (القلعه الحربیه) بە دوو ساڵ تەواوی دەکات، تێکەڵ بە سلکی سوپا دەبێ، بەشداری لە شاڵاو بردنەکەی ئیبراهیم پاشا دژی وەهابیەکان دەکات، ئازایەتی و نەبەردیتی ئەوتۆی نواندووە نازناوی (ابوجبل) یان بەسەردا بڕیوە، دەگەڕێتەوە میسر، چەند فەرمانێکی بینیوە، ساڵی ١٨٥٠ لە جێی ڕۆستەم پاشا دەبێتە حاکمی گشتی سودان، دوای ساڵێك داوا دەکرێتەوە بۆ میسر، لە سەر هەندێك تۆمەت کە دەخرێتە پاڵی حوکم دەدرێ، پاشان بە هۆی بێتاوان بوونی بەردەدرێ. ساڵی ١٨٥٤ لە قرم بەرامبەر سباستوبول بە سەرکردەیی لیوایەکی میسری دەجەنگێ، پاشان سەرکردایەتی گشتی هەڵمەت بردنی میسری پی دەسپێرن، ساڵی ١٨٥٧ دەگەڕێتەوە میسر. دەیکەنە سەرەك ئەنجومەنی (طنطا) دوایی سەرکردەی پیادە، دەستبەرداری دەکەن لە فەرمان، بەڵام پاش ماوەیەکی کەم دەیگەڕیننەوە بە ئەندام لە ئەنجومەنی ئەحکام، دوای ئەوە ئەرکی دامرکاندنەوەی ئاژاوەی عەرەبەکانی بیابانی (فەیوومی واحات) ی پێ دەسپێرن، بە بەرێوەبەری (قەنا و ئەسنا) دەگەڕێتەوە، ئینجا سەرەك ئەنجومەنی سوپایی لە میسر (١٨٦٣)، دوایی بەریوەبەری (غەربییە) و بۆ پایەی (فەریق) باڵا دەکرێ، دەیکەنە ئەندامی ئەنجومەنی ئەحکام دوایی بەرپرسیاری گشتی بەندەرەکان (١٨٦٧) ئینجا پارێزگاری قاهیرە. دەیگەڕیننەوە بە ئەندام لە ئەنجومەنی ئەحکام (١٨٧٤) و لە ساڵی ئایندەدا دەبێتە بریکاری ئەنجومەنەکە. پاشان ئەمینداری گشتی (بیت المال) (١٨٧٦)، دوایی سەرۆکی ئەنجومەنی ئەحکام (نیسانی ١٨٧٩) تا لە ئەیلولی ١٨٧٩ تەقاعود دەکرێ. لایەنگری خدێو تۆفیق بووە. ئامادەی ئەو ئەنجومەنەش دەبێ کە لە کۆشکی شاهانەی (راس التنین) کە لە ١٨٨٢ لە ئەسکەندەریە دەبەسترێ بۆ مەبەستی چارەسەر کردنی شۆڕشی عورابی. پێش ئەوەی ئوستۆلی بەریتانی تۆپبارانی قولغەکان بکات. لە ٢٥ی نیسانی ١٨٨٣ کۆچی دوایی کردووە.

## مشیر شاهێن پاشا

شاهێن کوڕی عەلی ئاغای کورد ئەژادە بە نازناوی (گەنج) ناسراوە، باوکی لە سەردەمی والی محەمەد عەلی پاشا لەگەڵ خۆی دەیباتە میسر، لە قوتابخانەی سوپایی (سان سیر) لە پاریس دەخوێنێ، لە سوپا دەست بەکار دەبێ، لە سەردەمی والی عەباس پاشای یەکەمدا بۆ پایەی قایمقام باڵا دەکرێ، بەشداری لە شەری قرم دەکات (١٨٥٣-١٨٥٥)، ساڵی ١٨٥٥ بۆ پایەی (میرئالا) باڵا دەکرێ، لە ساڵی ١٨٦٦ دەبێتە پارێزگاری قاهیرە، هەر لەو ساڵەدا خدیو ئیسماعیل لەگەڵ وەفدێکی سوپایی بۆ دیراسەت و لێکۆڵینەوە و هۆکاری بەرزکردنەوەی ئاستی سوپا دەینێرێتە فەرەنسا، بۆ پایەی فەریق باڵا دەکرێ، ئامادەی ئەو نمایشە سوپاییە دەبێت کە ئیمپراتۆر ناپلیۆنی سێیەم لە پاریس سازی دابوو، ئەمەش بە بۆنەی گەرانەوەی بەتالیۆنی سودانی کە لەگەڵ سوپای فەرەنسی بۆ مەکسیك ناردرابوو١٨٦٧. هەر لەم ساڵەشدا بە وەفد دەنێردرێتە سودان بۆ مەبەستی لێکۆڵینەوەی یاخی بوونەکەی سەربازانی سودانی (کسلا و سواکن). لە ساڵی ١٨٦٩ دەبێتە وەزیری جەنگ، بە مەبەستی پشکنین سەردانی سودانی رۆژهەڵات دەکات ١٨٧١، پاشان بەرێوەبەرایەتی هێڵی شەمەندەفەری سودانی پێدەسپێرن کە بریار بووە لە دۆڵی (حلفا) و (نقلا) رابکێشرێ. لە پایەکانی سوپا پێش دکەوی تا دەگاتە پایەی (مشیر)، لە وەزارەتی محەمەد شەریف پاشا دەبێتە وەزیری جەنگ (نیسان تەمموزی ١٨٩٧) لەو ساڵەدا خدیو لی دەخرێت ئەویش لەگەڵی دەچیتە ناپۆلی، ئیتر لەو شارە ئیتالیەدا جیهان بەجی دێڵێ.

## بنەماڵەی تەیموور

محەمەد کاشف کوڕی ئیسماعیل کوڕی عەلی ساڵی ١٨٠١ لەگەڵ سەربازانی عوسمانی دێتە میسر، لە رەچەڵەکدا کوردی باکوری عێراقە، دەچێتە ناو سوپای محەمەد عەلی پاشای والی، دەبێتە یەکێك لە دەست و پێوەندە تایبەتیەکانی پایەی (کاشفی) ی پێدەدرێ، دەبێتە پارێزگاری مەدینەی مونەوەرە (١٨٣٧)، دوایی بەرێوەبەری (شەرقیە) لە دەوروبەری ساڵی ١٧٦٥ لە دایك بووە. لە ١٨٤٨ کۆچی دوایی دەکات.

کوڕەکەی ئیسماعیل رشدی پاشا لە پایەکانی دەوڵەت لە سەردەمی هەردوو والیەکەدا عەباسی یەکەم و محەمەد سەعید پاشا و خدێو ئیسماعیل پێش دەکەوی ، بەرێوەبەری هەندێك بەرێوەبەرایەتیەکان و سەرەك دیوانی خدێو بووە، مردنەکەی لە رێکەوتی ساڵی ١٨٧٢ دەبێ، کچەکەی عائشەی تەیموری شاعیر و ئەحمەد تەیموری پاشای کوڕی ناوبانگیان دەرکرد، دوایی ئەوان دوو کوڕەکەی ئەحمەد: محەمەدی شاعیر و مەحمودی چیرۆکنوس ناودار بوون.

## عائیشە خانی تەیموری

عائیشە عیسمەت ساڵی ١٨٤٠ لە قاهیرە هاتۆتە دنیا، باوکی لە ماڵەوە مامۆستای تایبەتی بۆ دەگرێ، تورکی و عەرەبی و فارسی فێر دەبێ و چێژی لە ئەدەبەکەیان وەرگرتووە (نحو، عروظ، خط) دەخوێنێ، دیوانی شیعر و کتێبە ئەدەبیەکان دەخوێنێتەوە، بە هەر سێ زمانەکە شیعری هۆنیوەتەوە، لە تەمەنی پانزدە ساڵیدا شو بە محەمەد تۆفیق بەگی ئیسلامبوولی دەکات، کچ و کوڕی لێدەبێ، بەڵام هاوسەرەکەی ساڵی ١٨٧٦ کۆچی دوایی دەکات، کارەساتی کۆستی کچە گەنج و جوانەکەشی (تەوحیدە) ی دێتە سەر، بە کوڵ بۆی دەگری و ئەشکی گەرمی پڕغەمی بۆ دەرژێنێ، شیوەنی بە پارچە شیعرێکی پڕسۆز و غەمگین بۆ دەکات، سەرەتاکەی بەم شێوە دەست پی دەکات:

- *ان سال من غرب العیون بحور* — *فالدهر باغ و الزمان غدور*
*طافت بشهر الصوم کاسات الردی* — *سحرا و اکواب الدموع تدور*
*فتناولت منها ابنتی فتغیرت* — *وجنات خد شانها التغییر*
*فذوت ازاهیر الحیاه بروضها* — *وانقد منها مانس و نضیر*

خۆی لە خۆیدا بەسەرهاتێکی ناسۆر و کارەساتێکی دڵتەزێنە، هەستی پڕ ئازاری دەروونی بە شێوەیەك دەربڕیوە کە ناهومێدی و لەبەرچاو کەوتنی شادی و رەنگینی ژیان دەبەخشێت، رەشبینی و خۆبەدەستەوەدان بۆ ژیانی ئەو سەری سەرمەدی دەگەیەنێ، ئەو دایکە جەرگ سوتاوە هۆگری خەم و پەژارە دەبێ، تا ئەوەی وەك گوڵێکی لە چڵ پچڕاوی

فرێدراو چاوە جوانەکانی کز و لێل لە ژێر باری غەما دەبێ، بەژن و باڵای شەنگ و شۆخی سیس و لاواز دەبێ. هەڵسا شیعرە تورکیەکانی لە دیوانێکدا کۆ کردۆتەوە لە ژێر ناوی "شکۆفە"دا بە چاپی گەیاند، پێشتر دیوانە عەرەبییەکەی (*حلیة الطراز*) لە ساڵی ١٨٨٦ چاپ کردووە، جگە لەمانەش گەلێ شیعری هەمەجۆری تریشی هەیە سەرجەمی کتێبەکانی کە دایناون:( *نتائج الاطوال ١٨٨٨* ) و ( *مراه التامل فی الامور*). بەراستی پێشەوای راپەرینی ئەدەبیاتی ئافرەتانە لە سەردەمی نوێیدا. ساڵی ١٩٠٢ لە قاهیرە جیهان بەجێ دێڵێ.

## ئەحمەد تەیموور پاشا

لە قاهیرە لە ٧ی تشرینی دووەمی ١٨٧١ هاتۆتە دنیا، ناوی بە ئەحمەد تۆفیق دەبرا، کە ئیسماعیل پاشای باوکی کۆچی دوایی دەکات کۆرپەیەکی سێ مانگان دەبێ، عائیشەی خوشکی بەخێوی دەکات. لە قوتابخانەیەکی فەرەنسی دەخوێنێ پاشان مامۆستای تایبەتی بۆ دێنێتە ماڵەوە، سەرەرای زمانی فەرەنسی فێری زمانی عەرەبی، تورکی و فارسی دەبێ. خوشکە گەورەکەی عائیشەی شاعیر زۆر کاری لەسەر هەست و دەرونی هەبووە. هەر لەوەوە ئەدەبپەروەری و زمانپاراوی و بەردەوامبوون لە توێژینەوە و پێکەوتن، نەفس بەرزی و رەوشت پاکی بۆ بەجێ دەمێنێ، ماڵەکەی ببووە یانەیەکی ئەدەبی پیاوچاك و ئەدیبانی میری و عەرەبی روویان تێدەکرد، بە هەزاران کتێب و دەستنووسی کۆ کردۆتەوە و بە "گەنجینەی تەیمووری " ناونرا، دوای مردنی درایە کتێبخانەی میسری .

هەڵبژێردرا بە ئەندام لە کۆڕی زانیاری عەرەبی لە دیمەشق، لە ١٩٢٢ بووە ئەندامی ئەنجومەنی پیران (مجلس الشیوخ)، لە کۆتایی ساڵی ١٩٣٠ لە بەر نادروستی باری تەندروستی واز دەهێنێ، لە ٢٦ی نیسانی ١٩٣٠ لە مەڵبەندی هاتنە دنیای جیهان بەجێ دێڵێ، لە بەغدا کۆڕی ماتەمینی بۆ دەبەسترێ، ئەحمەد حەسەن زەییات بەشداری تێدا

دەکات، محەمەد بەهجەت ئەسەری هەڵبەستێکی شیوەنی تێدا دەخوێنێتەوە، سەرەتاکەی بەم شێوەیە دەست پێ دەکات:

*دنیا تجیش مآتما و ذهولا      هل انت فیها بالغ مأمولا؟*

لەو شاعیر و ئەدیبە عێراقیانەی شیوەنیان بۆ کردووە؛ جەمیل سدقی زەهاوی، مەعروف رەسافی و دکتۆر مستەفا جواد، هەروەها شاعیرانی میسر و سوریا و لوبنان و فەلەستین. لە کتێبەکانی ئەحمەد تەیموور کە چاپ کراون: *التصویر عند العرب، نظرة تاریخیة فی حدوث المذاهب الاربعة، تصحیح لسان العرب، تصحیح قاموس المحیط ، الیزیدیة و منشا نحلتهم، تاریخ علم العثمانی، ظبط الاعلام، لعب العرب، ابوالعلاء المعری و عقیدتة، الاتعاب و الرتب، الاثار النبویة، اعیان القرن الرابع عشر، الامثال العامیة، الکتابات العامیة، تراجم المهندسین العرب، التذکرة التیموریة" دوو بەش"، اوهام شعراء العرب فی المعانی*. جگە لەمانە کتێبی دەستخەتیشی هەیە لەوانە: *الالفاظ العامیة المصریة، قاموس الکلمات العامیة* کە شەش بەشە،،، هتد.

ئەحمەد تەیموور پەیوەندیەکی بەتینی لەگەڵ (الاب انستاس ماری کرملی) زانای زمانەوانی عێراقی هەبووە، نامەیان لە بارەی ئەدەب و زمانەوانی و مێژوو و دەستنوسەکان ئاڵوگۆڕ کردووە. گورکیس میخائیل عەواد نامەکانی ئەحمەد تەیمووری بۆ (الاب انستاس) کۆ کردووەتەوە و ساڵی ١٩٤٧ بە چاپیان گەیاندووە، بەڵام نامەکانی (الاب انستاس) بۆ ئەحمەد تەیموور، جەلیل ئیبراهیم عەتییە پێدا هاتووەتەوە و بۆ بڵاوکردنەوەی ئامادە کردووە، مەعروف رەسافی پێش مردنی قەسیدەیەکی لە ساڵی ١٩٤٥ لە سەر بنەماڵەی تەیمووری داناوە، سەرەتاکەی بەم شێوەیە:

*لاحمد تیمور ماثر لقم تزل      تشیر بتعظیم الیها الانامل*
*شوامخ کالاطواد عالیة الذری      و لکنها لا تعتیرها الزلازل*
*تزید علی الجدیدین جدة      و تبلی الدواهی دونها و الغوائل*

## محەمەد تەیموور

شاعیر و ئەکتەر و دانەری شانۆگەری محەمەد کوڕی ئەحمەد تەیموور ساڵی ۱۸۹۲ لە قاهیرە هاتۆتە دنیا، بۆ خوێندنی پزشکی روو دەکاتە بەرلین، بەڵام بو پاریس دەگوازرێتەوە، ئەدەبی فەرەنسی لی خۆش هاتووە، دوای سی ساڵ دەگەرێتەوە میسر (۱۹۱٤)، تیپێکی شانۆگەری خێزانی پێك دێنێ، گولی شانۆ گەری داناوە، بە هۆی پێشنیار و وتارە رەخنەگریەکانی کە پشتی بە دیراسەت و لێکۆڵینەوەکانی شانۆگەری فەرەنسی بەستوە، ئاستی شانۆگەری میسری پی بەرز کردۆتەوە. شاعیرێکی ویجدان ناسك بووە، لە هەرەتی نەوجەوانیدا هەست بە نزیك بونەوەی مردنی دەکات و دەڵی :

*هیئوا لی فی باطن الارض قبرا*      *ودعونی انام تحت التراب*

*فی ظلام القبور راحة نفسی*      *ومن النور شقوتی و عذابي*

لە ٢٤ی شوباتی ۱۹۲۱ لە مەڵبەندی لە دایکبوونیدا ماڵئاوایی لە ژیان دەکات. لە پاش مەرگی کتێبەکانی، لە سی بەشدا بلاو کرایەوە، *ومیض الروح*، دیوانی شیعر و نوسینە ئەدەبیەکان و هەندێك چیرۆك و بیرەوەریەکا. *حیاتنا التمثیلیة*: مێژووی شانۆگەری و رەخنە لە ئەکتەرەکان و داستانی ئارەزوومەندان دەگرێتەوە. *المسرح المصری: عبد الستار افندي*، چۆلەکەی ناو قەفەس.

## مەحمود تەیموور

ئەدیبی چیرۆکنووس مەحمود کوڕی ئەحمەد تەیموور لە ١٦ حوزەیرانی ساڵی ١٨٩٤ هاتۆتە جیهان. دەچێتە خوێندنگای باڵای کشتوکاڵ لە جیزە، بەڵام نەخۆشی پەکی بەردەوام بوونی لە خوێندن دەخا، هەوادار و ئارەزوومەندی ئەدەب دەبێ، لە پێشەوای کورتە چیرۆکنووسان بووە، لە سەرەتاوە چیرۆکەکانی بە زمانی رەشۆکی میسری (عامە)

نووسیوە، پاشان زمانی ڕەوانی ڕێزمانی بە باشی فێر دەبێ، دەیکاتە کەرەستەی نووسینەکانی و تێیدا باڵا دەست دەبێ. لە سەردەمی لاوێتیدا شعری پەخشانی هۆنیوەتەوە، چەندین پارچەی ئەدەبی و لێکۆڵینەوەی لە فەرەنسییەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی.

مەحمود تەیموور لە کانونی یەکەمی ١٩٤٩ هەڵبژێردرا بە ئەندامی کۆری زمانەوانی عەرەبی لە میسر، هەروەها ئەندامی پەیامنێر لە کۆڕی زانیاری عێراقدا (١٩٦١)؛ لە ساڵی ١٩٤٧ خەڵاتی کۆڕی زانیاری زمانی عەرەبی و هی مەلیك فوئادی یەکەم (١٩٥٠) و خەڵاتی واسف پاشا (١٩٥١) و خەڵاتی پەسەندکاری دەوڵەت لە ئەدەبی گشتیدا لە ١٩٦٣ پێی بەخشراوە.

هونەرکاری چیرۆکنووسانی فەرەنسی کاریان تێکردبوو، لە سەر ڕێبازی ئەوانیش دەڕۆیی، بەڵام چۆتە ناخی ژیانی واقیعی گەلی میسری و دەربڕینی هەست و ئازارەکانی، و لایەنی خێر و چاکسازی گرتووە، هەوڵی بەرچاوخستنی کەموکوڕیە کۆمەڵایەتیەکانی داوە. دکتۆر شوقی ضیف ی ڕەخنەگر بە دامەزرێنەری کورتەچیرۆکی ئەدەبی نوێی عەرەبی داناوە.

لەم ساڵانەی دواییدا لێکۆڵینەوە و دیراسەتی زمانەوانی نووسیوە، بەڵام ناوی نەمری بە هۆی چیرۆکەکانیەتی کە هەموو لایەنە ئەدەبیەکانی گرتۆتەوە. سەرجەم بەرهەمەکانی لە چل کتێبی ئەدەبی و کۆمەڵە چیرۆك تێپەری کردووە. مەحمود تەیموور لە ٢٥ی نیسانی ١٩٧٣ لە کاتی گەشت و گوزاردا لە لۆزان کۆچی دوایی دەکات.

**شێخ محەمەد عەبدە**

ڕابەر و چاکسازیخواز شێخ محەمەد عەبدە کورد نەژادە، ئەگەرچی خەیرەدین زەرکەلی لە ئیعلامەکەیا بنەچەکەی بە پاڵ تورکمان داوە، بەڵام مێژوونووس محەمەد ئەمین زەکی بەگ لە کتێبەکەیدا (ناودارانی کورد و کوردستان) بە کوردی داناوە کە ئەوەش ڕاستیەکەیەتی.

محەمەد کوڕی عەبدە کوڕی حەسەن خێرۆڵڵایە ساڵی ١٨٤٩ لە گەرەکی (نەسر) ی سەر بە مەڵبەندی شبراخیت لە بەڕێوەبەرایەتی (بحیرە) لە میسر هاتۆتە جیهان، لەوی پێدەگا، لە سەرەتای ژیانی منداڵیدا گوێی نەداوەتە خوێندن، ئارەزووی مەلەوانی و سوارچاکی و تیرهاوێژی دەکات، پاشان داویانەتە دەست (*المؤدب*) قورئانی لەبەر کردووە، دوای ئەوە لە مزگەوتی ئەحمەدی لە (*طنطا*) دەخوێنێ، پاشان لە ١٨٦٦ دەگوازێتەوە بۆ قاهیرە و دەچێتە ئەزهەر. لە ساڵی ١٨٧٧ بڕوانامەی جیهانی وەردەگرێ. کە جەمالەدین ئەفغانی لە ١٨٧١ دێتە میسر، محەمەد عەبدە پەیوەندی پێوە دەکات و هۆگری دەبێ، دانایی و ڕەوانبێژی لێوەردەگرێت، مەستی بیروڕا ئازاد و چاکسازییەکانی دەبێ. پوختەی موحازەرەکانی لە ڕۆژنامەی (میسر) دا بڵاو کردۆتەوە. کە جەمالەدینی ئەفغانی فەرمانی چوونە دەرەوەی لە ١٨٧٩ پی دەدرێت و لە میسر نامێنی گوتویەتی: خێروبێرێکی زۆرم لە زانستی شێخ محەمەد عەبدە لە میسر بەجی هێشتووە.

محەمەد عەبدە دوای دەرچوونی لە ئەزهەر کردیانە مامۆستای ئەدەب و مێژووی ئیسلامی لە (دارالعلوم) و خوێندنگای (الالسن) (١٨٧٨)، لە ساڵی ئایندەدا کە مامۆستاکەیان لە میسر دەرپەڕاند- واتا جەمالەدینی ئەفغانی- فەرمانی پێدرا بچێتەوە شارەکەی خۆی ئەوەش بە هۆی قەلس و پەست بوونیان لە بیروڕای ئازاد و نیازە چاکسازەکەی، بەڵام مستەفا ڕیاز پاشا ساڵی ١٨٨٠ دەرچواندنی (الوقائع المصریە) ی پی دەسپێری زمانەکەی پاراو کرد وای لێکرد ببێتە مینبەرێکی نووسەرانی هۆشیار و بەهرەوەر، لەوانە سەعد زەغلولی نەوجەوان بوو، کە شۆڕشی عورابی ساڵی ١٨٨٢ بەرپا دەبێ تۆمەتی لایەنگریەتی خراوەتە پاڵ، داوای چوونە دەری وڵاتەکەی لێدەکەن، بەرەو بەیروت بەری دەکەوێ. دەبێتە مامۆستا لە کۆلێژی ئیسلامی کە شێخ ئەحمەد عەباس دایمەزراند بوو، زۆری لی نەمایەوە، لەگەڵ ئەفغانی لە پاریس پێك دەگەنەوە، ڕۆژنامەی (*العروة الوثقی*) دادەمەزرێنێ، داواکاری بیروڕای ئازاد و دژ بە ئیستعمار و لایەنگریی چاکسازیەتی بووە،

ئەو ماوەیەشدا سەردانی بەریتانیا و تونس دەکات، دووبارە دەگەڕێتەوە بەیروت بە ئەرکی مامۆستایەتی لە خوێندنگای سوڵتانیە هەڵدەستێ، ئەوساش (*رسالة التوحيد*) ی داناوە ۱۸۸۵)، شەرحی مەقاماتی "بديع الزمانی هەمەدانی "نەهجولبەلاغە"ی کردووە، نامەکانی ئەفغانی لە بەر پەرچدانەوەی "*الدهرين*" وەرگێڕاوەتە سەر عەرەبی. بە درەنگەوە لە تەمەنی گەورەییدا فێری زمانی فەرەنسی دەبێ. بە هۆی ئەوەشەوە رۆشنبیریەتەکەی سەردەم تەواو وەردەگرێ، ئاسۆی هۆشمەندیەتی بەرفراوانتر دەبێ، لە ۱۸۸۸ ریگای پێدرا بگەرێتەوە میسر خدێو محەمەد تۆفیق پاشا بە قازیەتی لە مەحکەمەی ئەهلی دایدەمەزرێنێ. موحازەرەی لە بارەی بەیان و تەفسیر لە ئەزهەر پی دەسپێرن، پاشان لە ۱۸۹۱ بالاّ دەکری و دەبێتە راوێژکار لە مەحکەمەی ئیستیناف، دەیکەنە ئەندام لە ئەنجومەنی بەرێوەبەرایەتی ئەزهەر، لە ۱۸۹۹ دەبێتە موفتی وڵاتی میسر. ئەم پایە وای کرد ببێتە شوێنێکی بەرز و بایەخدار، بووە پشتیوانی پیاوچاك و ئەدیبان لەوانە: عبدولموحسینی کازیمی و محەمەد حافز ئیبراهیم ، لە هەمان کاتیشدا کردیانە ئەندامی هەمیشەیی ئەنجومەنی شورای یاساکان، لە هەر بار و بابەتێکەوە کێشە و گرفتێك هاتبێتە پێش هەر گوێبیستی ئەو دەبوون، بە سەرۆکی ئەنجومەنی خێرخوازی ئیسلامی هەڵبژێردرا، هەوڵێکی دڵسۆزانەی زۆری لە بواری چاکە و خێرخوازیدا نواند، لە ساڵەکانی دواییدا نێوانی خدێو عەباس حیلمی دووەم و سەرداری نیشتمانی مستەفا کامیل پاشا تێکدەچێ، ناچار دەبێ واز لە موفتییەتی بێنێ، نەخۆش دەکەوێت و دەرد و بیماریەکەشی هەر گرانتر دەبێ تا لە ۱۱ی تەمموزی ۱۹۰۵ لە ئەسکەندەریە مەرگ گیانی لێدەستێنێ، بە رێورەسمێکی شکۆدار و پڕرێزەوە لە قاهیرە دەنێژرێ. لە کاتی بیماریدا گوتویەتی:

*ولست أبالي أن يقال محمد* — *أبل أو اكتضت علية الماتم*

*ولكن دينا قد اردت صلاحة* — *احاذر أن تقضي علية العمائم*

عبدالمحسن کازیمی لە ستایش کردنیدا دەڵێ:

*یا عالم الدنیا الوحید الیکها*      *من شاعر الدنیا العلیم الاوحد*

دوای مردنی شیوەنی بۆ دەکات و دەڵێ:

*أقسمت لا أسلو الأمام وذاك جهد المقسم*      *اصبحت بعدك یا محمد بین شدقی أرقم*

محەمەد حافیز ئیبراهیم لە شیوەنیدا دەڵێ:

*سلام علی الاسلام بعد محمد*      *سلام علی ایامة النضرات*

*علی الدین و الدنیا علی العلم والحجی*      *علی البر والتقوی علی الحسنات*

محەمەد عەبدە داواکاری ئەوە بووە کە دەبێ پشت بە قورئان و دەستورەکانی ببەسترێ، دەرگای بۆچوون و لێکدانەوە بکرێتەوە، دەبێ لەنگەر لە نێوان هۆش و وەحیدا رابگیرێ. لە شوێن هەڵگرانی ئیمامی غەزالی بووە، رێبازەکانی ئیبن تەیمییە و ئیبنو قەییم ئەلجوزیەش کاریان تی کردبوو، بەرهەڵستکەری فڕوفێڵ و خەرافات بووە، رایگەیاندووە کە دەبێ رەوشت لە سەرەوەی هەموو دروشمەکانی بیروباوەر بێ، پێویستە دابونەریتی مەحکەمە بکرێ، کوێرانە بە دوای نەکەوین، داوای نوێ کردنەوەی زمانی عەرەبی کردووە، دان بە مافەکانی گەل و میللەت بنرێ، شارستانیەتی بسەلمێندری بە پێی ئەوەی لەگەڵ ئامۆژگاریەکانی ئاین جیا نەبی، دژی ئیستعماری ئەوروپی بووە، بە گژ جەور و ستەمدا چووە کە لە وڵاتی ئیسلامیدا هەبووە، چەندی لە توانای دابووبی بۆ چاکسازی کردنی ئەزهەر کردوویەتی، بۆ چەسپاندنی شیرازەی خێزان و چارە و گەشەپێدانی، داواکاری لێك بوردنو هاوکاری و تێکگەیشتن لە نێوان میللەتان و پتەوکردنی پەیوەندی ئەدەبی و کۆمەڵایەتی بووە، لە شێتگیری و توندڕەویدا گەلی دوور بووە، لەو موسوڵمانانە بووە کە گوتویانە: ئاین دەبێ زۆر بەرفراوان بێ، نیشتمانپەروەریە بێگەرد و بی خۆپەرستییەکەی وای کردبوو دۆست و برادەرە سەرگەرمەکانیشی لە خوتبەکانی بێزار نەبن. عورابی پاشای

ـشنای جارێك گوتویەتی: (ڕاكانی عەبدە بۆ شەبقە لە سەرێك گونجاوترە لەوەی بۆ عەمامە ـە سەرێك) ئەو كتێب و نووسینانەی كەلە دوای بەجێماون: "تفسیر القران الكریم" تەواوی نەكردووە. شیكردنەوەی لە سەر مەقاماتی (*بدیع الزمان*) و لێكدانەوەی (*نهج ـبلاغة*) و (رسالە التوحید ١٨٩٧). بەرپەرچدانەوەی لەسەر - هانوتو- (ئەوە جبرائیل هانوتو ئەدیب و مێژوونووس و وەزیری دەرەوەی فەرەنسیە) وتارەكانی كە لەم بارەیەوە نووسیویەتی لە ساڵی ١٩٠٠ لە "المؤید" بڵاوی كردۆتەوە و بونەتە بنەمای كتێبەكەی "*الاسلام و النصرانیة ام العلم و المدینة*" و (*رسالة الواردات*) لە سەر فەلسەفە و تەسەوفدا، و "*الاسلام و الرد علی منتقدیه و الرد علی الدهرین*" لە بنچینەدا هی ئەفغانیە وەریگێڕاوە...هتد. هەتا دوایی ئەوەی شایانی باسە محەمەد عەبدە لە كاتێكا واز لە موفتیەتی دەهێنی كە (عەبدولرەحمان شربینی) دەكری بە شێخی ئەزهەر، خدێو عەباس حیلمی لە خوتبەكەیدا كە بەو بۆنەیەوە داویەتی هێرشی هێناوەتە سەری. ئیتر دوای ئەوە زۆری پێ ناچی نەخۆش دەكەوی بەرەو لای هاوڕێی بەرز و مەزنی خۆی دەروا.

## قاسم ئەمین

پشتیوان و پێشەوای ڕاپەرینی ئافرەتان قاسم بەگ ئەمین، محەمەد ئەمینی باوكی كوڕی میرێكی كورد بووە، دەیكاتە بارمتە لە ئاستانە، پاشان لە سەردەمی خدێو ئیسماعیل هاتۆتە میسر، تێكەڵ بە سوپای میسری دەبێ تا ئەوەی دەگاتە پایەی (ئەمیر ئەلای)، كچی ئەحمەد بەگ خەتاب دەهێنێ، منداڵی لێ دەبێ گەورەترینیان قاسم بووە ساڵی ١٨٦٣ لە شاری توڕرەی میسری هاتۆتە دنیا، باوكی دەیباتە ئەسكەندەریە، پاشان بۆ قاهیرە و لەوێ دەخوێنێ. دوایی لە فەرەنسە لە زانكۆی مۆنبلێ یاسا تەواو دەكات. ساڵی ١٨٨٥ دەگەڕێتەوە بۆ میسر دەبێتە بریكاری جێگری دادوەری گشتی میسری تێكەڵاو، پێ بەپێ لە پلەوپایەكانی دادوەری باڵا دەبێ تا دەبێتە ڕاوێژكار لە مەحكەمەی ئیستیناف. لە ٢١ی

نیسانی ١٩٠٨ لە قاهیرە جیهان بەجی دێڵێ. هەر لە هەرەتی لاویەتیدا بایەخی بە چاکسازی کۆمەڵایەتی داوە، لە ساڵی ١٨٩٨ کتێبەکەی *"اسباب و نتائج و اخلاق و مواعض"* دەرچواند، بۆ ساڵی ئاییندە کتێبێکیتری بە پاڵدا (*تحریر المراة*) ئەمەش هاتووهەرای لی پەیدا بووە. محەمەد تەڵعەت عەرەب بەرپەرچی داوەتە بە کتێبی (*فصل الخطاب فی المراه و الحجاب*)، محەمەد فەرید وەجدی بە (*المراه المسلمة*)، دوای ئەمانە قاسم ئەمین کتێبێکیتری ساڵی ١٩٠١ دانا، ئەمەشیان لە وەڵامدانەوەی رەخنەگرەکانیەتی. بەڵام بی لێهەڵبڕین و توندڕەوەکەی کە لە کتێبەکەی پێشودا دەری خستبو ئەم جارەیان کەمی کردبۆوە. لەو شاعیرانەی شیوەنیان بۆ کردووە: محەمەد حافز ئیبراهیم ، خەلیل مەتران، عەلی جارم، عەبدولڕەحمان شوکری. بانگەوازەکەی قاسم ئەمین لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا بۆ رۆشنبیرکردنی ئافرەت و سەرفراز و دەرباز بوونی لە گۆشەگیریدا کە بە سەری سەپابوو هێشتا کاتی نەهاتبوو، دەتوانین بڵێین بەروبومەکەی دوای جەنگی یەکەمی مەزن لێی پەیدا بوو، ئا لەو کاتەی کە ئافرەتانی میسڕی ساڵی ١٩١٩ بە خۆپێشاندانێك دژ بە داگیرکردنی سوپای بەریتانی هەڵسان، حافز ئیبراهیم لە هەڵبەستە بەناوبانگەکەیدا:

*خرج الغوانی یحتججن*      *ورحت أرقب جمعهن*

لە قەسیدەکەی تریدا دەڵێ:

*الیکن یهدي النیل الف تحیة* ---؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟؟

هودا شەعراوی (١٨٧٩-١٩٤٧) رادەپەری و سەرۆکایەتی بزوتنەوەی ئافرەتان دەکا، بە سفوری بی پەچە و عەبا پێش خۆپێشاندەران دەکەوێ، هەر وەك خاوەنی (ئەعلام) دەڵێ: هودا شەعراوی یەکەمین ئافرەتی موسڵمانی میسڕی بوو کە پەچەی فڕێدا.

بانگەوازەکەی قاسم ئەمین درەنگ لە عێراق دەنگی دایەوە، جەمیل سدقی زەهاوی ساڵی ١٩١٠ و تارێکی لە رۆژنامەی (المؤید) ی قاهیرەدا بلاو کردەوە بەرگری لە ئافرەتان

کردبوو، هێشتا ڕۆژنامەکە نەگەیشبووە عێراق کۆکە و قیامەت لە شێخە شێتگیرەکان هەڵسا، خۆپێشاندانی خەڵکی تورەی دژ بە شاعیر هاتە ئاراوە، خواستی کوشتن و خوێنرژانیانی دەکرد، لە مامۆستایەتی خوێندنگای حقوقیان خست، ناچار لە ترسی گیانی نەیدەوێرا بێتە دەر خۆی لە ماڵەوە گۆشەگیر کرد، روو لە ژنەکەی دەکا و دەڵێ:

*ابثين ان اودى جميلك خابطا بدم له اهريق فوق رغام*

*فتذرعي للخطب صبرا و امسحي من ادمع فوق الخدود سجام*

لەو مەینەتی و لێقەومانەیدا شاعیری ئازادیخوازی میسری (وەلیەددین) بە هانای دێت و سەرفرازی دەکات. بزوتنەوەی رزگاری ئازادی ئافرەتان و لادانی پەچە و سەرپۆش لە دەوروبەری ساڵی ١٩٢٤-١٩٢٥ لە عێراقدا سەریهەڵدا و کەوتە جموجۆڵ و کۆمەڵێکی ئافرەتان دامەزرا، مشتومڕ و ململانی بە شیعرو پەخشان لە نێوان لایەنگرانی پەچە و سەرپۆش و ناحەزانی بەردەوام بوو. قاسم ئەمین دەڵێ: هەر چەندە بیر لە بەختەوەری دەکەمەوە ئافرەتێکم دێتە بەرچاو کە جوانی و شۆخی ژن و ئەقڵ و هۆشی پیاوی هەیە. قاسم ئەمین حەزی بە هونەر دەکرد، بڕوای وابوو ژیان خۆی لە خۆیدا خۆشەویستی و میهرەبانی و لێبوردەیی و ئاشتیە و نیشتمانپەروەری راستەقینە دەبێ کەمدووبی خۆهەڵکێش نەبێ.

ئەحمەد شەوقی شیوەنی قاسم ئەمین دەکا: سەرەتاکەی بەم شێوەیە دەست پێدەکا دەڵێ:

*ان المصيبة فى الامين عظيمة محمولة لمشيئة الاقدار*

محەمەد حافز ئیبراهیم دەڵێ:

*لله درك كنت من رجل لو أمهلتك غوائل الأجل*[17]

[17] - شیعرەکەی ئەحمەد شەوقی و محەمەد حافیز ئیبراهیم، زیاترە لەوەی بەرچاو خران، بە پێویست نەزاندرا هەمووی بنوسین. "وەرگێڕ"

دکتۆر *شوقي ضيف* دەڵێ: قاسم ئالآی چاکسازی کۆمەڵایەتی هەڵگرتبوو، رای وابوو گرینگترین هۆی دواکەوتنی میسر لە چاو رۆژئاوادا سەرپۆشیی و نەخوێندەواری ئافرەتە، دەستەوەستان کردنی بەشێکی زیندوی کۆمەڵ، پێشێل کردنی مافەکانیەتی لە شوکردن بەڵکو لە ژیاندا، وتارەکانی لەو بارەیەوە لە رۆژنامەی (المؤيد) ساڵی ١٩٠٠ بلاو کردۆتەوە، پاشان لە کتێبەکەیدا (*تحرير المراة*) کۆی کردۆتەوە[18].

## عوسمان ئەبوبەکر دقنە

"اميرا الامراء" بووە لە سوپای محەمەد ئەحمەدی مەهدی، رابەرە دینیەکەی سوودان کەوا لە ساڵی (١٨٨٢-١٨٨٥) لەگەڵ لەشکری میسرى و بەریتانی بەشەر هاتووە بەسەریاندا زاڵ دەبێ و دەست بەسەر شاری (خەرتووم) دا دەگرێ. پاش ماوەیەکی کەم مەرگ لە ١٨٨٥ یەخەگیری دەبێ. عوسمان ساڵی ١٨٣٧ هاتۆتە دنیا، وای رادەگەیاند گوایە لە رەچەڵەکی خەلیفەکانی بەنیعەباسە، بەڵام دەڵێن باپیرانی لە بابرا کوردی دیاربەکرن، بەشداری لەو هەڵمەتەی سوپاییە دەکەن کە سوڵتان سەلیمی یەکەمی عوسمانی ساڵی ١٥١٨ بۆ سەر سەواکنی ناردووە، لەوی لەگەڵ عەشیرەتی بێجای خۆماڵی نیشتەجی دەبن، عوسمان سەرەتای ژیانی بە بازرگانی دەریایی لەگەڵ کەنارەکانی عەرەبی دەست پێدەکات. ئینگلیزەکان ١٨٧٧ سەبارەت بە هێنانی کۆیلە بۆ سودان دەیگرن و دەیدەنە دەست کاربەدەستانی میسری و بەندی دەکەن و دەگەرێتەوە(سواکن).

لە سەردەمی شۆرشی عورابی لە میسر هەوڵیدا خەڵکی جۆشخواردوو هانبدا، بەڵام لەوەدا سەرناکەوێ، ناچاری دەکەن شارەکە بەجێبێڵێ، رووژ دەکاتە بەربەرە. پاشان لە ساڵی ١٨٨٣ دەچێتە پاڵ مەهدی، بەرەو (*ابيض*) بەرێ دەکەوێت، دەیکەنە ئەمیر. دەگەرێتەوە

---

18- محەمەد حوسێن هەیکەل پاشا ، لەسەر قاسم ئەمینی نوسیووە، زۆر لایەنی کەسایەتی و رەوشتی بەرز و هەڵوێستی نیشتمانی و دڵسۆزی و چاکسازی کۆمەڵایەتی دەرخستووە.

ناوچەی گرد و تەپۆلکەکانی دەریای سور، خەڵك و حەشاماتی عەشیرەتی بێجا کۆ دەکاتەوە و بەگژ میسری و بەریتانیەکاندادادەچێ. لە چەندین شەری جیاجیادا بەسەریاندا زاڵ دەبێ هێزەکانیان تەفر و تونا دەکا، دوایی سەرگەرمی و ورەی جەنگاوەرەکانی عەشیرەتەکەی دادەبەزێ، داوای لێدەکری بگەرێتەوە (ام درمان). لە ١٩٠٠ پاش ئەوەی سودان داگیر دەکرێتەوە بزوتنەوەکەی مەهدی لەناو دەبرێ. دەیگرن دەیخەنە بەندیخانەی "رەشید توررە". دوایی لە ١٩٠٨ لە دۆڵی حەلفا بەند دەکرێ، لە تەمەنی پیریەتیدا روو دەکاتە تەسەوف، لە ١٩٢٤ دەچێتە حەج، پاشان دەگەرێتەوە دۆڵی حەلفا، لەوی لە ساڵی ١٩٢٦ کۆچی دوایی دەکات. ناوبانگی زۆری بە هۆی ئازایەتی و نەبەردی لە شەرەکاندا پەیدا کرد.

## شێخ محەمەدی کورد

زانای شافیعی لە وڵاتی حیجازدا شێخ محەمەد کوڕی سلێمان کورد ساڵی ١٧١٥ لە دیمەشق هاتۆتە دنیا، لە مەدینە پێگەیشتووە، لەوی دەبێتە موفتی شافیعی هەتا لە ساڵی ١٧٨٠ کۆچی دوایی دەکات، زۆر کتێبی داناوە لەوانە: *الفتاوی*، *الحواشی المدینة علی، شرح ابن حجر للمقدمة الحضرمیة* (لە دەە بەش پێنك هاتووە)، *شرح فرائص التحفة*، *عقود الدرر*، *فتح الفتاح (فی الحج)*، *زهر الربی فی بیان احکام الربا*، *الفوائد المدینة فیمن یفتی بقولة من ائمة الشافعیة*، *الثغر البسام*...هتد.

## عەلی زوهری شێروانی

عەلی کوڕی محەمەد کوڕی عەلی زوهری شێروانی لە ساڵی ١٧٢٢ لە مەدینە هاتۆتە جیهان. هەر لەوێش ساڵی ١٧٨٥ کۆچی دوایی دەکات، لەوی سەرۆکی زانایانی حەنەفی دەبێ. پەراوێزی لەسەر "فقه" داناوە و بەرهەمی هەڵبەستی هەبووە.

## محەمەد ماجدی کورد

محەمەد ماجد کوڕی محەمەد سالح کوڕی شێخ فەیزوڵلایە، باپیری لە وڵاتی کوردەوارییەوە روو دەکاتە (مەکە) لەوی لە ١٨٧٥ هاتۆتە دنیا. هەر لە سەرەتای پێگەیشتنیەوە شەیدا و هۆگری کتێب دەبێ، چاپخانەیەك دادەمەزرێنێ، زۆر کتێبی بلاوکردۆتەوە، بازرگانیەتی کتێبی کردۆتە پیشەی خۆی، لە سەردەمی شەریف حوسێندا توشی ئەشکەنجە دەبێ، کاتی وڵاتەکە دەکەوێتە ژێر دەسەلاتداریێتی مەلیك عەبدولعەزیز ئال سعود، لە گۆشەگیری دەردەچێ. دەیکەنە ئەندامی ئەنجومەنی شورا، پاشان بریکاری بەرێوەبەری (مەعاریف)، دوایی بەرێوەبەری ئەوقاف، ساڵی ١٩٣١ لە مەڵبەندی لەدایکبوونیدا جیهان بەجی دێڵێ. گەلی دەستخەتی لە پاش بەجی ماوە لەوانە: معجم کنز العمال، معجم التخامس، المنتخبات الماجدیه، و پێڕستدانان بۆ کتێبخانە تایبەتەکەی کە زۆر بایەخی بە کۆکردنەوەی دابوو.

## هۆلۆ پاشا و بنەماڵەکەی

محێدین ئەبول هۆل بە ناوی هۆلۆ پاشا ناسراوە، کوڕی عەبدولقادر عابدی کوردە، لە پیاوە ماقوڵەکانی دەوڵەتی عوسمانی بووە، پەیوەندی بە سوڵتانەکانەوە دەبێ، پلە و پایەکانیان وەردەگرێ. ساڵی ١٨٧٧ دەبێتە ئەمیری حەج لە ١٨٩٥ جیهان بەجێ دێڵێ.

کوڕەکەی ئەحمەد عیزەت پاشا راوێژکاری سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم ناوبانگی دەرکرد. لە ساڵی ١٨٥٥ هاتۆتە دنیا، لە بەیروت دەخوێنێ، لە دادگەری سوریا بە پشکنێنەر دادەمەزرێ، بە لایەنگرانی ئازادیخواز و چاکسازان ناسراوە، رۆژنامەیەکی حەفتانەی بە زمانی عەرەبی و تورکی بە ناوی (دیمەشق) دەرچواندووە (١٨٧٨)، پاشان بە سەفەر دەچێتە ئاستانە لە رێگای "ابو الهدی الصیادي الرفاعی" پەیوەندی بە سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمەوە دەکات، دەبێتە نووسەری دووەمی سوڵتان(١٨٩٥). لە پیاوە سیاسەتمەدارە هۆشمەندەکان بووە، هەوڵی داوە پەیوەندی تورکیا بە دەوڵەتە ئەورووپیەکانەوە ببەستی و هێڵی ئاسنینی شەمەندەفەری حیجاز دابمەزرێنێ، دوای کودەتاکەی ساڵی ١٩٠٨ تورکیا بەجێ دێڵی روو دەکاتە لەندەن، لە هاتوچوونی نێوان ئینگەلتەرە و سویسرا و فەرەنسەدا دەبێ، لە ئاکاما لە میسر نیشتەجێ بووە.

لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٢٣ جیهان بەجێ دێڵێ. لە تورکیەوە کتێبی (حقوق الدول) و (تاریخ جودت) وەردەگێڕێ.

پاشی ئەو محەمەد عەلی بەگ عابدی کوڕی ئەحمەد عیزەت پاشا سەرەك کۆماری سوریا ناوبانگی دەرکرد. ساڵی ١٨٧٢ لە دیمەشق هاتۆتە دنیا، لە خوێندنگای (غەڵەتە سەرای) لە پایەختی تورکیا خوێندویەتی، پاشان روو لە پاریس دەکا و حقوق دەخوێنێ، دەگەڕێتەوە ئەستەنبول، لە فەرمانگەی راوێژکاری حقوقی وەزارەتی دەرەوە دادەمەزرێ. پێبەپێ لە پایەکانی وەزارەتدا تێهەڵدەچێ، تا ئەوەی لە ساڵی ١٩٠٥ دەیکەنە وەزیری مفەوەزی تورکی لە واشنتۆن، لەو پایەیدا دەمێنێتەوە هەتا دەرچوونی دەستور(تەمموزی ١٩٠٨) ژیانی

لە نێوان سویسرە، فەرەنسە، ئینگەلتەرە و میسر بەرسەر دەبا، کە شەرە مەزنەکە کۆتایی پێدی لە هەرێمی میسر نیشتەجی دەبێ، لە هاوینی ١٩٢٠ دەگەرێتەوە دیمەشق، بە نوێنەر هەڵدەژێردری (١٩٢٢)، لە ئەنجومەنی یەکێتی سوری دەبێتە وەزیری دارایی کەوا دەوڵەتی فەرەنسی دایمەزراندبوو (١٩٢٢-١٩٢٣)، لە کۆتایی نیسانی ١٩٢٣ دەبێتە سەرەك کۆماری سوریا، لە ٢٢ی تشرینی ١٩٣٩ لە پاریس کۆچی دوایی دەکات، تەرمەکەی دەهێننەوە بۆ دیمەشق و لەوێ دەنێژرێ.

## ئیبراهیم بەگ هنانۆ

سەرداری نیشتمانپەروەری سوری ئیبراهیم کوڕی سلێمان ئاغای هنانۆ لەساڵی ١٨٦٩ لە کفر حارم ڕۆژئاوای حەلەب هاتۆتە دنیا، لە خێزانێکی دێرینی حەلەبی کورد نەژادە. لە خوێندنگای (الملکی الشاهانی) ئەستەنبول دەخوێنێ، لە سەردەمی عوسمانیەکانا پایەی جیاجیای بەرێوەبەرایەتی بینیوە، لە چەندین قەزا قایمقام دەبێ، ساڵی ١٩٠٨ دەگەرێتەوە شارەکەی خۆی، هەڵدەبژێردری بە ئەندام لە ئەنجومەنی گشتی حەلەبدا، پاشان سەرقاڵی جێبەجی کردنی پرۆژە کشتوکاڵیەکانی دەبێت. کە سوپای عەرەبی ساڵی ١٩١٨ دێتە ناو شاری حەلەب، دەگەرێتەوە و هەڵدەبژێردری بە ئەندام لە کۆنگرەی سوری لە دیمەشق، کە فەرەنسا سوریا داگیر دەکا و ئینتیدابی بەرسەردا دەسەپێنن، نە باکوری حەلەب بە گژیاندا دەچی و توشی دەردەسەریان دەکا، پاشان روو دەکاتە عمان، سەردانی فەلەستین دەکا، کاربەدەستانی بەریتانی لە قودس دەیگرن دەیدەنە دەست فەرەنسییەکان لە حەلەب، حوکمی دەدەن، بە پێی ئەوەی بزوتنەوەکەی سیاسی بووە، بەری دەدەن، تەکان دەدا بۆ مەیدانی سیاسی، دەکەوێتە بەرهەڵستی دەوڵەتی داگیرکەر، تا لە تشرینی دووەم ١٩٣٥ لە حەلەب جیهان بەجی دێڵێ.

مێژوونووسی لوبنانی یوسف ئیبراهیم یزبك دەڵێ: لینین سەرداری سۆڤیەتی چوار نامەی بە دەستخەتی خۆی بۆ هنانۆ نووسیوە داوای لێکردووە هاریکاری لەگەڵ بزوتنەوەکانی

رزگاریخوازی نیشتمانی لە ناوچەکەدا بکا، لە خەبات و ململانێی عەرەب دژ بە ئیستعمار، پشت بە یارمەتیدانی سۆڤیەتی ببەستێ.

لە کاتی مردنیا شاعیران شیوەنیان بۆ کردووە. شاعیری شام شەفیق جەبری لە سەرەتای پارچە شیعرەکەیا دەڵێ:

• *لمن النعش مائجا بمصابة زاجفا بالحمی و زهو شبابة*

محەمەد سلێمان ئەحمەد بە دەوی دەڵێ:

*أنزه ألامی عن الدمع و الاسی فتؤنسها منی الطلاقة والبشر*

شاعیری عێراقی ئەنوەر شائول گوتویەتی:

*صرخة کالرعد فی قصفتة لیملأ الافاق رعدا ودویا*

عومەر ئەبوریشە شیوەنی بۆ دەکا دەڵێ:

*هنانو أی صاعقة اقضت علی صرح من العلیا مشیر؟*

شێخ فوئاد خەتیب گوتویەتی:

*سل الفلك الدوار ما للکوکب شواحب فی الابراج غیر ثواقب؟*[١٩]

## محەمەد کورد عەلی

لە ناودارانی نوی خوازی ئەدەبی عەرەبی محەمەد فەرید کوڕی عەبدول ڕەزاق کوڕی محەمەد کوڕی عەلی، لە ئازاری ١٨٧٦ لە دیمەشق لە دایك بووە، بنەچەکەی دەچێتەوە سەر خێزانێکی سلێمانێ، پێش سەدەو نیوێك روو دەکەنە شام. دایکی چەرکەس و باوکی بازرگان و کشتیاربووە، لە ساواییەوە باوکی بایەخی بەفێربوون و خوێندنی داوە، زمانی عەرەبی، تورکی، فەرنسی، فارسی دەخوێنێ. سالەهای سالێ لە خوێندنگای ناوەندی (رشدیە) و قوتابخانەی (*الاباء اللعازرین*) بەسەر بردووە،پاشان دەچێتە لای شێخ تاهیری

19– ئێمە تەنیا سەرەتای شیعرەکانمان خستە بەرچاو. "وەرگێر"

جەزائیری سوودی زۆری پێدەگەیەنێ. باشترین کتێب دەخوێنێتەوە، بژاردەی شیعرومەقاماتی ئەدەبی لەبەر دەکات، تا لە نوسینوبەیان بەهرەوەر دەبێ، لە تەمەنی بیست ساڵی دا رۆژنامەیەکی رەسمی لە دیمەشق بەناوی (شام) دەردەچوێنێ، سی ساڵ لێی کارمەند دەبێ، ئاڵوگۆڕی نامە لەگەڵ گۆڤاری (المقتطف) ی ناودار دەکا، ساڵی ١٩٠١ بە سەردان دەچێتە میسر، لە ماوەی ١٠ مانگ رۆژنامەی (الرائد المصری) دەرچواند، دەگەرێتەوە دیمەشق بەڵام کاربەدەستانی تورکی بە تۆمەتی بیروڕای ئازاد و سەربەستی تەنگی پێهەڵدەچنن. دیسان دووبارە روو دەکاتە میسر، پەیوەندی بە شێخ محەمەد عەبدە و پیاوچاکانی تری وان دەکا. لە کانونی دووەمی ١٩٠٦ گۆڤاری (المقتبس) دادەمەزرێنێ، لە هەمان کاتیشدا رۆژنامەی (الظاهر) و (المؤید) دەگرێتە دەست. کە دەستوری تورکی لە ١٩٠٨ راگەیەندرا رۆژنامەگەری ئازاد و بیروڕا بەرەڵلا دەبێ، محەمەد عەلی کورد دەگەرێتەوە دیمەشق، لە دەرچواندنی گۆڤاری (المقتبس) دا بەردەوام دەبێ.

لە نۆزدەی کانونی یەکەمدا رۆژنامەیەکیتریشی بە هەمان ناو خستە پاڵی، دەبێتە مەیدانێك بۆ خامەی گەورەترین نووسەران و ئامرازێکی دژ بە سیاسەتەکەی تەتریکی عوسمانی. بۆیە کاربەدەستانی تورکی تەنگەتاوی دەکەن، بەرەو میسر دەرواتەوە، سەردانی ئەورووپا دەکا، پاشان دەگەرێتەوە رۆژنامە رۆژانەیەکەی بۆ ئەحمەد کورد عەلی برای بەجی دێڵی و خۆی بۆ گۆڤارەکە تەرخان دەکات. شەری گشتی بەرپا دەبێ (١٩١٤) خەریك بوو خۆی و ئازادیخوازانیتری هاورێی بدرێنە دیوانی جەنگی عورفی، بەڵام جەمال پاشای والی قەناعەتی هێنا کە لە بنەرەتا ناحەز بە فەرمانداریێتی تورکی نەبووە، داوای لی دەکا رۆژنامەکەی دەربچوێنێتەوە، دەرهێنانی رۆژنامەی (الشرق) ی پی دەسپێری کەوا لە ساڵی ١٩١ دەری دەچواند، خامەی ناودارترین ئەدیب و نووسەرانی بۆ دەخاتە کار، وەك عەبدولقادر مەغریبی، شەکیب ئەرسەلان، تاجەدین حوسنی و محەمەد حەبیب عوبێدی موسڵاوی، بە مەبەستی بانگەواز بۆ تورکیا و سوپاکەی. خەیرەدین زرکلی دەڵێ: لە ماوەی

شەرەکەدا بە نابەدڵی زمان و خامەکەی بۆ بانگەوازەکەی بەکار هێناوە، دوای بەسەرچوونی شەرەکەش ترسی جەمالی هەر هەبوو. لە ئاکامی دەرچوونی تورکەکان لە شامدا کورد محەمەد عەلی بۆ ئاستانە دەروا، پاشان زۆری پێ ناچی لە سی تەمموزی ١٩١٩ بە دامەزراندنی کۆڕی زانیاری عەرەبی هەڵدەستێ، هەتا پایانی ژیانی بە سەرۆکایەتییەکەی دەمێنێتەوە[20].

[20]– ناوی بە کۆڕی زانیاری و گۆڤار و کتێبخانەکەیەوە بەند بوو، بە پەرۆشەوە سەرپەرشتی ئەو دەزگایانەی کردووە تا بتوانن پەیامی رۆشنبیری خۆیان بە تەواوی بەجێ بێنن.. لە وەزارەتی جەمیل ئەلشی دەبێتە وەزیری مەعاریف (ئەیلول١٩٢٠) ، دووبارە ئەم وەزارەتە لە ژێر سایەی ئینتیدابی فەرەنسی وەردەگرێتەوە (شوبات ١٩٢٠).. جارەها گەشتوگوزاری بۆ وڵاتانی ئەورووپا کردووە، لە کۆڕی زمانەوانی عەرەبی دەبێتە ئەندام لە کاتی دامەزراندنیدا (١٩٢٤). خووی داوەتە لێکۆڵینەوە و نووسین، بەدەیان کتێبی داناوە جگە لە سەدان لێکدانەوە و لێتۆژینەوە لەوانە: *خطط الشام (٦ مجلدات) ، الرحلة الانورية الى الاصقاع الحجازية و الشامية (١٩١٦) ، غرائب الغرب (جزئان١٩١٠) ، غابر الاندلس و حاضرها (١٩٢٣) ، الحكومة المصرية فى الشام (١٩٢٥) ، دمشق مدينة السحر و الشعر (١٩٤٤) ، القديم و الحديث (١٩٢٥) ، تاريخ الحضارة* لە فەرەنسییەوە وەرگێردراوە، دانەرەکەی شارل سنیۆبۆس، *الادارة الاسلامية فى عزالعرب (١٩٣٤) ، الاسلام و الحضارة العربية (مجلدان١٩٣٤) ، امراء البيان (مجلدان١٩٣٧) ، اقوالنا وافعالنا (١٩٤٦)* دانانی چەندین کتێب و لێکۆڵینەوە و بەرهەمی تر... لە دووی نیسانی ١٩٥٣ لە دیمەشقماڵئاوایی لە ژیان کردووە.

## بنەماڵەی حەیدەری

بنەماڵەی حەیدەری ناوبانگیان بەوە دەرکردووە کە زانای ئایینیان زۆر لی هەڵکەوتووە، لەوانە: سوبغەتوڵڵا حەیدەری دووەم، موفتی شافیعی لە بەغداو دانەری "المسائل الایقانیە فی الاجوبە علی الاسئلە الایرانیە" لە ساڵی ١٨٦٣ کۆچی دوایی کردووە. ئیبراهیم فەسیحی کوڕی زانای مێژوونووس کۆچ کردووی ساڵی ١٨٨٢، لەوان: محەمەد ئەمین کوڕی عەبدوڵڵا حەیدەری لە ١٨٦٣ مردووە، هەروەها لەو زانا کوردانەی کە ناودار بوون شێخ محەمەد مارانی[21] مامۆستای عەبدولوەهاب نائیب و گەورە زانایانیتر، شیخ محەمەد ساڵح سەهرەوەردی لە کتێبەکەیدا (لب الالباب) دەڵێ: لە عیلم الکلام، باڵا دەست و لە هونەری (معقول) بەهرەدار بوو، لە دەمەتەقە و وتوویژدا بە تایبەتی لەگەڵ مادیە کەم بڕواکاندا بەتوانا بوو، کۆڕ و مەجیسی دەرس وتنەوەی لە قوتابخانەی سلێمانی و بەغدا هەردەم پڕموریە و سوختە و قوتابی بوو، ساڵی ١٨٩١ لە تەمەنی نزیکەی حەفتا ساڵیدا جیهان بەجی دێڵێ. لەوانی تریان: شێخ ئەبوو هودا عیسا سەفائەدین بەندەنیجی کوڕی مووسا جەلالەددین قادری نەقشبەندییە، بە ناوی شارەکەی خۆی ناو دەبرێ، (بەندیجین) ی پاشان شارەکە بە (مەندەلی) ناسرا کە دەکەوێتە رۆژهەڵاتی بەغدا نزیك سنوری ئێران، لە دەوروبەری ساڵی ١٧٨٩ هاتۆتە دنیا، لەسەر دەستی جاکترین زانایانی سەردەمی خۆیا دەخوێنێ، دەستێکی باڵای لە عەرەبی و ئەدەبیاتی هەر دوو زمانەکە تورکی و فارسیدا هەبووە، دەرسی لە قوتابخانەی داود پاشا لە بەغدا گوتووەتەوە، کتێبێکی لە سەر بەغدا و دەوروبەرەکەی داناوە، هەڵبەستی ناسکی هۆنیوەتەوە، مردنەکەی لە بەغدا رێکەوتی ساڵی ١٨٦٧ دەبێ، کتێبی (اولیاء بغداد) لە تورکییەوە وەرگێڕاوە کە دانەرەکەی مورتەزا ئال

---

[21]– دەبی مەبەستی (ماوەران) بێ، گوندێکە دەکەوێتە نزیك شەقلاوە، پێشکەو مەڵبەندی بنەماڵەی حەیدەرییە. (وەرگێر)

نەزمییە، دەستخەتەکەی لە لای مێژوونووس عەباس عەزاوی دۆزراوەتەوە، هەروەها لە زانایانیتریان مەحمود رۆژبەیانی کۆچ کردووی ساڵی ١٨٥٣ و عەبدولڕەحمانی کوڕی کەوا لە هەمان ساڵدا دوای مردنی باوکی بە چەند مانگێك ئەویش جیهان بەجی دێڵێ، یەکیتر لەوان حاجی رەسوڵی کورد کۆچ کردووی ساڵی ١٨٦٠.

## ئیبراهیم فەسیح حەیدەری

ئیبراهیم فەسیح کوڕی سوبغەتوڵلا کوڕی محەمەد ئەسعەد سەدرەددین موفتی حەنەفی کوڕی عوبەیدوڵلا حەیدەری شافیعییە، ساڵی ١٨٢٠ لە بەغدا هاتۆتە دنیا، لەوی لای زاناکان دەخوێنێ، زانا و ئەدیب و مێژوونووس بوو، لە بەغدا (*نیابة القضاء*) وەردەگرێ. گەلی کتێبی داناوە لەوانە: *المجد التالد فی مناقب الشیخ خالد* (لە ئاستانە چاپکراوە١٨٧٥). (*تطبیق الهیئة الجدیدة، الاثار علی بعض الأیات الشریفة، و بعض الاخبار استانة١٨٧٥) احوال البصرة* (بغداد ١٩٦١)، *عنوان المجد فی بیان احوال بغداد و البصرة و النجد*(١٩٦٢)، *فصیح البیان فی تفسیر القران*. هەروەها دیوانی ئەبوو تەمام و مەقاماتی حەریری شیکردۆتەوە، لەگەڵ دانانی پەراوێز لەسەر (نحو و صرف). لە ٢٦ی کانونی یەکەمی ١٨٨٢ لە بەغدا جیهان بەجی دێڵێ.

ئیبراهیم فەسیح لە کتێبەکەیدا(المجد) لەسەر عەشیرەتەکانی کوردی عێراق دواوە لەوانە: باسی عەشیرەتی سورچی و خۆشناو دەکا و دەڵێ: ئەوانە ژمارەیان زۆرن و ئازان، ناکۆکی و شەر لە نێوانیاندا بەردەوامە، زانای بلیمەتیان تیا هەڵکەوتووە لەوانە: زانای پایەبەرز محەمەد خەتێی باڵەکییە، لە زێبارییەکانیش (وەلی ئەحمەد گەلالی) لە مزورییەکان: (گەورە شێخانی عێراق شێخ یەحیای مزوری ئامێدییە).

عەشیرەتی بڵباس بێشومارن، ئازا و نەبەرد و خۆڕاگرن، زانای بلیمەتی پایەبەرز (مەولانا زیائەدین خالید عوسمان نەقشبەند) یان لی پەیدا بووە. باسی عەشیرەتەکانی تریش دەکات لەوانە: شوان، زەند، زکمە.

## محەمەد ئەمین زەند

محەمەد ئەمین زەند ناسراو بە (کەھیە) کوڕی ئەحمەد زەندی زانای مودەریسە، لە لای زانایانی سەردەمەکەی دەخوێنێ، خەریکی دەرس وتنەوە دەبێ، دوایی لە جێگای ئەبیسەنا و مەحمود شەھابەددین ئالووسی دەیکەنە موفتی بەغدا (١٨٥١)، تاکو ساڵی ١٨٥٤ لە پایەکەی بەردەوام دەبێ. دوای ئەوە دەیکەنە (کەھیە) واتا یاریدەدەری والی بەغدا، پاشان روو دەکاتە ئاستانە، دەبێتە ئەندام لە ئەنجومەنی شورای دەوڵەت. لە پێنجی حوزەیرانی ١٨٦٨ لە پایتەختی تورکی ماڵئاوایی لە ژیان دەکا، یادداشتەکانی خۆی لە سەر رووداوەکانی بەغدا نووسیوە. مێژوونووسی تورکی ئەحمەد لوتفی کۆچکردووی ١٩٠٧ پشتی بە نووسینەکانی ئەو بەستووە لە بارەی بەسەرھاتەکانی ساڵی ١٨٢٥ ھەتا دوای سەردەمی مەمالیك، عەباس عەزاوی دەنگوباسی ئەوی لە مێژووەکەیدا (تاریخ العراق بین احتلالین) راگەیاندووە. کامیل بەگی کوڕی خانوەکەی دەکاتە (وەقف) کە بە (جامع کەھیە) دەناسرێ، کتێبخانە بەھادارەکەشی دەبێتە بەشێك لە پەرتوکخانەی ئەوقاف.

## موفتی زەھاوی

شاعیری عێراقی عەبدولباقی عومەری دەڵێ:

*قد قیل لی اذ رحت انشد عندما --- شاھدت دین محمد یتجدد*

*فی مذھب النعمان بالزوراء قد --- افتی الامام الشافعی محمد*

محەمەد ئەمین فەیزی کوڕی ئەحمەد بەگ کوڕی حەسەن بەگ کوڕی رۆستەم بەگ کوڕی کەیخەسرەو بەگ کوڕی میر بابا سلێمانی باپیرە گەورەی بنەماڵەی بابانە، لە ساڵی ١٧٩٧ لە گوندی زەھاو (یان زەھاب) ھاتۆتە دنیا، ھەر بەم شوێنەوەش دەناسرێ. لەسەر دەستی شێخ مەعروفی نۆدی لە سلێمانی دەخوێنێ، پاشان ھەر بۆ مەبەستی خوێندنی زانست روو دەکاتە سنە (سنندج) لای عەلی شێخ محەمەد قەسیم. دوایی لە لای محەمەد کوڕی رەسوڵ لە ساوجبلاق (سابلاغ) دەخوێنێ. کاتی ئیجازەی لی وەردەگری تەمەنی بیست ساڵان، دەبێ

دەگەڕێتەوە سلێمانی دەبێتە مەلای مزگەوتی عەبدولڕەحمان پاشا، خۆی بۆ دەرس وتنەوە و سود بە خەڵك گەیاندن تەرخان دەکات. پاشان بەرەو کەرکوك دەروات ماوەیەکیش لەوی دەرس دەڵێتەوە. دوایی لە ١٨٥٠ روو دەکاتە بەغدا پێش چوونەکەی ناوبانگی دەگاتە ئەوێ، دەیکەنە سەرۆکی مامۆستایان، دوای چوار ساڵ لە ١٨٥٤ والی محەمەد رەشید پاشا کۆزلکی لە جێگای محەمەد ئەمین زەند دەیکاتە موفتی بەغدا، هەتا پایانی ژیانی لە پایەکەیدا دەمێنێتەوە(١٥ کانونی یەکەمی ١٨٩٠). نزیکەی حەفتا ساڵی بە دەرس وتنەوە و وەعز و فتوا بەسەر بردووە. عەبدولغەفار ئەفرەس دەڵێ:

*ارى فى لفظ هذا الشهم حسنا ---- ينبئى عن مدى علم عظيم*(٢٢)

*و مهما زدته نظرا بفكري ---- رايت لماه قطاس العلوم*

لە هەڵبەست و پەخشاندا باڵا دەست بووە، زانیارییەکی بەرفراوانی لە ئەدەبی فارسی و عەرەبیدا هەبووە لە شوێنێکدا دەڵێ:

*لاتدع فى حاجة بازا و لا اسدا --- الله ربك لاتشرك به احدا*

محەمەد ئەمین زەکی بەگ لە لێکدانەوەی ئەم بەیتەدا دەڵێ: مەبەستی لە (باز) شێخ عەبدولقادری گەیلانییە و لە(شێر) ئیمامی عەلی کوڕی ئەبیتالیبە، دەیەوی لە خەڵك بگەیێنی کە بۆ نزا و دوعا چ پێویست بە واسیتە لە نێوان خوا و ئادەمیزاد ناکا. موفتی زەهاوی دوازدە کوڕی هەبووە، زۆریان لە کوڕ و نەوەکانی ناودار بوون، بەناوبانگترینیان شاعیری گەورە جەمیل سدقییە (١٨٦٣-١٩٣٦) و محەمەد رەشید پاشا (١٨٤٨-١٩١١) کە لە هەندێك قەزاکانی عێراق و سوریا قایمقام دەبێ و ئەندامی مەحکەمەی ئیستیئناف لە بەغدا و جێکاری موتەسەریفی کەربەلا بووە.

---

[22]- شێخ محەمەد ساڵح سەهەرەوەردی ستایشی توانای بەرزی زانستی و شارەزایی و زانایی لە تەفسیر و حەدیس و بەهرە و بلیمەتی، بڕوا بە تینی دەکات.

## شێخ ڕەزای تاڵەبانی

لە شاعیرە ناودارەکانی عێراقە، بە زمانی کوردی و فارسی و تورکی شیعری داناوە، لە بنەماڵەیەکی ناوداری کەرکوکە، دەچێتەوە سەر عەشیرەتی زەنگەنە، زیاتر بە گوندی تاڵەبانی سەر بە قەزای چەمچەماڵ کە تێیدا نیشتەجی بووە ناسراوە. باب و باپیرانی لە شێخەکانی ڕێبازی سۆفیەتی قادری بوون، باوکی شێخ ڕەزا ناوی شێخ عەبدولڕەحمان خالیس کوڕی ئەحمەد کوڕی مەحمودە، شاعیر و شێخی تەریقەت بووە لە کەرکوك، لە ساڵی ١٨٥٩ ماڵئاوایی لە ژیاندا کردووە، دیوانی شیعری بە زمانی تورکی و فارسی لە ١٨٦٨ چاپکراوە.

شێخ ڕەزا ساڵی ١٨٣٧ لە گوندی قرخ قەزای چەمچەماڵ هاتۆتە دنیا، لە کەرکوك پێدەگا، لە لای باوکی و زانایانیتر: عەلی محەمەد بلاغ، سەعید حیلمی و مەلا عەبدوڵڵای جەلیزادە لە کۆیە دەخوێنێ، هەر لە تافی لاویەتییەوە بە چاکە ناسراوە، لە ساڵی ١٨٦٠ هەوار دەباتە ئەستەنبول، دوای دوو ساڵ دەگەڕێتەوە کەرکوك، بۆ جاری دووەم گوزەر دەکاتەوە بۆ پایتەختی تورکی، پاشان بە مەبەستی بەجی هێنانی حەج ڕوو دەکاتە حیجاز، لە ڕێگاوە بە میسردا تێدەپەڕێ، دەگەڕێتەوە ئەستەنبول، لەوێ شوناسی لەگەڵ شاعیرانی تورك پەیدا دەکا، لە پێش هەموویانەوە نامیق کەمال (١٨٤٠-١٨٨٠)، لە لایەن وەزیری تورك کامیل پاشا و ئەحمەد پاشا کوڕی سلێمان پاشای میری بابان چاودێری تایبەتی دەکرێت، دەڵێن لە ئانی مانەوەی لە میسردا دەرسی فارسی بە کوڕەکانی خدێو ئیسماعیل گوتووە، بۆ دواجار دەچێتەوە حەج، لە ١٨٧٤ دەگەڕێتەوە کەرکوك، پاشان ڕوو دەکاتە بەغدا و لێی نیشتەجی دەبێ، لە ٢٠ی کانونی دووەمی ١٩١٠ جیهان بەجی دێڵێ. دیوانی شیعری بۆ یەکەمجار بە زمانی کوردی و تورکی و فارسی لە ساڵی ١٩٣٥ لە بەغدا چاپکراوە. دووبارە عەلی کوڕی عەبدوڵڵای تاڵەبانی نەوەی شێخ ڕەزا چاپی

کردۆتەوە، شیعرەکانی بە هەجوو زەنب و تانەی ناشرین ناسراوە، تا ئەوەی هەندێك لە رەخنەگران بە (حطيئة) ی کوردیان ناوناوە. شەرە شیعری هەجوو دەمەتەقەی لەگەڵ جەمیل سدقی زەهاوی و ئەدیبانی سەردەمی خۆیدا کردووە، هەروەها شیعری غەزەل و ستایش و شیوەنی هۆنیوەتەوە، ستایشی ناسرەدینی شای ئێران و هەردوو سوڵتانەکان عەبدولعەزیز و عەبدولحەمید، و میر مستەفا فازل، بنەماڵەی بابان، نەقیب و جەمیل و هیتر دەکات، لە هەندێك شیعرەکانیدا چەند بەیتێکی عەرەبی بۆ رازاندنەوەی کردۆتە تێکهەڵکێش، کە لە تازیەنامەکەی بۆ مستەفا زهنی پاشای بابانی بە بۆنەی مردنی قادر بەگی برای ناردووە سەرەتاکەی بەم شێوەیە دەست پی دەکات:

*لقد اصيب حبيب القلب وا أسفا*

*وصار بدر سماء المجد منخسفا*

شیعرەکەش خۆی بە زمانی فارسیە، لە هەجوی پێش نوێژ و ئیمامی مزگەوتی ئیمامی ئەعزەم کەوا نەزان و لە زانست و لە چاکە بەدەر بووە دەڵێ:

*لو كان يعلم انت من جيرانه*

*من قبره فر الامام الاعظم*

عەباس عەزاوی لە بەشی هەشتەمی مێژووەکەیدا دوو دێڕی ئەوی لە هەجوی والی بەغدا عتائوللا پاشا هێناوە کە دەڵێ: والی تەمەنی گەیشتۆتە پیریەتی سەر گۆڕ، لە سەد ساڵی تێپەراندووە، بێگومان دانانی بە والیەتی دەبێتە پشێوی باری وڵات، بە بیردا نایی چاکسازی و بووژانەوەی هەرێم بە یەکی لە مردوان بکرێ!! هەربژی هێزی هۆشمەندیەتی بابی عالی بۆ هەڵسوڕانی کاروباری دەوڵەت!!. پێشتر هەجوی سری پاشا والی بەغدا و قازیەکەی حەقی ئەفەندی کردووە، ماناکەی کە لە دوو بەیتە تورکیەکەدا هاتووە دەڵێ: ئەگەر سری والی و حەقی قازی بێ دەك خاك بەسەری رەعییە بێ، هاوار لە خۆتان

خەڵکینە!! لە پارچە هەڵبەستێکدا باسی باب و باپیرانی دەکات تاکو دێتە سەر خودی خۆی و دەڵێ:

مەلا مەحمودی زەنگەنە یەعنی قوتبی دائیرەی ئیرشاد
لە دەوری مەرقەدی هەر دەنگی یاهو دێت و یا مەعبود

پاشان دەڵێ:

ڕەزاش لەو نەسلەیە ببەخشە یاڕەب چونکە قەت نابێ
گوڵی بێخار و بەحر بی بوخار و ئاگری بی دوود

**محەمەدی مەحوی**

شاعیری تەسەوف شێخ محەمەد مەحوی کوڕی شێخ عوسمانی باڵخییە، دەچێتەوە سەر گوندی باڵخی سەر بە شارباژێڕ. ساڵی ١٨٣٦ لە سلێمانی هاتۆتە جیهان، زانیاری ئایینی و بیروباوەری سۆفیەتی لەسەر دەستی باوکی خوێندووە، دوای ئەوە بووەتە سوختە و قوتابی موفتی محەمەد فەیزی زەهاوی، بۆ بەجێ هێنانی دەستوری حەج دەڕوا، لە ڕێگای گەڕانەوەیدا لا دەداتە ئاستانە، لە سەر فەرمانی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم، تەکیەیەکی لە سلێمانی بۆ دروست دەکرێت، خوی داوەتە دەرس وتنەوە و ڕابەری و ئیرشاد کردن، هەتا مەرگ لەو شارەدا لە ئەیلولی ١٩٠٩ یەخەگیری دەبێ. وەزیری مێژوونووس محەمەد ئەمین زەکی بەگ لە کتێبەکەیا (مێژووی سلێمانی) باس دەکا و دەڵێ: دەستێکی باڵای لە زمانی کوردی، فارسی و عەرەبیدا هەبووە. عەلی کەمال دیوانی شیعرەکەی ساڵی ١٩٢٠ لە سلێمانی چاپ کردووە[٢٣]، زۆرترین قەسیدە و غەزەلەکانی پەیوەندیدارن بە ئایین و فەلسەفەکەیەوە.

---

[23]- کۆڕی زانیاری کورد دیوانی شیعر و بەسەرهاتی مەحوی بە تێروتەسەلی لە قەوارەی ٥٩٨ لاپەڕەدا لێکدانەوە لێکۆڵینەوەی مامۆستا عەبدولکەریم مودەڕیس ١٩٧٧ چاپی کردۆتەوە.

## سالح حەریق

شاعیری کورد مەلا سالح حەریق کوڕی مەلا نەسروڵلایە، لە گوندی (زێوی) ی سەر بە سلێمانی ساڵی ١٨٦٦ هاتۆتە دنیا، بۆ مەبەستی خوێندن و زانست بەدەست هێنان هەموو ناوچەکانی کوردستان گەڕاوە. زۆر شارەزایی لە زمانی فارسی پەیدا دەکا، ماوەیەکی زۆر لە سلێمانی نیشتەجی دەبێ، پاشان دەگوازرێتەوە بۆ ناوچەی سابلاخ. ڕێبازی نەقشبەندی لەسەر دەستی شێخ عوسمانی تەوێڵەیی وەرگرتووە. هەموو کاتی خۆی بە دەرس گوتنەوە و خوێندنەوە بەسەر بردووە، ساڵی ١٩٠٩ لە سنە ماڵئاوایی لە ژیان دەکات. وەزیری مێژوونووس محەمەد ئەمین زەکی لە کتێبەکەیدا (مێژووی سلێمانی) دەڵێ: گەلی شیعری نایاب و ناسکی هەیە. دیوانە شیعرەکەی ساڵی ١٩٣٨ لە بەغدا چاپکراوە.

## ئەحمەد مەلا قادر

شاعیری کورد مەلا ئەحمەد کوڕی مەلا قادر ناسراو بە (سائیب) ساڵی ١٨٥٤ لە سلێمانی هاتۆتە جیهان، سەرەتای زانستەکان و زمانی فارسی لای باوکی فێر دەبێ و زانیاری ئایینی لای شێخەکانی شارەکەیان دەخوێنێ. لە زاخۆ بە نیاباتی شەرعییە دادەمەزرێ. ئینجا ئەندام لە مەحکەمەی بیدائەی سلێمانی. دوایی دەبێتە جێگری قازی هەڵەبجە، بە ئەرکی مامۆستایەتی لە قوتابخانە تایبەتیەکەی خۆیدا هەڵساوە. ساڵی ١٩١٠ کۆچی دوایی کردووە. شیعری بە عەرەبی و کوردی و فارسی هۆنیوەتەوە.

## محەمەد ئەمینی کورد

واعیز و دانەری متەسەویف شێخ محەمەد ئەمینی کورد کوڕی شێخ فەتحوڵلایە لە هەولێر هاتۆتە دنیا، هەر لەوێش خوێندویەتی، ڕێبازی نەقشبەندی لەسەر دەستی شێخ عوسمانی تەوێڵە وەرگرتووە، بە مەبەستی حەج چۆتە مەککە، پاشان ڕوو دەکاتە مەدینە. دەرس لە مزگەوتی نەبەوی دەڵێتەوە. دە ساڵ لە حیجاز بەری دەکا دوایی بەرەو میسر دەکەوێتە

زی، لە مزگەوتی ئەزهەر تێکەڵ بە (رواقالاکراد) دەبێ، دەبێتە جێکاری بەرێوەبەرایەتیەکەی. کتێبی لەسەر: فقه و تەسەوف و رەوشت داناوە. پوختەی تەسنیفەکانی ئیمامی غەزالی لە فارسییەوە وەرگێڕاوە، رێبازی نەقشبەندی بڵاو کردۆتەوە خەڵکێکی زۆری کەوتۆتە گەڵ. لە ٩ی شوباتی ١٩١٤ لە قاهیرە لە تەمەنێکی پیری پەك کەوتەدا سەری ناوەتەوە.

کتێبەکانی کە دایناون: *تنویر القلوب* (١٩٤٠)، *سعادة المبتدئین فی علم الدین* (١٩١٢)، *ضوء السراج* (١٩٠٩) *فتاح المسالك فی ایظاح المناسك*، *مرشد العوام لأحكام الصیام* (١٩١٣)، *هدایة الطالبین لأحكام الدین* (١٩١٢)، *ارشاد المحتاج الی حقوق الأزواج* (١٩١٤)... هتد.

جگە لەو شێخ محەمەد ئەمین کوردیە یەکێتر هەیە کە ناسراوە بە مەلا مەعنەوی، ئیبراهیم دەروبی لە کتێبەکەیدا (*البغدادیون: اخبارهم و مجالسهم*) باسی دەکا بە پیاوچاك، مەشرەبخۆش، توندڕەو، دەمەتەقە پەروەر، بەزەیی هاتن بە گیانداراندا، ئارەزووداری کیمیاگەری و سیحر و ئەفسون.

لە لای موفتی محەمەد فەیزی زەهاوی و شێخ عەبدولسەلام مامۆستای تەکیەی گەیلانی و عەبدولوەهاب نائیب خوێندویەتی. لە تشرینی یەکەمی ١٩١٤ لە بەغدا ژیان بەجی دێڵێ.

## عەبدولڕەحمان قەرەداغی

باوکی شێخ عەبدولڕەحمان قەرەداخی لە پیاوە ئایینیە بەرزەکانی کوردستان بووە. شێخ عەبدولڕەحمان لە دوانزدەی کانونی دووەمی ١٨٣٨ لە قەرەداغ سەر بە سلێمانی هاتۆتە جیهان، لە لای باوکی دەخوێنێ پاشان لە ١٨٥٩ دەگوێزرێتەوە بەغدا، خۆی گەیاندۆتە موفتی زەهاوی و لای ئەو دەخوێنێ، دوای ساڵێك دەگەڕێتەوە کۆنە هەوارەکەی، خەریکی دەرس وتنەوە و کتێبدانان دەبێ، چۆتە ریزی موریدانی رێبازی نەقشبەندی، ساڵی ١٨١٢ دەچێتە کەرکوك، پاشان بۆ ساڵی ئاینده روو دەکاتەوە بەغدا، دەرس وتنەوەی لە

تەکیەی (بەکتاشیە) ناسراو بە مزگەوتی بابەگوڕگوڕ و لە خوێندنگای ئەبی یووسف لە (کازمییە) ی پی سپێردراوە، بژاردەیەك لە زانای لێهاتوو، لە سەر دەستی پێگەیشتن وەك (عەبدولوەهاب نائیب، مەحمود شوکری ئالوسی، عەبدولمەلیك شەواف). لە ٢٢ی ئایاری ١٩١٧ لە بەغداد جیهان بەجی دێلێت. گەلێ تەنسیفی داناوە لەوانە: *دقائق القائق، الایقاظ فی شرح الألفاظ اسنی المطالب فی بیان علم الواجب، تحفة اللبیب فی المنطق، الاجوبة البهیة فی الأسئلة الهندیة، سعادة الدارین، التباین فی بیان الناسخ و المنسوخ، مواهب الرحمان فی علم البیان، تنبیة الاصدقاء فی بیان التقلید و الأجتهاد، و لأفتاء و الأستیفتاء*... هتد، محەمەد ساڵح سهەرەوەردی لە "*لب الألباب*"دا باسی دەکا و دەڵێ: زۆر زیرەك و بیرتیژ و بەڵگە بەهێزە لە وتووێژدا. باڵادەست لە "*علم الاصول، فقة، حدیث، کلام، حکمة، بلاغة و منطق*" خواناس و پاکرەوشت بوو، مەحمود شوکری باسی دەکا دەڵێ: هەر گیروگرفتێکی ئاڵۆز بووایە بە رای خۆی چارەی دەکرد، شێخ عەلی: لە کوڕە ناسراوەکانی بوو کە جێگای ئەوی لە دەرس وتنەوە و خوێندنگای ئیمام ئەبی یوسفدا گرتۆتەوە، کە شێخ مەحمود ئیمارەتەکەی لە ١٩٢٢ لە سلێمانی راگەیاند کردیە وەزیری داد، بەڵام شێخ عەلی ئەو پایەی لە ترسی دووبەرەکی و فیتنەگەریدا رەت کردۆتەوە.

هەروەها شێخ مستەفا مەحمود قەرەداغی برازای ناودار دەبی، لە ساڵی ١٨٩٢ هاتۆتە دنیا، زانستەکانی شەرع دەخوێنێ، لە خوێندنگای "*قضاة*" لە ئەستەنبول دەردەچێ، لە سەرەتاوە دەبێتە قازی شەرع (١٩١٨)، قازیەتی ئامێدی (١٩٢٣)، ئینجا کەرکوك، پاشان دەگوازرێتەوە بە حاکمێتی-منفرد-ی هەولێر (١٩٣١)، دەبێتە یاریدەدەری بەرێوەبەری گشتی ناوخۆ (١٩٣٨)، دوای موتەسەریفی سلێمانی (١٩٤١) و سەرەك تەسوییەی مافی زەوی (١٩٤٤)، موتەسەریفی هەولێر (١٩٤٨)، کەرکوك (١٩٥٠). دوای دەست بەربوونی لە فەرمان خەریکی پارێزەری دەبێ، کتێبخانە بەهادارەکەی دەکاتە دیاری بۆ "کۆڕی زانیاری کورد" شێخ مستەفا لە ئایاری ١٩٧٣ لە بەغدا جیهان بەجی دێلێ.

## ئەمین یومنی

شاعیری کورد ئەمین یومنی بەگ سالی ١٨٤٥ لە سلێمانی هاتۆتە جیهان، خوێندنەکەی لەسەر شێوازی کۆن بووە، زمانی تورکی و فارسی بە باشی زانیوە، پاشان کەمێکیش فەرەنسی فێر بووە، هەندێك فرمانی بینیوە دەبێتە (قونسلی) دەوڵەتی عوسمانی لە سنە، پرژاوەتە سەر دیراسەتی شیعری فارسی، دڵگرتەی حافیزی شیرازی بووە.

دیوانە پێنج خشتەکیەکەی لە ژێر ناوی (جذبة العشق) لە ئەستەنبول بە چاپی گەیاندووە (١٩٢١)، هەروەها بەشی یەکەم (*المثنوی*) هی جەلالەدینی رۆمی و "ساقینامە"ی تەخمیس کردووە، بە تورکیش ئەمانەی داناون (پوتە ئەسرار، *قهرمان قاتل*، *ضروب امثال*، ترکیب بند، هفت بیگر- حەوت دەموچاو). دەستنووسیتری بە فارسی و کوردی لە پاش بەجێماوە، لە سالی ١٩٢١ مەرگ گیانی لێ دەستێنێ.

## محەمەد تەها شێروانی

شێخ محەمەد تەها کوڕی ئیسماعیل کوڕی حەسەن بەگ شێروانییە، سالی ١٨٣٤ لە هەولێر هاتۆتە دنیا، لای زاناکانی ئەوی دەخوێنێ، پاشان بەرەو گوندی تەوێڵە بەری دەکەوێ، ڕێبازی سۆفیەتی لەسەر دەستی شێخ محەمەد بەهائەدین کوڕی شێخ عوسمان وەرگرتووە، دەگەرێتەوە هەولێر بە ئەرکی دەرس وتنەوە خەریك دەبێ بەڵام زۆر نامێنێتەوە بەرەو بەغدا دەروا، تەفسیر لە لای موفتی محەمەد زەهاوی دەخوێنی و ئیجازەی زانستی لێ وەردەگرێ، دوای ئەوە دەچێتە کەربەلا. رابەرایەتی و زانستی ئایینی بلاو دەکاتەوە، وتوویژ لە نێوان ئەو و زانایانی شیعە روو دەدات، هەروەك محەمەد سالح سهەرەوەردی لە (لب الألباب) دا دەلی بە تەبایی و تێك گەیشتن کۆتایی پێهاتووە.

پاشان شێروانی دەگەرێتەوە بەغدا لەبەری کەرخ دادەبەزی، دەست دەکا بە دامەزراندنی (ختمه النقشبندیه) و دەرس وتنەوەی لە مزگەوتی خدر ئیلیاس پی دەسپێرن. والی محەمەد

تەقیەدین پاشا وای پێ باش بووە بگەڕێتەوە کەربەلا، دەیکاتە بەڕێوەبەری ئەوقاف، لەوێ هەتا شۆڕشەکەی عێراق دەمێنێتەوە، سەهەروەردی دەڵێ: هەندێك نەفام و نەزانی کەربەلا پەلاماری ماڵەکەی دەدەن و ئاگری تێبەردەدەن، شتومەك و کتێبەکانیشی بە تالان دەبەن، ماڵ و منداڵەکانی دەگوازێتەوە بەغدا. وەزارەتی ئەوقاف لە سەردەمی وەزیرایەتی ئیبراهیم حەیدەری دەیکاتە مامۆستای خوێندنگای (ئەزبکیە) و خوتبە خوێن لە مزگەوتی حاجی ئەمین. لەوە بەردەوام دەبێ هەتا پایانی ژیانی لە ٢١ی ئایاری ١٩٣١.

سەهروەردی دەڵێ: پیاوێکی خواناس و ئایینپەروەر پاك و دڵسۆز بوو. هەندێك نامە و پەراوێز و لێدوانی نوسیوە، دوای مردنی هەندێك لە شاعیران شیوەنیان بۆ کردووە لەوانە مەحمود ئەلەجوعی و محەمەد ڕەشید حەفید و شێخ داود نەقشبەندی.

## نورەدین شێروانی

نورەدین کوڕی شێخ ئیسماعیل کوڕی حەسەن بەگ شێروانییە، ساڵی ١٨٦٧ لە هەولێر هاتۆتە دنیا، دەرسە سەرەتاییەکان لەوێ دەخوێنێ، پاشان دەچێتە کەربەلا بۆ لای شێخ تەهای برای کە لەوێ مودەریس بووە، لەسەر دەستی ئەو و عەلی میرزا باقر یەزدی دەخوێنێ، تەجوید لە لای حاجی عەبدولسەلام بەغدایی فێر بووە، دەیکەنە مامۆستای قوتابخانەی روشدیەی کەربەلا، دەگوازرێتەوە بۆ بەسرە (١٨٩٩)، دوایی بۆ حەی پاشان بۆ بەڕێوەبەرایەتی خەستەخانەی (غرباء) لە بەغدا (١٩٠٤)، دەیکەنە ئەندام لە ئەنجومەنی (مەعاریف)، دوای ئەوە دەبێتە جێکاری بەڕێوەبەری قوتابخانەی دواناوەندی، جا بەڕێوەبەری خانەی مامۆستایان لە بەغدا، دوایی لە بەسرە، پاشان بەڕێوەبەری (بێ نەوایان). دوای داگیر کردنی لە لایەن بەریتانیاوە دەگەڕێتەوە بەغدا، دەبێتە مامۆستا لە کەرکوك، دوایی پشکنێنەری (ئەعشار) لە هەولێر، پاشان دەیکەنە بەڕێوەبەری کولیەی ئەعزەمیەی سەر بە بەڕێوەبەرایەتی ئەوقاف (ئازاری ١٩٢٠)، لە ساڵی ١٩٢٦ واز دەهێنێ، دەیکەنە بەڕێوەبەری قوتابخانەی ڕەحمانیە لە بەسرە هەتا تەقاعود دەکری (تەمموزی

۱۹۳۰) کە شێخ تەهای برای دەمرێت، بە ئەرکەکانی ئەو هەڵدەستێ. وانەبێژی لە ئەزبەکییە و خوتبەخوێنی مزگەوتی حاجی ئەمین لە بەری کەرخ.

کتێبی لەسەر مێژووی ئیسلام و فەلسەفەی رەوشت، مەنتیق، مێژووی پەروەردە، زیندوبوونەوە دوای مردن، زانستی جیاکاری داناوە.. مردنەکەی رێکەوتی ۱۹٤۲ دەبێ لە بەغدا "ئەو باوکی بەهائەدین نوری وەزیرە".

## ئەمین فەیزی بەگ

ئەمین فەیزی بەگ لە سلێمانی هاتۆتە دنیا، ساڵی ۱۸۸۹ لە خوێندنگای جەنگی لە ئەستەنبۆڵ دەرچووە، لە پلە وپایەکانی سوپای تورکی پێش دەکەوی تا دەگاتە پایەی میر ئالآی (عەقید)، ساڵی ۱۹۱۱ بۆتە فەرماندەی تۆپ سازی لە بەسرە،دوای ئەوە سەرفراز دەکرێ، سەردمێك لە بەغدا بەرێوەبەری قوتابخانەی روشدیە و دواناوەندی بووە، بە زمانی تورکی کتێبی داناوە (اجمال النتائج) "پوختەیەکی بیرکاریە" چاپی ئەستەنبۆڵ (۱۸۹۳)، (*تفرقة رياضية*) "لەسەر زانستی جەبرە ۱۹۱۱" هەروەها کتێبی ئەدەبی شعری بە کوردی هەیە لەوانە: ئەنجومەنی ئەدیبانی کورد (۱۹۲۱)، پرشنگ ۱۹۲۵ و هەوای نەسیمی.

محەمەد ئەمین زەکی باسی دەکا دەڵێ: ئەدیبێکی باش بوو، لە زانستی بیرکاریدا شارەزا و لە شیعرو ئەدەبدا بە توانا و بەهرەوەر، لەگەڵ شێخ رەزای تاڵەبانی نامەیان بە شیعر ئاڵوگۆڕ کردووە. لە شیعرە کوردیەکانی کە لە وەرگێڕانی رەفیق حیلمییە:

کە جەیشی غەم هجومی کرد – نیزامی عومری من تێك چوو
مومکین نیە ئاسایش حاڵ پەرێشانم – بینای بورجی بەدەن رووخا
بە گوللە حادیـسات ئەمرِو – نەما قوەت لە ئەژنۆما برِا پشتم شکا شانم

بە گوێرەی کە عەباس عەزاوی لە کتێبەکەیدا (تاريخ علم الفلك) باسی کردووە کەوا ئەمین فەیزی بەگ ساڵی ۱۹۲۸ لە ئاستانە کۆچی دوایی کردووە.

## حوسین نازم

له پیاوانی کوردی رۆژنامەگەری و مێژووا حسێن نازم کوڕی عەبدول فەتاح کوڕی ئەحمەد خەیاتە،ساڵی ۱۸۷۱ لە سلێمانی هاتۆتە دنیاوە، هور لەویش خوێندویەتی، جگە لە زمانی کوردییەکەی فارسی و تورکی باش زانیووە، کاتی پی دەگا دەچێتە ناو فرمانی مێری، دەبێتە مودیر ناحیەو قایمقامی قەزا، دوای جەنگی یەکەمی جیهانی بۆتە راوێژکاری شێخ مەحمود لە کاتی سەربەخۆکردنی فەرمان رەواکەیدا لە سلێمانی، پاش ئەوە دووچاری کینەبەری ئینگلیزی دەبێ، دەیگرن و دەست بەسەر خانوکەشی دادەگرن. لە ساڵی ۱۹۲٤ لەسەردەمی فەرمانڕەوایی شێخ مەحموددا بووە سەرنوسەری رۆژنامەی "ئومێدی ئیستقلال" کە بەهەر سی زمان کوردی و فارسی و تورکی دەردەچوو، کە حکومەتی کوردستان لەناوبرا بەرەو تورکیا دەرەوا، دەیکەنە قایمقامی قەزای شەمزینان کاتی حکومەتی تورکی دەکەوێتە سەرلەدوونانی نیشتیمان پەروەرانی کورد دەگەڕێتەوە سلێمانی، سەرپەرشتی رۆژنامەي(ژیان) دەکات. کە فرمانگەی شارەوانی دەری دەچوواند، بەردەوام بوو لەسەر دەرچواندنیدا هەتا لە شاری لەدایك بوونیدا لە ۱۹۳۲ ماڵ ئاوایی لە ژیان دەکات. لەسەردەمی خۆیدا لەبەرزترین پیاوانی رۆشنبیری کورد بووە، بەدەست خەت مێژووی نوسیوەتەوە کە بۆتە سەرچاوە بۆ محەمەد ئەمین زەکی و مێژوو نووسانیتر، بەرهەمەکانی بە(دەفتەرەکەی حسێن نازم) بەناوبانگە.

## مستەفا ساحێبقڕان

شاعیری کورد مستەفا بەگ کوڕی مەحمود بەگ کوڕی ئەحمەد ساحێبقڕانە، لەسەرەتای ژیانیدا (هیجری) کردۆتە نازناوی خۆی، پاشان دەیگۆڕی دەیکا بە (کوردی). لە ساڵی ۱۸٦۱ لە سلێمانی هاتۆتە دنیا لەوێش خوێندویەتی. بە سەلیقە شاعیربووە، شیعری

هۆنیوتەوە. هەروەك محەمەد ئەمین زەکی بەگ دەڵێ: بەهرەیەکی خۆرسکیە زیاتر لەوەی کەسبی بوو بێت.

شیعرەکانی خۆی لەبەر دەخوێندەوە، شێوازەکەی یەکجار ناسك و رەوان بێژو تەرو پاراوو پڕ مانا بوو، زۆرترین شیعرەکانی دڵداری و غەزەلن، بۆ مەبەستی جیاجیا شیعری هەیە، دڵنیگەرانی ئەوە بووە کە رۆڵەی نەوەکەی لە ژێر دەستی هێزی فەرمان رەوادا پەرێشانە، شیعرەکانی کلاسیکی شێوازی کۆنە، غەزەلەکانیش سۆفیەتیە لە چوارچێوەی رێبازی فارسی چاو لێکەریدا دەرنەچووە، مستەفا بەگ ماوەیەکی زۆر لە تاران نیشتەجێ دەبێ، ستایشی شای ئێرانی کردووە، دەیکەنە ئەندام لە (مونتەدای ئەدبی ئێرانی) شێخ رەزای تاڵەبانی دڵگرتەی مستەفا بەگ بووە، لە باشترین شاعیرانی سەردەمەکەی داناوە، لە مەڵبەندی هاتنە دنیای دا ساڵی ١٩٤٨ جیهان بەجێ دێڵێ. بەشێك لە دیوانی شیعری ساڵی ١٩٣١ لە بەغدا چاپکراوە.

## ئەحمەد بەگی ساحێبقڕان

شاعیری کورد ئەحمەد حەمدی بەگ کوڕی فەتاح بەگ کوڕی ئاراسی کوڕی ئیبراهیم بەگ کوڕی مەحمود بەگە، ناسراوە بە "حەمدی ". دەچێتەوە سەر بنەماڵەی ساحێبقڕانی ناودار. ساڵی ١٨٧٨ لە سلێمانی لەدایك بووە، لە قوتابخانەکانی ئەوئی خوێندوە لە منداڵییەوە هاورێی وەزیری مێژوو نووس محەمەد ئەمین زەکی بەگ بووە، لە کتێبەکەشیا (مێژووی سلێمانی) باسی ئەحمەد حەمدی دەکا دەڵێ:ئەحمەدشارەزایی لە زمانی کوردی و فارسی پیدا کردووە، تا ئەوەی چۆتە بنج و بناوانی ئەدەبەکە شیانەوە، کە سلێمانی ساڵی ١٩١٨ داگیر دەکرێت دیوانە شیعرەکەی دەسوتێ، بەڵام دوای ئەوە شیعری تری زوڕ هۆنیوەتەوە.

دیوانە کوردیەکەی ساڵی ١٩٥٧ لە بەغدا چاپکراوە. ئەحمەد حەمدی لەگەڵ شێخ مەحمود جیاکار دەبێ، بەڵام کە شێخ مەحمود لە شۆڕشەکەیدا نشوست دێنی و دەگیری ئەو

روو دەکاتە کێو، کاتی شێخ مەحمود دەگەڕێتەوە سەر حوکم دەیکاتە بەڕێوەبەری گشتی باج و خەراج (گومرگ)، پاشان دەبێتە سەرەك شارەوانی سلێمانی.

لە دوازدەی تشرینی دووەم ١٩٣٦ مەرگ لە مەڵبەندی لە دایك بوونیدا یەخەگیری دەبێ. محەمەد ئەمین زەکی دەڵێ: لە واقیعدا قەسیدە و غەزەل و پیننج خشتەکیەکانی نمونەیەکن لە تەبیعەتی بەرزو نایاب، بۆی هەیە نەتەوەی کورد بە ئەدەبەکەی و ئەدیبانی وەك ئەو بنازێ، پارچە شیعرێکی ئەوی خستۆتە بەرچاو.

## حەسەن بامەرنی

شاعیری کورد حەسەن کوڕی مەلا ئەحمەد بابەکە. ساڵی ١٨٦٧ لە گوندی بامەرنی هاتۆتە جیهان. لە خێزانێکدا کە دەچنەوە سەر ئەبوبەکر سدیق[٢٤]، لە ژێر چاودێری باوکی کەوا لە پیاوانی سۆفیگەری سەر بە ڕێبازی نەقشبەندی بووە پێدەگا. مەحفوز محەمەد عومەریی لە کتێبەکەیدا (*امارة بهدينان العباسية*) باسی دەکا دەڵێ: "شیعرەکانی ناسکن و لە هەردوو چەشنن کۆن و نوێ، شێوازی یەکجار جوان و پڕمانا ڕەوانبێژ و ئەندێشە فراوانن و نایابترین قەسیدەی لە سەر پێشبڕکێی گوڵانە".

---

24– زۆر لـە پیـاوانی کـوردەواری بـۆ مەبەسـتی تایبـەتی هەوڵیانـداوە ڕەچـەڵەکی خۆیـان ببەنـەوە سـەر ئەبوبەکری سدیق، یا خود سەیدن و لە نەوەی پێغەمبەرن، لە کاتێکدا هـیچ بەڵگەشـیان لـەم بارەیـەوە بـە دەستەوە نییە. "وەرگێڕ"

## ئەبوبەکر مەلا



زانا و ئەشرافی هەولێر ئەبوبەکر مەلا ئەفەندی کوڕی عومەر کوڕی ئەبیبەکری ناسراو بە (کوچك مەلا) کوڕی عوسمانە. لە ساڵی ١٨٦٧ لە هەولێر هاتۆتە دنیا[٢٥]. لە لای باوکی دەخوێنێ، کوچك مەلای باوکی وەك باب و باپیرانی لە مزگەوتی قەڵا مودەریس بووە، پاشان خوی داوەتە رابەری و ئیرشاد. مەلا ئەفەندی جێگای باوکی لە دەرس وتنەوەدا دەگرێتەوە. دانان و وەرگێڕانی لەسەر ئەستێرەناسی کۆن و نوێدا هەیە. لە ٣١ی کانونی یەکەمی ١٩٤٢ لە مەڵبەندی لەدایك بوونیدا جیهان بەجێ دێڵێ[٢٦]. کە بزوتنەوەی رەشید عالی گەیلانی رووددەدا شەر لەگەڵ ئینگلیز بەرپا دەبێ، مەلیك فەیسەڵی دووەم و مەلیکە عالیەی دایکی دێنە هەولێر دەبنە میوانی مەلا ئەفەندی کە ئەوسا مەلیك تەمەنی شەش ساڵان دەبێ.

لیوا عەبدوللەتیف سەرۆکی یاوەرانی مەلیك بۆی باس کردم: کەوا شەو و رۆژ مەلیکی بەرنەداوە لە ترسی سەلامەتی گیانی، لەبەر دەرگای ژوورەکەی ئەودا دەنووست. گوتی: ئەگەر یەکێك نیازی خراپەی لەگەڵ مەلیك هەبایە دەبوایە بەسەر لاشەکەی مندا تێپەڕبوایە.

---

25– راستی مێژووی هاتنە دنیای مەلا ئەفەندی ساڵی ١٨٥٨ بووە، واتە لە تەمەنی ٨٠ ساڵیدا مردووە.

26– پیرەمێرد بە هەڵبەستێکی ناسك شیوەن بۆ مەلا ئەفەندی دەکا، سەرەتاکەی بەم شێوەیەیە:

ئایینی ئیسلام دەریخستووە

دوای مردن گیانی وەلی زیندووە.

## حاجی تۆفیق بەگ "پیرەمێرد"



شاعیری کورد تۆفیق بەگ کوڕی مەحمود ئاغا کوڕی هەمزە ئاغای مەسرفە، بە ناوی (پیرەمێرد) ناسراوە، ئەو نازناوەشی لە گەڕانەوەیدا بۆ وڵات لە خۆی ناوە بە ئەدەبیاتەوە خەریك دەبێ. هەمزە ئاغای باپیری وەزیری ئەحمەد پاشا دروا میرەکانی بنەماڵەی بابان بووە.

پیرەمێرد لە ساڵی ١٨٦٧ لە سلێمانی هاتۆتە جیهان، زانیاریەکانی زمان و ئایینی لە قوتابخانە کۆنەکانی وڵاتەکەی وە لە بانەی سەر بە ئێران خوێندووە. زمانی کوردی و تورکی و فارسی بە باشی فێر دەبێ، ساڵی ١٨٨٢ دەیکەنە نووسەر لە دائیرەی رەگەزناسی سلێمانی، پاشان دەبێتە سەرنووسەر لە دادگای شارباژێڕ (١٨٨٦) دوایی یاریدەدەری داواکاری گشتی لە کەربەلا (١٨٩٥)، لە فەرمان دەست بەردار دەبێ. لەگەڵ شێخ سەعید حەفید لە ١٨٩٨ دەچێتە تورکیا، بۆ ساڵی ئاینده پێکرا دەچنە حەج. دەیکەنە ئەندام لە ئەنجومەنی باڵای مەعاریف لە ئاستانەدا (١٨٩٩). نازناوی بەگی پی دەبەخشرێ، لە هەمان کاتیشدا لە حقوق دەخوێنێ بڕوانامەکەی لی وەردەگرێت، کاتی دەستوری عوسمانی لە ١٩٠٨ راگەیەندرا ئەنجومەنی باڵا ناهێڵن، دەکەوێتە کاری پاریزەری رۆژنامەگەری، بەشداری لە کۆمەڵە نیشتمانییەکانی کورد کە ئەوسا لە پایتەختی عوسمانی دامەزرابوون دەکات. بە هەر سی زمانەکەی کە باشی لێدەزانی دەینووسی و شیعری داناوە، رۆژنامەی "رسملی کتاب"ی دەرچوواندوە (١٩٠٨)، دەبێتە قایمقامی چۆلە مێرگ (١٩٠٩)، دوایی دەیکەنە موتەسەریفی لیوای ئەماسیە (١٩١٨)، حاجی تۆفیق دوایی جەنگە مەزنەکە دەگەڕێتەوە سلێمانی (١٩٢٠). دەچێتە ژێر سایەی بزوتنەوەی نیشتمانی کورد کە شێخ مەحمود

حەفید ئالآکەی بەرز کردبۆوە[27]، پاشان لە کانونی یەکەمی ١٩٢٦ کەوتە سەرپەرشتی کردنی رۆژنامەی "ژیان" کە شارەوانی سلێمانی دەری دەکرد، بووەتە سەرنووسەری (١٩٣٢)، پاشان خاوەنەکەی (١٩٣٤)، گەلێ جار رۆژنامەکەی داخراوە، بەلآم هەر بەردەوام دەبێ لە دەرچواندنیدا، تا لە ١٩ی حوزەیرانی ١٩٥٠ مآلئاوایی لە ژیان دەکات. پیرەمێرد پەندی پێشینانی کردۆتە شیعر کە ژمارەیان دەگاتە (٤٨٠٠) پەند و چەندین کتێبی داناوە لەوانە: چیرۆکی مەم و زین، دوانزدە سوارەی مەریوان (١٩٣٥)، پەندی پێشینان (١٩٣٦)، مەحمود ئاغای شیوەکەل (١٩٤٢) و بلآوکردنەوەی دیوانی عەبدولڕەحیم مەولەوی لە دوو بەش (١٩٣٥) و گەشتی هونەرمەندێك لە جیهاندا، کەمانجە ژەن وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی (١٩٤٢) [28]. لە شیعرە وەرگێڕدراوەکانی پیرەمێرد (پایزی دڵتەنگ و بەفرە باریوە) [29].

پایزی دڵتەنگ

پایز دڵتەنگە پایز دڵتەنگە هەوری نوێی زویر و دڵتەنگە
رەشەبا لێمان بەژار و ژەنگە گەلآ رێزانە گوڵ ئالتون رەنگە

بەفرە باریوە

---

[27]- پیرەمێرد لە شوباتی ١٩٢٤ گەراوەتەوە بۆ ولآت نەك لـە ١٩٢٠. هـەروەها فریـای شۆڕشـی شـێخ مەحمود نەکەوت. (وەرگێڕ)

[28]- دیوانی پیرەمێرد بۆ یەکەمجار لە لایەن محەمەد رەسوڵ هاوارەوە بە چاپ گەیەندراوە، بۆ جاری دووەم دیوانەکەی لە ١٩٩٠ لە دەزگای رۆشنبیری و بلآوکردنەوەی کوردی، کۆکردنـەوە و سـاغکردنەوەی لـە لایەن بەرێزان: مەحمود ئەحمەد محەمەد، مستەفا سالح کەریم، محەمـەد نـوری تۆفیـق، ئەحمـەد زرنـگ مـستەفا ئەنجامدراوە.

[29]- دانەری ئەم کتێبە حـەزی لـەم دوو پارچـە شـیعرە کـردووە و وەریگێـڕاوەتـە سـەر زمـانی عـەرەبی، ئێمەش تەنها ئەو چەند دێرە کوردیـەمان خـستە بەرچـاو، خوێنـەری بـەرێز دەتـوانی سـەیری دیوانەکـەی بکات. (وەرگێڕ)

بەیانی بوو لە خەو هەستام کە روانیم بەفرە باریوە
سولەیمانی ئەڵێی بەڵقیسە تارای زیوی پۆشیووە
دەمی بوو چاوڕێی بەفرێکی وابووم مژدە بی باری
سەرم بەفرە کەچی هێشتا شەرە تۆپەڵمە بۆ یاری

## مەلا محەمەدی کۆیی



قازی و زانا ئاینیی کۆیە، ئەدیبی کورد مەلا محەمەد ئەفەندی کوڕی حاجی مەلا عەبدوڵلا کوڕی مەلا ئەسعەدە دەچێتەوە سەر بنەماڵەی جەلی کەوا لە مەلا عەبدولڕەحمانی باپیریەوە هاتونەتە خوار، پشتاوپشت خزمەتی ئاینی ئیسلامیان کردووە، مەلا محەمەد ساڵی ١٨٧٦ لە شاری کۆیە هاتۆتە دنیا. زانیاریەکانی ئاینی دەخوێنێ دوای مردنی باوکی لە ١٩٠٨ جێگای لە سەرۆکایەتی زانایانی شارەکەدا گرتۆتەوە، ساڵی ١٩١٦ دەیکەنە ئەندامی ئەنجومەنی گشتی ویلایەتی موسڵ، لە ئاکامی داگیر کردنی بەریتانیا بە قازیەتی شەرعی کۆیە دادەمەزری (کانونی یەکەمی ١٩١٨). ساڵی ١٩٢٤ بە نوێنەری هەولێر لە ئەنجومەنی دامەزراندنی عێراق هەڵدەبژێردرێ.

دوای ئەوە خۆی خەریکی کتێب دانان و شیعر هۆنینەوە کردووە، خواست و داواکاری چاکسازی و خوێندەواری بووە... هەتا لە مەڵبەندی هاتنە دنیایدا لە دوازدەی تشرینی یەکەمی ١٩٤٢ جیهان بەجی دێڵێ. گەلی کتێبی لە دووا بەجێماوە زۆربەی زۆریان دەستخەتن لە: (*علم الاصول و الکلام و العقائد و التفسیر*) هەروەها ئەم کتێبانەشی داناون:

(*كشف الاستار فى مسألة الاختيار، اهى المارب فى اثبات الواجب. المشاهد، حقيقة الايمان، ضيعان عظيمان، الألة و الطبيعة و العقل و النبوة و المعجزات و الكرامات، الحدس سلم الارتقاء، خراب العالم*) دیاری مەلا محەمەدی کۆیی... هتد[30].



جگە لە شیعر و پەخشان و نووسینەکانی ئەدەبی کوردی، لە شیعرەکانی کە لە کوردییەوە وەریگێڕاوە:

دەماغی منداڵەکان پڕکەن لە حوبی وەتەن
تەربیەتیان باش بدەن میللەتیان فێر بکەن
لە ڕێگەی ڕاست لامەدەن ڕێ یەکە نابی بە دوو[31]

مەسعودی کوڕی ناودار بووە[32]، لە سەرەتادا لە هەڵبژاردنەکەی حوزەیرانی ١٩٥٤ بۆ ئەندامیەتی پەرلەمان بووە بە نوێنەر، ئینجا وەزیر، پاشان ئەندامی خزمەتگوزاری گشتی بووە و دواتر بووەتە جێگری سەرۆکی کۆڕی زانیاری کورد.

---

30– بەرهەمەکانی ئەدەبی بە زمانی کوردی ئەمانەن: دیوانێکی شیعر، عەقیدەی ئیسلام، نوێکەرەوە، هەرسی بەشەکانی قورئان لە ژێر ناوی (تەفسیری کوردی لە کەلامی خواوەندی) ئەمەشیان لە لایەن خوشکە نەجیبەی کچییەوە بە چاپ گەیەندراوە، فڕی فڕی قەل فڕی.

31– لە ساڵی ١٩٩٤ کتێبی (مەلای گەورە: زانا و ئەدیب و شاعیر) لە لایەن وەرگێڕی ئەم کتێبەوە داندراوە و بە چاپ گەیەندرا کەوتە بەر دەستی خوێنەری کوردی خۆشەویست. بە تێروتەسەلی هەموو لایەنێکی ژیانی مەلای گەورە و بیروبۆچوون و هەڵوێستی نیشتمانی و پایەی زانستی و ئەدەبی گرتۆتەوە. (وەرگێڕ)

32– مامۆستا مەسعود ساڵی ١٩١٩ لە شاری کۆیە هاتۆتە دنیا، خوێندنی سەرەتایی لە کۆیە، ناوەندی و دواناوەندی لە هەولێر تەواو کردووە، ساڵی ١٩٤٥ لە کولیەی حقوق لە بەغدا دەرچووە دەبێتە حاکم لە سلێمانی (١٩٥٢) دوای چەند مانگێک دەست بەردار دەبێ. بە نوێنەری کۆیە بۆ پەرلەمان

## عەبدولعەزیز حاجی ئەمین

موفتی سلێمانی عەبدول عەزیز کوڕی ئەمین کوڕی ئەحمەد ناسراو بە حوسنی، لە ڕەچەڵەکدا دەچێتەوە سەر مەلا محەممەدی دێلەزەیی کە بەمەلای گەورە ناودار بووە و لە ١٧٥٩ کۆچی دوایی کردووە. لەبنەماڵە زانستییەکانی کوردستانە. لەپێش ئەودا باوك و باپیرانی پایەی (موفتی) یان لە سلێمانی بیتیوە. عەبدولعەزیز بە دوو زمان کوردی و فارسی شیعری داناوە، لەسەر پەیڕەوی شاعیرانی سەردەمی خۆیدا کە نازناوەکەیان لە دووا دێڕی شیعرەکانیان دەربڕیووە.ئەویش "فەوزي" کردۆتە نازناوی خۆی. ساڵی ١٨٧١ لە سلێمانی هاتۆتە جیهان، لەلای باوکی دەخوێنێ، پاشان زانیاری ئاینی لەلای زاناکانی پێنجوێن و بیارە وەرگرتووە، لە ساڵی ١٨٩٧ دەیکەنە موفتی سلێمانی و سەرۆکی ئەنجومەني(مەعاریف)، پاشان حاکمی دادگای شارەکە بووە، دوای داگیرکردنی ئینگلیز دووچاری دەردە سەری دەبێ، لە فرمانەکانی بەدەر نراوە، بەڵام لە رابەری فێرکاریدا بەردەوام دەبێ، لە ٢٠ی ئابی ١٩٤٧ ماڵئاوایی لە ژیان دەکات.

---

هەڵدەبژێردری (١٩٥٣). دووبارە هەڵدەبژێردرێتەوە (١٩٥٤) دەچێتە پاڵ ئەندامانی بەرهەڵستکار لە بەرەی نیشتمانیدا کە کامیل جادرچی یەك لەوان دەبی، بەڵام دوای هەشت رۆژ لە یەکەم کۆبوونەوەی ئەنجومەنەکەدا کە چەند سەعاتێك دەخاینی لەسەر بڕیاری سەرەك وەزیران نوری سەعید پاشا ئەنجومەنەکە هەڵدەوەشێندری دەیکەنە وەزیری ئاوەدانکردنەوەی باکور (١٩٦٤-١٩٦٥) دوایی ئەندامی ئەنجومەنی خزمەتگوزاری گشتی (١٩٦٦) ، پاشان ئەندامی کۆڕی زانیاری کورد و جێگری یەکەمی سەرۆك (١٩٧٠) کە ئیحسان شێرزاد لە ساڵی ١٩٧٤ واز لە سەرۆکایەتی کۆڕ دەهێنی ئەو هەموو کاروباری کۆڕەکە بەو پەری چالاکی و بەرهەم زۆری ئەدەبییەوە هەتا ساڵی ١٩٧٨هەڵدەسوڕێنێ. دەتوانین بڵێین مامۆستا مەسعود ئەمڕۆ لە ریزی هەرە پێشەوەی رۆشنبیرانی کوردە. دانەری چەندین کتێب و خاوەنی نووسینێکی بێشومارە لە وتار و لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەی ئەدەبی و زانستییەوە هەر بەردەوامیشە. جگە لە زمانی کوردي- عەرەبی و ئینگلیزی و فارسی و تورکی باش دەزانێ- ئێستا لە بەغدا نیشتەجی بووە. (وەرگێڕ)

توێژینەوەی لەسەر (منطق)، هەڵبەستێکی زۆری کە بە زمانی کوردی و فارسی و مەلحەمەیەك کە نەهامەتی و کارەساتەکانی جەنگی یەکەمی مەزنی هێناوەتە بەرچاو لە پاش بەجی ماوە.

عەبدولعەزیز حاجی ئەمین موفتی سلێمانی ساڵی ١٩٣٢ بۆ کارێکی راسپێردراو لە وەزارەتی دەرەوە هاتە لام بۆی باس کردم گوتی: خوا کە پێغەمبەرەکانی دەنارد پشتگیری دەکردن بەو ئایەت و نیشانانەی کە لە جەرگەی ژیانی سەردەمەکەوە هاتبێ. لە کاتێکا موسای ناردە لای فیرعەون میللەتەکەی واتا (میسریەکان) هەواداری سیحر و ئەفسون بوون، وەك زانیمان گۆچانی (عصا الكليم) ی موسا هەموو سیحرەکانی ئەوانی هەڵلوشی کە عیسای نارد بەنی ئیسرائیل وێڵی پزیشکی و چارەسەرکردنی دەرد و نەخۆشیەکان بوون، ئایەت و نیشانەی عیساش چاك کردنەوەی بیمار و زیندو کردنەوەی مردوان بوو، ئەو رۆژەی کە نەبی محەمەدی هەنارد عەرەب خولیاو کرد و کۆشی وتە و رەوانبێژی بوو، پێغەمبەر هات لەوان رەوانبێژتر و زمانپاراوتر بوو، موفتی بەردەوام بوو گوتی: ئەگەر خوا حەز بکا پێغەمبەرێك لە سەردەمی ئێستای ئێمەدا بنێرێ، گومانم نییە رۆکفلەر یان فۆرد یا خود یەکی لەوان نزیك لە سەرمایەدارە زلەکان هەڵدەبژێرێ. لە سەردەمێکدا کەوا مادە کەوتووەتە باووبرەو، سەروەت و سامان بووەتە سوڵتانێکی گەورە و مەزن!!.

## فایەق بێکەس



شاعیری پێشکەوتنخواز فایەق عەبدوڵلا کاکە حەمە ناسراو بە (بێکەس) ساڵی ١٩٠٥ لە سلێمانی هاتۆتە جیهان، لەوی و پاشان لە کەرکوك و بەغدا دەخوێنێ، لە منداڵییەوە توشی نەخۆشی ئاوڵە بووە، چاوێکی نابینا دەبێ بێنەوا و هەژار پێدەگا، کار و پیشەی جیاجیای کردووە، جگەرەفرۆشی و چاودێریکار و مامۆستای

سەرەتایی.

شیعری بە زمانی کوردی هۆنیوەتەوە، شاعیرێکی تێکۆشەری گەلپەروەر بوو، گۆرانی و سرودی بۆ سەروەری نەتەوەکەی گوتووە. داوای تێکۆشانی دژ بە داگیرکەر و ئیستعمار کردووە. هەروەك ئەدیبی کورد فازل دەڵێ: بەشداری لە راپەرینەکەی (شەشی ئەیلولی ١٩٣٠) دژ بە پەیمانی عێراقی و بەریتانی دەکات، چەندین جار گیراوە و بەندکراوە، شیعری لە رۆژنامە و گۆڤارەکاندا بلاو کراوەتەوە[٣٣]، لە ١٨ی کانونی یەکەمی ١٩٤٨ ماڵئاوایی لە ژیان دەکات[٣٤]، محەمەد مەهدی جەواهیری بیرەوەری بە پارچە شیعرێك دەکاتەوە دەڵێ:

| | |
|---|---|
| *اخي بيكَس يا سراجا خبا* | *و يا كوكبا فى الدجى يفتقد* |
| *و يا حاصدا من كريم الزروع* | *غلال الاسى والاذى و الحسد* |
| *بلا احد سنة العبقرى* | *يحى الناس لا يعية احد* |
| *بلا احد غير خضر الجبال* | *و وحى الخيال وصمت الابد* |

## سەید ئەحمەدی خانەقا

زانای روحی و شێخی سۆفیەتی سەید ئەحمەد خانەقا کوڕی حوسێن کوڕی عەبدول قادر کوڕی ئەحمەد سەردار بەرزنجییە، لەنەوەی سەید بابا عەلی هەمەدانی کۆچکردووی ساڵی ١٤٠٢ز، خاوەنی دانانی سۆفیەتی و ئایینە،ئەحمەد سەردار خەلیفەی شێخ خالید نەقشبەندی بووە، لە گوندی سەرگەڵوی ناوچەی سورداش لە لیوا سلێمادنی هاتووەتە

---

33– دیوانی بێکەس ساڵی ١٩٨٠ بۆ جاری دووەم بە سەرپەرشتی و رێکخستن و پێشەکی بۆ نوسینی محەمەدی مەلا کەریم چاپکراوەتەوە. (وەرگێڕ)

34– شێرکۆی کوڕی بێکەس لە شاعیرە بەتوانا و بەهرەوەرەکانی کوردە، خاوەنی بەرهەمی شیعری نایابی شێواز نوێیە. (وەرگێڕ)

کەرکوك، ئەحمەد خانەقا ساڵی ١٨٩٨ لە کەرکوك هاتۆتە دنیا، لەلای حیکمەت ئەفەندی و زاناکانی تری سەردەمی خۆیدا دەخوێنی، پاشان لە تەکیەکەی خۆیا کە بە خانەقا ناوبراوە دەکەوێتە رابەری کردن و فریاگوزاری هەژار و بێنەوایان، دەستێکی باڵای لە پڕۆژەکانی خێرخوازی و خزمەتی نیشتمانیدا بووە، چەندین جار دووچاری دەربەدەری و بەندیەتی هاتووە، چونکە وەك ئەدمۆندس لە کتێبەکەیا "کورد و تورك و عەرەب"دا دەڵێ: پیاوێکە بەرێوەچوونی لەگەڵدا گرانە. هەوڵ دەدا خەڵکی گڕگرتوو بکا و ئاگری فیتنە خۆش بکات، لە ماوەی جەنگە مەزنەکەدا لەگەڵ موریدەکانی دەچێتە جیهاد شانبەشانی تورکەکان لە شعێبە و ناسریە دژ بە سوپای ئینگلیزی جەنگاوە(١٩١٥). پاشان لە کاتی باس لێوەکردنی مەسەلەی موسڵ بۆ بەرژەوەندی تورکەکان تێکۆشاوە، لە ئازاری ١٩٢٣ دەگیری و رەوانەی بەغدای دەکەن. لە یازدەی ئەیلولی ١٩٥٢ لە کەرکوك کۆچی دوایی دەکا. دەستخەتی ئایینی و سۆفیەتی لە دوا بەجی ماوە.

ئەدیبی کورد رەئوف خانەقا لە خزمە ناسراوەکانی بوو کەوا لە کەرکوك لە ٢٧ی ئایاری ١٩٧٣ لە تەمەنی حەفتا ساڵیدا کۆچی دوایی دەکات، شارەزایی لە ئەدەبی کلاسیکی کوردی هەبووە.

## عەبدولقادر زەهاوی

عەبدولقادر زەهاوی شاعیر کوڕی سەلیم کوڕی موفتی محەمەد فەیزییە. لە خوێندنگای سوپایی لە ئەستەنبول بە ئەفسەر دەردەچێ، بە پایەی رەئیس ئەوەل (رائید) لە سوپای تورکی خزمەتگوزار دەبێ، دوای جەنگی یەکەمی مەزن واز لە فەرمان دێنی و خۆی خەریکی ئەدەب و شیعردانان کردووە، لە هۆگرانی فەهمی مودەریس دەبێ. لە کانونی دووەمی ١٩٥٣ لە بەغدا کۆچی دوایی دەکات.

کوڕەکانی موفتی زەهاوی بەهرەوەر و هۆشمەند بوون لەوانە: عەبدولغەنی کوڕی محەمەد فەیزی کەوا ساڵی ١٨٦١ لەدایك بووە. هەروەك محەمەد ئەمین زەکی دەڵێ: لە پیاوچاك و

ئەدیبەکان بووە، بە تایبەتی لە زمانی فارسیدا. شاعیرێکی ئەندێشەبەرز و ناسك بووە، لەم بارەیەوەش جەمیل سدقی زەهاوی برای شاهیدە. محەمەد ئەمین زەکی ساڵی ۱۹۰۷ لە بەغدا شوناسی لەگەڵ پەیدا دەکات بەڵام مێژووی مردنەکەی باس نەکردووە.

## رەفیق حیلمی



لە پیاوانی کوردی رۆشنبیر رەفیق حیلمی کوڕی ساڵح عەبدوڵلا ناسراو بە حیلمی، لە ساڵی ۱۸۹۸ لە کەرکوك هاتۆتە جیهان، باوکی ئەفسەرێکی سوپای تورکی بووە. قوتابخانەی دووناوەندی لە سلێمانی و بەغدا تەواو دەکات، پاشان بەرەو ئەستەنبول دەروات، دەچێتە کولیەی سوپایی، کە جەنگە مەزنەکە بەرپا دەبێ دەگەرێتەوە سلێمانی، پاشان دوای کۆتایی جەنگەکە دیسان دەگەرێتەوە پایتەختی تورکی، دەچێتە خوێندنگای ئەندازیاری ساڵی ۱۹۲۰ تەواوی دەکات، چەندین زمان فێر بووە وەك: کوردی، عەرەبی، تورکی، فارسی، فەرەنسی. رۆشنبیرییەکی بەرفراوانی بۆ خۆی بەدەست هێناوە، لە تافی لاویەتیدا شیعری بە زمانی تورکی هۆنیوەتەوە. لە ئازاری ۱۹۲۱ دەبێتە مامۆستا، بۆ ساڵی ئایندە کە شێخ مەحمود حەفید حکومەتەکەی لە سلێمانی راگەیاند وتار و شیعری لە رۆژنامەی (رۆژی کوردستان) دا بڵاو دەکردەوە. لەسەر راسپاردەی شێخ مەحمود وتووێژی نهێنی لەگەڵ ئەفسەری تورکی عەلی شەفیق بەگ کردووە. دەگەرێتەوە پیشەی مامۆستایەتی، پاشان بەشداری لە راپەرینەکەی شەشی ئەیلولی ۱۹۳۰دا دەکات، بە مامۆستایەتی بۆ هەولێر دەگوازرێتەوە، دەبێتە پشکێنەری مەعاریفی سلێمانی (تەموزی ۱۹۴۳)، دوایی بەریوەبەری مەعاریفی لیوای بەسرە (ئەیلولی ۱۹٤٥)، ئینجا لیوای دیالە (تشرینی

دووەمی ١٩٤٦). پاش شۆڕشی تەموزی ١٩٥٨ دەیکەنە (مولحەق سەقافی) لە یەکێك لە باڵیۆزخانەکانی دەرەوەی عێراقدا[٣٥]. لە چواری ئابی ١٩٦٠ لە بەغدا جیهان بەجێ دێڵێ، لە سلێمانی بە خاك دەسپێردرێ. زۆر بەرهەمی کتێبدانانی هەبووە، لەوانەی کە بە زمانی عەرەبییە: الاکراد منذ فجر التاریخ الی سنه ١٩٢٠ (١٩٣٤). دراسات فی الادب الکردی المعاصر. "وەرگێڕدراوە" دراسات فی الشعر الکردی "وەرگێڕدراوە" (١٩٣٩)، مقالات (١٩٥٦). بە کوردیش ئەمانەی داناون: یاداشت (شەش بەش ١٩٥٦-١٩٥٨). شیعر و ئەدەبیاتی کوردی (دوو بەش ١٩٤١-١٩٥٦). دوای تەموزی ١٩٦٠ کتێبی ماتماتیك و جوگرافیای قوتابخانەکانی کردونەتە کوردی . داستانی رۆستەمی لە تورکییەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی. بەرهەمەکانی بە زمانی تورکی: *صفحات من القضية الكردية (١٩٣٥)*. رەفیق حیلمی لە پێشەوایانی راپەرینی رۆشنبیریەتی کوردیە، بڕوای بە مافی ژیانی دیموکراتی و سەروەری نەتەوەکەی خۆی هەبووە. لە پێناوی ئەوەشا تێکۆشاوە[٣٦].

---

[35]- رەفیق حیلمی سالی ١٩٥٠ "امین العاصمه" واتە سەرەك شارەوانی بەغدا و پلەی (ملحق سەقافی) لە تورکیا بینیوە.

[36]- رەفیق حیلمی هەڵبژێردرا بە سەرۆکی حیزبی هیوا لە کاتی دامەزراندنیدا (١٩٣٨) ، گەلێ خوێندکار و پیاوی رۆشنبیر و کوردپەروەری ئەوسای بە خۆیەوە گرت. پێش کۆتایی جەنگی دووەمی جیهانیدا حزبەکە توشی تەنگ و چەڵمەی ناوخۆیی هات، تا لە سالی ١٩٤٥ هەڵوەشایەوە و نەما، گەلێ لە ئەندامانی چوونە ناو حزبە تازە دامەزراوەکان، رۆڵێکی گرنگیان لە بواری خەبات و بەسەرهاتەکانی داهاتووی کوردستان بینی. (وەرگێڕ).

## عەبدوڵلا گۆران



شاعیری کورد عەبدوڵلا گۆران کوڕی سلێمان بەگ هۆشیار ناسراوە بە گۆران ساڵی ١٩٠٤ لە هەڵەبجە هاتۆتە دنیا هەر لەوێش دەخوێنێ. پاشان دەچێتە خانەی مامۆستایان لە کەرکوك، بەڵام خوێندنەکەی تەواو ناکات دەگەڕێتەوە هەڵەبجە و دەبێتە مامۆستا(١٩٢٥-١٩٣٧)، لە هەمان کاتیشدا لە شارەزایی و فێربوونی زمانی عەرەبی، فارسی، تورکی، ئینگلیزی بەردەوام دەبێ، لە ساڵی ١٩٣٧ دەبێتە فەرمانبەر. لەکاتێکا شیعری هۆنیوەتەوە کە تەمەنی لە سێزدە ساڵی تێپەری نەکردبوو، شیعری چاولێکەری کوردی و شاعیری ئینگلیزی (شیللی) کارتێکەری بوون، شیعرەکانی لە سەرەتاوە ڕۆمانسی پاشان بۆ ریالیزمی شۆڕ بۆتەوە، سەردانی ناوچەکانی کوردستانی کردووە، هەڵبەتە سروشی هۆنینەوەی شیعری لە دیمەنی چاو ئەنداز و ژیانی خەڵکەکەوە هاتووە، پێوەندیدار دەبێ بە بزوتنەوەی تێکۆشانی پێشکەوتنخوازەکان، لە پێناو ئاشتیخوازی جیهانی کارمەند بووە، بووەتە بەرپرسی ڕۆژنامەی - ژین (١٩٥٢-١٩٥٤). بەشداری لە یەکەمین کۆنگرەی ئاشتیخوازانی عێراقدا کردووە (١٩٥٤) شیعرەکانی ڕووی بەرەو چەپ بردووە دەگیرێ و دوور دەخرێتەوە، لە زیندانەکانی، کوت، بەعقوبە، نوگرەسەلمان و سلێمانی بەند کراوە، پاش شۆڕشی تەموزی ١٩٥٨ بەردەدرێ. گۆڤاری شەفەق دەردەچوێنێ لە سەرەتای ساڵی ١٩٦٠ دەچێتە بەغدا لە ڕۆژنامەی ئازادی کار دەکات لە ١٨ی تشرینی دووەمی ١٩٦٢ لە سلێمانی جیهان بەجێ دێڵێ.

چوار بەرگ لە شیعرەکانی بلاّو کراوەتەوە، بەهەشت و یادگار (١٩٥٠)، فرمێسك و هونەر (١٩٥٠)، سروشت و دەرون (١٩٦٨) لاڤك و پەیام (١٩٦٩)، هەروەها "پەیام" (١٩٥٤). نامەی کورد بۆ میهرەجانی بۆخارست (١٩٥٤)... تا دوایی. شاعیری میللی محمد سالح بەحرالعلوم دەڵێ:

*اذا الدهر یبقی جانب الخیر خالدا فگوران باق فی جمیع جوانبه*

گۆران لەو شاعیرانەیە کە ئەدەبی کوردیان لە شێواز و ناوەرۆکدا نوی کردۆتەوە، کۆمەڵیك لە شیعرەکانی ئاوازی بۆ سرودی خوێندکار و قوتابخانەکان بۆ داندراوە، جگە لەمەش شیعری بۆ شکۆداری برایەتی کورد و عەرەب و رووداوە نیشتمانیەکان داناوە، لە شیعرە وەرگێڕدراوەکەی بۆ عەرەبی:

(برای عەرەب)

چەخماخەی شمشێری زۆردار – تا لەو خوێنەدا ئاوابوو
کە لە ملی باوکت باوکم – رژایە سەر ملی مێژوو

هەروەها ئافرەت و جوانی (وەرگێڕانی سەلام عیرفان) :

بە ئاسمانەوە ئەستێرەم دیوە – لە باغچەی بەهار گوڵم چنیوە
شەوێمی درەخت لە رووم پژاوە – لە زەردەی زۆر کەل سەرنجم داوە
کام بەرزی جوانە وەك بەرزی بالاّی؟ کام تیشك ئەگاتە تیشکی نێو نیگای؟
کام تاسە کام مەیل کام چاوەنواڕی؟ تەلیسماویە وەك هی دڵداری

ئەدیبی کورد محەمەد مەلا کەریم دەڵێ: لە گۆرانم پرسی رای لە دووا رۆژی شیعر لە ناو شەپۆلی پێشکەوتنی زانست و بەرفراوان بوونی شارستانیەتدا چۆنە؟ وای پێشبینی کرد کە شیعر نامرێت چونکە بەشێکە لە جەرگەی ژیانی مرۆڤەوە هاتووە. راستی ئەوەیە وەك گۆران دەڵێ: ئەگەر ئینسان لە نیگەران و ئازار رزگاری بوو ئەوا رەورەوەی گۆڕانکاری رادەوەستێ.

# مێژوونووسان



مێژوونووسان و رۆشنبیرانی کورد لەم سەردەمەی دوایەدا بایەخیان بە لێتۆژینەوەی مێژووی نەتەوەکەیان داوە و تۆماریان کردووە، لەوانە حوسێن حوزنی موکریانی ١٨٦٦-١٩٤٧، لە مەهاباد هاتۆتە دنیا، کتێبەکانی لە حەلەب و رەواندوز و بەغدا بڵاو کردۆتەوە. بەرهەمەکانی: بەخێوکردنی کرمی ئاوریشم (١٩٢٨). مێژووی ئیمارەتەکانی کورد (١٩٢٩-١٩٣١) ناودارانی کورد (١٩٣١). کورد و نادرشا (١٩٣٤). کوردەکانی زەند (١٩٣٤). میرەکانی سۆران (١٩٣٥). کوردستانی موکری (١٩٣٨) هتد... ئەو بەرهەمانەشی هەمووی بە کوردیە.

## مەلا جەمیل رۆژ بەیانی



لە گوندێکی ناوچەی قەرەحەسەن لە لیوای کەرکوك لەدایك بووە. ئەم کتێبانەی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی: مێژووی سلێمانی هی محەمەد ئەمین زەکی (١٩٥١)، شەرەفنامە (کە مێژووی دەوڵەت و ئیمارەتەکانی کوردە) دانەرەکەی شەرەف خانی بتلیسیە (١٩٥٣). یاداشتەکانی رەفیق حیلمی (١٩٥٧)، نامە پیرۆزەکان هی سلێمان فایەق (١٩٦٣).

## شوکری فەزلی

ئەدیبێکی عەرەب کە دەچێتە سەر عەشیرەتی (*الكروية القيسية*) بەڵام سەردەمی منداڵی لە سلێمانی بەسەر بردووە، زمانی کوردی و تورکی و فارسی خوێندووە. ماوەیەك لە رۆژنامەگەری کوردی کاری کردووە و لەسەر کوردی نووسیوە، ئەگەر بە رەچەڵەکیش نەبووبی بە دڵ و بە گیان و رەوانی چۆتەوە سەر کورد.

شوکری کوڕی ئەحمەد ئاغا لە سەردارانی (کوڕەویە) لە ساڵی ١٨٨٢ لە بەغدا هاتۆتە دنیا. کە دەگاتە تەمەنی پێنج ساڵی ساڵح ئەفەندی خاڵی کە سەردەستەی نووسەرانی ئۆردوگای سلێمانی دەبێ لەگەڵ خۆی دەیباتە وڵاتی کوردان، زیاتر لە چواردە ساڵی لێ دەمێنێتەوە، لەو ماوەیەدا زانیاری و زمانەکان دەخوێنێ. پاشان دەگەڕێتەوە بەغدا دەچێتە قوتابخانەی روشدیەی سوپایی، ماوەیەك مامۆستایەتی دەکا، ساڵی ١٩٠٨ روو دەکاتە ئەستەنبول، دوو ساڵ لێی نیشتەجی دەبێ، لەو ماوەیەدا لە رۆژنامەکانی تورکی کارمەند

دەبێ، دەگەڕێیەوە بەغدا، پەیوەندی بە شێخ عەبدولوەهاب نائیب دەکا زانیارییەکانی (جادە) ی لێوەردەگرێ. هەندێك لایەنی زمانی ئینگلیزی و فەرەنسیش فێردەبێ. شیعری بە عەرەبی و کوردی و فارسی داناوە، داواکاری بیروڕای ئازاد بووە، رەخنەی لە رەفتاری دەسەڵاتدارانی فەرمانڕەوا گرتووە، لە کەرکوك زیندانی دەکرێ. کە دەستوری عوسمانی راگەیەندرا ناحەزی و دژایەتی (ئیتحاد و تەرەقی) لە سەردەمی والی بەغدا ئەحمەد جەمال بەگ دەکات (جەمال پاشا دوایی بە خوێنڕێژ ناونرا) لەگەڵ تیپێکی تری پیاوانی بەغدا دەیانخاتە بەندیخانە و دەیەوی بیانداتە دیوانی جەنگی عورفی لە پایتەختی تورکی. بەڵام سەرکردەی سوپا محەمەد فازل پاشای داغستانی پێیان رادەگا و بەریان دەدەن، ساڵی ١٩١٧ دوای داگیرکردنی بەغدا دەیکەنە باش کاتبی مەحکەمەی سوڵح، و دەبێتە ئەندام لە لێژنەی وەرگێڕانی یاساکانی تورکی بۆ سەر زمانی عەرەبی، لە ١٩٢١ دەگوازرێتەوە بە نووسەر لە دیوانی ئەنجومەنی وەزیران و هەتا پایانی ژیانی لێی بەردەوام دەبێ. هەروەها پەنایان بۆ ئەو بردووە لە وەرگێڕانی یاسا و نووسینی رەسمی و دانانی کتێبەکانی خوێندن بە زمانی کوردی.

لە یەکی حوزەیران ١٩٢٦ لە بەغدا گیانی لەدەست داوە. لە شاعیران: مەعروف رەسافی و جەمیل سدقی زەهاوی و هیتر شیوەنیان بۆ کردووە. دوای داگیرکردنی بەریتانیا شوکری فەزلی دەبێتە نووسەر لە رۆژنامەکاندا لەوانە: رۆژنامەی (العرب) و دوو رۆژنامە فارسییەکە.

## عەبدولقادر رەشید ناسری

شاعیری کورد عەبدولقادر کوڕی رەشید کوڕی ئیسماعیل ساڵی ١٩٢٠ لە سلێمانی هاتۆتە دنیا. باوکی بۆ ناسریە رەو دەکا و لێی نیشتەجی دەبێ، نازناوی (ناسری) پێلکاوە، عەبدولقادر خوێندنی دواناوەندی لە بەغدا تەواو دەکا، دەستی داوەتە شیعردانان،

پەیوەندی بە محەمەد مەهدی جەواهیری و گەورە ئەدیبانیترەوە دەکا (*بلاغة و منطق*) لای شێخ عەبدولقادر خەتیب و خوتبەخوێنی مزگەوتی ئیمامی ئەعزەمی خوێندووە، بە کاری نووسەری لە رۆژنامەکاندا هەڵساوە، وەك رۆژنامەی "الرائدوالنداء و الاوقاف البغدادیە"، ساڵی ١٩٤٨ لە ئیسگە دەبێتە فەرمانبەر، لە ساڵی ئایندەدا بۆ تەواوکردنی خوێندنی دەینێرنە پاریس، بەڵام دوای ساڵێك لەبەر هەندێك هۆی ناچاری دەگەرێتەوە، دوای ئەوە فەرمانبەریەتێکی بچووکی لە شارەوانی بەغدا دەست دەکەوێت، هەر ئەوەندە پێی دەژیا، ئەدەب دەکاتە پیشەی خۆی، ئازاری دەرونی تینی لی دەستێنێ. مەی خواردنەوە دەکاتە فەرامۆشی و سێبوری خۆی، تا ئەوەی هێزی لەبەر دەبڕی و عیزەتی نەفسی ریسوا و دەماری گیانی سست و لاواز دەکات، لە ١٥ی ئایاری ١٩٦٢ لە بەغدا سەری ناوەتەوە، ناسری شاعیرێکی خۆڕسکی رەسەن و شەرمن و بە ئەدەب بوو ساڵی ١٩٣٩ دیوان (الحان الالم) ی دەرچوواند، شانۆگەری "*ضحایا المجتمع*" و دیوانی "*صوت فلسطین*" جگە لە مەلحەمە و شانۆگەری و وتارەکانیتری کە لە رۆژنامەکانی عێراقی و عەرەبیدا بلاوکردۆتەوە، لە غەزەل بالا دەست دەبێ هونەر و وردەکاریەکی زۆری تێدا دەرخستووە، دیوانە دەستخەتەکانیتری لە پاش بەجێماوە کە نەیتوانیوە بە چاپیان بگەیەنێ، جۆشی هەستی لەناو هێنانی ئافرەت و مەیدا خرۆشاوە، لە ئەڤینیدا وەك پەپولەیەکی نێو گوڵی باغان سووری خواردووە، باری قورسی ژیان دایتەپاند، شیعر گەیاندیە لوتکەی بەرزی و نەمری، نەمریەکی ئەڤینداری عاشق.

*احبك و الهوى وتر صدوح وانسام معطرة و روح*

*ومجمدة دم العشاق فيها بخور كلما احترقت تفوح*

*و فردوس من المتع الغوالى على شطانة يحلو الصبوح*

*احبك، هل علمت، سلي دموعي على كفيك لو سئلت تبوح*

*احبك، هل علمت بأن روحي على شفتيك ذائبة تنوح*

*و أني قد عصرت دمي غراما فأزهر من دمي طلح وشيح*

## حوسێن مەردان

شاعیری بێنەوا و ناهومێد پێشەوای ئەدەبی والاّ حوسێن مەردان لە خێزانێکی کوردنەژاد ساڵی ١٩٢٧ لە بەعقوبە هاتۆتە جیهان. بە ساوایی لە خوێندن دادەبڕی و دێتە بەغدا. لە بواری رۆژنامەگەریدا کار دەکا، بەر لەوەی تەمەنی لە بیست ساڵ تێپەڕ بوبێ، یەکەم کۆمەڵە شیعری لە ساڵی ١٩٤٩ لە ژێر ناوی "*قصائد عارية*" بە چاپ گەیاندووە، هاتووە هەستی پەشۆکاوی دەرونی و ناهومێد بوونی خۆی تێدا دەربڕیوە. گڕی ئارەزوو و هەڵچوونی سۆزی لی بەدی دەکرێ، کۆمەڵێکی پڕ جۆش تری بەدوودا هات کە (*ازاهير الشر*) ی شاعیری فەرەنسی شارل بۆدلێر (١٨٢١-١٨٦٧) مان دێنێتەوە یاد. حوسێن مەردان ساڵی ١٩٥٢ سەبارەت بەوەی گۆیا شیعرەکانی والاّن (*عارية*) حکوم دەدرێ، هەروەك بۆدلێر لە ناوەراستی سەدەی نۆزدەمیندا بە هۆی شیعرە بێپەرواکانی لە پاریس حکوم دراوە. شاعیرمان لە پێناوی باجی ئەدەبی کە بەسەریاندا سەپاند ماوەیەك لە بەندیخانە بەسەر دەبات، مەردان هەژار و کەساس بەو موچە کەمەی دەژیا کە لە کاری پەیامنێری و نووسینەکانی لە رۆژنامەکاندا دەستی دەکەوت، تا لە تشرینی یەکەمی ١٩٧٢ لە بەغدا سەر دەنێتەوە، بەرهەمەکانی: *قصائد عارية (١٩٤٩)، اللحن الاسود (١٩٥٠)، رجل الضباب (١٩٥١)، صور مرعبة (١٩٥١)، عزيزتي فلانة (١٩٥٢)، نشيد الانشاد(١٩٥٥)، هلاهل نحو الشمس (١٩٥٥)، الربيع و الجوع، مقالات فى النقد الادبى (١٩٥٥)، رسالة من شاعر الى رسام (١٩٥٦)، الارجوحة هادئة الحبال، العالم تنور، طراز خاص.*

## عوسمان پاشای جاف



عوسمان پاشا کوڕی محەمەد پاشا کوڕی کەیخوسرەو بەگ کوڕی سلیمان بەگ کوڕی زاهیر بەگ لە سرۆکەکانی عەشیرەتی جافی کوردە، سالی ١٨٤٧ هاتۆتە دنیا. حکومەتی ئیرانی لە سالی ١٨٧٣ کردیە فەرمانڕەوای جوانرۆ و زەهاو، پاشان بەپێی پەیمانێك کە لەگەلّ حوکمەتدا مۆری کرد لەگەل باوکی و عەشیرەتەکەی دەگەرێتەوە ولاّتی عوسمانی (١٨٧٧). باوکی دەکەنە قایمقامی هەڵەبجە، عوسمان بەگیش دەبێتە یاریدەدەری کە باوکی لە سالی ١٨٨٢ دەکوژرێ، مەحمود پاشای برای جێگای لە سەرۆکایەتی و قایمقامی دادەگرێتەوە، تا ئەوەی عوسمان پاشا سالی ١٨٨٩ هەردوو پایەکە لە جێگای براکەی دەبینێ، نزیکەی بیست سالّ بەو ئەرکە هەڵدەستێ، حکومەتی عوسمانی پایەی پاشایەتي(میری میران) ی پی بەخشیوە، هەروەك لە پێشتر بە باوك و برای بەخشیبو. سالی ١٩١٠ لە هەڵەبجە کۆچی دوایی دەکا.

عادلە خانمی خێزانی کە لە بنەماڵەیەکی فرمان ڕەوایانی ئەردەلانیە ناوبانگی بە هۆشمەندی و دەسەلاّتداریەتی بەرفراوانی دەرکردبوو، مەیلی ئیرانی هەبوو، ئەو عادلە خانمەش کچی عەبدولقادر ساحێبقڕان زادەیە، سالی ١٨٥٩ لە سنە هاتۆتە دنیا، شوو بە عوسمان پاشا دەکا (١٨٩٥) لە سالی ١٩٢٤ لە هەڵەبجە مالّ ئاوایی لە ژیان کردووە. حکومەتی بەریتانی دوای داگیرکردن سەبارەت بە خزمەتگوزاریەکانی نازناوی (خان بەهادر) ی پی دەبەخشێ، کە نازناوێکی شکۆدارانەی هیندیەکانە.

مێجەر ئیدمۆندس ناوی بە (شاژنی شارەزووری تاج لەسەر نەکراو) بردووە. محەمەد ئەمین زەکی لە مێژووی سلێمانیدا دەڵێ: عادلە خانم بەسەر عوسمان پاشادا زاڵ بوو، دەستی بەسەر هەموو کاروباری شارەزوردا گرتبوو، دەسەڵاتی تەواوی بەسەر عەشیرەتەکانی جافدا هەبوو، هەر خۆی هەموو کێشەو گیروگرفتێکی یەکلا دەکردەوە، بەندیخانەی تایبەتی هەبوو، بازاڕێك و سێ خانووبەرەی گەورەی لە هەڵەبجە بنیادنا، لەسەردەمی ئەودا گوندی هەڵەبجە بووە شارۆچکەیەکی ئاوەدان و قەشەنگ. بەڵام ئاڵوگۆڕی نامە و کاروباری هەموو بە زمانی فارسی بوو. هەروەها لە ئەردەڵانیش گوی دێری فەرمانەکانی بوون.



ستیڤن لونغریغ لە کتێبەکەیدا"عێراق ١٩٠٠_١٩٥٠" دەڵێ: عادلە خانم سەرداریەتی خێڵ و عەشیرەتی جافی هەردوولای سنوری عێراق و ئێران بەهاوبەشی لەگەڵ عوسمان پاشای هاوسەری و مەحمود پاشای برای عوسمان پاشا دەکرد. لە روی کاربەدەستانی عوسمانی دەوەستان، باج و خەراجیان نەدەدا، کۆڵەکەو ستونی تەلەفۆنەکانیان ریشەکێش دەکرد.

کە عوسمان پاشا ساڵی ١٩١٠ کۆچی دوایی دەکات، ژنەکەی دەسەڵاتداریەتی خۆی لە هەڵەبجەدا پاراست. تەنانەت کە شێخ مەحمود لە ئایاری ١٩١٩ شۆرشی لەسەر کاربەدەستانی بەریتانی نایەوەو ئەفسەری ئینگلیزەکان دەگرێ، ئەفسەری سیاسی بەریتانی توانی بە هۆی ئەم خاتونەوە لە هەڵەبجە رابکا. مێجەر سۆن دەڵێ: عادیلە خانم سەردارێکی دانا بوو، رابەری خەڵکی ناوچەکەی دەکرد زۆریان لا خۆشەویست بوو، لەگەڵیان ئەوپەری تەبا بوو، ئافرەتێکی ناسك و پڕسۆزو چاك بوو.

## مەحمود پاشای جاف

مەحمود پاشای برای عوسمان پاشا لە ساڵی ١٨٤٥ لەدایك بووە، جێگای باوکی لە سەرۆکایەتی عشیرەتی جاف و قایمقامیەتی قەزای هەڵەبجە گرتەوە (١٨٨٢)، بەڵام نایکاو رووداوەکاتە ئاستانە، دوای سی ساڵ بە نهێنی دەگەڕێتەوە عێراق، پاشان بۆ جاری دووەم دەچێتەو ئەستەنبۆڵ، دیسان دەگەڕێتەوە هەڵەبجە، لەوی لە ١٥ نیسان ١٩٢١ کۆچی دوایی دەکات. شاعیر بووە بە هەردوو زمان: کوردی و فارسی شیعری هۆنیوەتەوە، خواناس و ئاین پەروەر بوو، گەلی مزگەوتی بنیاد ناوە. لە کوڕە ناودارەکانی عوسمان پاشا: تاهیر بەگ وئەحمەد موختار بەگ و عیزەت بەگ بوو.

## مەحمود خدر

لە سەرۆکەکانی هەماوەندە یاخی و ڕێگر، دنیای بەسەر خراپەدا وەرگێڕابوو، دەوڵەت ناچار دەبێ هەڵمەتی سوپایی بۆ سەرلە دوونان و تەفروتونا کردنی بنێری، پاشان مەحمود خدر لە ڕێگای ئیسماعیل پاشاوە هانا دێنێتە بەر دەوڵەت، لەگەڵ دەست و پێوەندو چەکەکانیانەوە خۆیان بەدەستەوە دەدەن. دوایی ئەوە دەیکەنە سەرکردەی دەرەك (جندرمە) لە موسڵ. هەر لەوێش لە ساڵی ١٩٢٣ کۆچی دوایی دەکات.

عاباس عەزاوی لە بەشی هەشتەمی مێژووەکەیدا ئەویش لە مەحمود مەلاحی وەرگرتووە دەڵێ:(مەحمود خدر پیاوێکی رووخسار کۆکو ناسك بوو، بە چەتە وئەشقیاکان نەدەچوو) تێکەڵاوی بەهۆی ژن و ژن خوازیەوە لەگەڵ بنەماڵەی تۆحەلە کە لە ئاغاکانی موسڵ بوون پەیدا دەکا. لە ئاکامی کوشتنی شێخ سەعیدی باوکی شێخ مەحمود لە ١٩٠٩ هەڵوێستێکی مەردانەی نواند بە پێچوانەی پێش بینی خەڵکەکەوە.

## تاهیر بەگ

تاهیر بەگی شاعیر بە هەر سێك زمان (کوردی و فارسی وتورکی) شیعری داناوه. دیوانە شیعریەکەی لە سلێمانی (١٩٣٦) و لە بەغدا (١٩٣٧) و لە هەولێر (١٩٦٦) چاپ کراوە. لە هەڵەبجە هاتۆتە جیهان لە سلێمانی خوێندویەتی، ساڵی ١٩٣٧ ماڵ ئاوایی لە ژیان دەکا،بەڵام عیزەت عوسمان جافی برای بە نوێنەری سلێمانی بۆ ئەنجومەنی دامەزراندن هەڵبژێردراوە (١٩٢٤)، دوایی بە نوێنەر لە ئەنجومەنی نوێنەراندا (کانونی یەکەم ١٩٣٧) سەرلە نوی لە حوزەیرانی ١٩٣٩ هەڵدەبژێردرێتەوە، لە تشرینی یەکەمی ١٩٤٣ هەتا کۆچی دوایی بە ئەندامیەتی پەرلەمان دەمێنێتەوە (یەکی ئاب ١٩٤٥).

## رەشید پاشای زەهاوی

محەمەد رەشید کوری محەمەد فەیزی زەهاوی موفتییە برای جەمیل سدقی شاعیرە. لە ٢٨ی کانونی دووەم ١٨٤٨ لە بەغدا هاتۆتە دنیا. پیاوێکی ئەدیب و هۆشمەند و هێمن بوو، دەچێتە ناو فرمانی بەرێوەبەرایەتی، دەیکەنە قایمقام لە قەزاکانی عێراق و سوریادا، جا ئەندامی مەحکەمەی ئیستینافی بەغدا، پاشان دەبێتە بریکاری موتەسەریفی لیوای کەربەلا (١٩٠٦)، دوایی موتەسەریفی لیوای مونتەفیك. لە ٢٩ی کانونی دووەمی ١٩١١ لە بەغدا جیهان بەجی دێڵێ. جەمیل سدقی برای شیوەنی بۆ دەکا دەڵێ:

*يا ضريحا فيه الرشيد ينام    مطمئنا مني عليك السلام*

*اكبرت ليلة الرشيد الليالي    ومضت في اكبارها الايام*

*هد ركن البيت الزهاوي خطب    جلل جاءهم ورزء جسام*

عەبدول رەحمان بەننا دەڵی:

*صبرا جميلا فالزمان يجور    والعمر فان و الحياة غرور*

*من قال ان الشمس تغرب في الثرى    والبحر في طي التراب يغور*

*و البدر يسمى في المقابر    ومن العجائب للبدور قبور*

لەسەردەمی بەڕێوەبەرایەتیەکەی ئەودا مانگرتنی بازرگانە ئێرانیەکان لە کەربەلا سەبارەت بە سەپێندراوی باج و خەراجی قورس بەسەریاندا روو دەدات، زیاتر لە پەنجا رۆژ لەسەر هەندێك لە شەقامەکان دادەنیشن، بلاوەی لێ ناکەن، نە ئامۆژگاری زانایان و نەهەڕەشەی کاربەدەستان سوودی نابێ. ئیتر لە تشرینی دووەمی ١٩٠٦ پۆلیس گوللە بارانیان دەکات، حەفتا کەسیان لێ دەکوژری و ژمارەیەکی زۆریش بریندار دەبن، بە فەرمانی ئاستانە لێتۆژینەوە لەبەسەرهاتەکەی دەکرێ، والی بەغدا مەجید بەگ لی دەخرێ.

## عەبدوڵڵا موخلیس رەسولزادە

عەبدوڵلا موخلیس بەگ رەسول پاشازادە ساڵی ١٨٥٩ لە رەواندوز هاتۆتە دنیا. لە ساڵی ١٨٧٣ لە نوسینگەی لیوای کەرکوك دادەمەزرێ، تا ئەوەی دەبێتە سەرۆکی نوسینگەکە. فرمان گۆڕکی دەکات، لە کۆیەو رەواندوز دەبێتە تۆژەرەوە (١٨٩٠). دەگوازرێتەوە بۆ فرمانی بەرێوەبەرایەتی، لە قەزا جیاکاندا دەبێتە قایمقام و مومەیز، لە فەرمانگەی ویلایەتی موسڵ بە نوێنەری هولێر بۆ ئەنجومەنی دامەزراندن هەڵدەبژێردرێ(١٩٢٤)، پاشان نوێنەر لە پەرلەمان (١٩٢٥-١٩٢٨). دوای ئەوە جیهان بەجێ دێڵێ.

## حەمدی پاشای بابان

لە پیاوە ناودارەکانی بنەماڵەی بابانە، ئەو محەمەد حەمەدی پاشایە کوڕی حوسێن بەگ کوڕی محەمەد پاشای کوڕی خالید پاشا کوڕی ئەحمەد پاشای کوڕی بەکر بەگ کوڕی سلیمان بەگ بابان زادەیە، ساڵی ١٨٤٦ لە سلێمانی هاتۆتە دنیا بە منداڵی رووخانی ئیمارەتی بابان دەبینی، هێنایانە بەغدا، دەبێتە فەرمانبەر لە دیوانی ویلایەتدا، دەیکەنە داواکاری گشتی لە موسڵ پاشان لە بەیروت، دوای پشکێنەری دادوەری (عدلیە) لە

هەرسی ویلایەتەکانی عێراقدا، ئینجا موتەسریفی لیوای حودەیدە لە یەمەن دوایی لە عەممارە(١٩٠١-١٩٠٢) و مونتەفیك(١٩٠٦).

دەبێتە وەزیری بی وەزارەت لە حکومەتی کاتی نەقیب دا (٢٥ تشرینی یەکەم ١٩٢٠)، بەڵام ئەم پایە بەلاوە دەنی و نایکا. وەزیری مێژوو نووس محەمەد ئەمین زەکی لە کتێبەکەیدا(مێژووی سلێمانی و دەوروبەری) باسی دەکاو دڵێ: بایەخی بە لێکۆڵینەوەی یاساکان دەداو چووەتە بنجوبناوانی، بەرەوشت بەرزی و پیاوچاکی ناوی بردووە، ستایشی شارەزایی و زۆرزانی و بەهرەوەری سیاسی و راستی راو بۆچوونەکانی دەکات.

## محەمەد ساڵح میللی

محەمەد ساڵح کوڕی حاجی عەلییە، دەچێتەوە سەر هۆزی میللی کە لە عەشیرەتە گەورەکانی کوردە، بنچینەی جێنشین بوونیان ناوچەکانی شامە.

تەیموور پاشای میللی لە دەوروبەری (ڕقە) لە دەوڵەتی عوسمانی هەڵدەگەڕێتەوە، ساڵی ١٧٩٠ بۆ تەمبێ کردنی داوا لە سلێمان پاشا والی بەغدا دەکرێ، تەیموور خۆی دەرباز دەکاو هەڵدێ، پاشان دێتە بەغدا پەنا دەباتە بەر والیەکەی (١٧٩٤). کە ڕەزامەندی دەوڵەت لە ١٨٠٠ وەردەگرێ، دەیکەنە فەرمان ڕەوای (ڕقە)... لەو سەردەمەی دوایەدا ئیبراهیم پاشا سەرداری گشتی هۆزەکە لە زەمانی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم دا ناوبانگی دەرکرد، سوڵتان ناوچەی دیاربەکر و ئورفە و ماردینی دەداتی (١٩٠٦-١٩٠٧)، کە دەستور ڕاگەیەندرا دژی ئیتیحادیەکان ڕاپەری، لە چواردەوری شامەوە هەڵمەتیان هێنایە سەر، لە تشرینی دووەم ١٩٠٨ بەسەر عەشیرەتەکانیدا زاڵ دەبن، لەو ئانەشدا ئیبراهیم پاشا کۆچی دوایی دەکات.

محەمەد ساڵح میللی، لە بەغدا لەدایك دەبێ لای محەمەد فەیزی زەهاوی و عەبدوڕەحمان قەرەداغی و زانایانی سەردەمی خۆیدا دەخوێنێ، دەبێتە نووسەر لە مەحکەمەی شەرعی، لە زۆر جێگا قازی دەبێ، ساڵی ١٩٠٩ قەزای دیوانیەی پی دەسپێرن، ماوەیەك بە ئەرکی

بریکاری موتەسەریفی لیواکە هەڵساوە (١٩١١)، پاشان لە هەمان ساڵدا بە هیوای دەستکەوتنی پایەی موتەسەریفی بەرەو ئەستەنبۆڵ دەروا، کە لەوە ناهومێدی دەبێ رووەدەکاتە پاریس، بانگهێشت بۆ (لامەرکەزیەت) دەکات، دوایی دەگەرێتەوە بەغدا، کە جەنگی گشتی لە کۆتایی ساڵی ١٩١٤ بەرپا دەبێ ساڵح میللی لە ئەستەنبۆڵ دەبێ، لەگەڵ ساڵح محێیەدین گەیلانی ئەندامی ئەنجومەنی پیران و هیتر بەوەفد بۆ بەغدایان دەنێرن بۆ مەبەستی بانگ داهێشتنی عەشیرەتەکان بۆ جیهاد و پشتگیری کردنی دەوڵەتی تورکی. دەیگەرێننەوە بە بریکاری موتەسەریفی دیوانیە (١٩١٦)، پاشان کە ئینگلیزەکان شارەکە داگیر دەکەن لە حوزەیرانی ١٩١٧، لەوی دەیکەنە حاکم. دوای ئەوە بووەتە سەرۆکی ئەنجومەنی ئەوقاف (نیسان ١٩٢٢)، ئیتر خۆی لەکارو فرمان دەست بەردار دەکات، پیرێکی پەك کەوتە دەبێ، لە بەغدا لە ١٩٤٢ سەری ناوەتەوە، پیاوێکی دنیایی و ئاینی و ئارەزودار و مەرد و بە هیمەت بووە.

کوڕەکەی عومەر حیفزی میللی (١٨٩٢-١٩٧٠) پایە بەرزەکانی دادوەری و بەڕێوەبەرایەتی بینیوە، پشکێنەری دادوەری بووە (١٩٤٢)، موتەسەریفی لیوای دیالە (١٩٤٢)، دوایی هی کەربەلا (١٩٤٣) ئینجا کوت (١٩٤٤)، بە پشکێنەری بەڕێوەبەرایەتی دەگوازرێتەوە (١٩٤٦)، بە (مدون قانونی) دەیگەرێننەوە وەزارەتی داد (١٩٤٨)، دوایی بەڕێوەبەری گشتی دادوەری (١٩٥٠)، پاشان ئەندامی مەحکەمەی تەمیز (١٩٥٣) مستەفا عەلی پێی راگەیاندم: کەوا عومەر حیفزی پێی گوتووە: مێژووی لەدایك بوونم لەناوەکەم دایە. باوکم ئەو ناوانەی بۆ هەڵبژاردووین کە مێژووی ساڵی لەدایك بوونمان بگرێتە خۆی، ئەمەشی بۆ هەموومان پەیڕەو کردووە، تەنیا فازلی برای بچوکمان نەبی چونکە لە کاتی هاتنە دنیای دا باوکم لە ئەستەنبۆڵ دەبێ، عومەر حیفزی بەپێی (الجمل) دەکاتە (١٣٠٨) ئەوەش ساڵی هاتنە جیهانیەتی.

# حەمدی بەگ بابان[37]

ئەحمەد حەمدی بەگ کوڕی محەمەد ڕەشید پاشای ناسراو بە خدێو کوڕی سلیمان پاشای کوڕی خالید پاشای بابانە، لە دەورووبەری ساڵی ١٨٧٠ هاتۆتە دنیا. لە کۆلێجی (الملکیه الشاهانیه) لە ئەستەنبۆڵ خوێندویەتی، داواکاری بیروڕای ئازاد بووە، لەسەردەمی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمدا زیندان دەکرێ، کاتی ڕاگەیاندنی دەستور لە ساڵی ١٩٠٨ بەردەدرێ، بە نوێنەری کۆمەڵەی (ئیتیحادو ترەقی) دەنێردرێتە بەغدا، بەڵام بە گوێرەی "ریشارد کوك" لە کتێبەکەیدا (بغداد مدینه السلام) وەرگێڕانی (فوئاد جەمیل و دکتور مستەفا جەواد)، دەڵی حەمدی بەگ سەیر دەکا کۆمەك خوازی و پشت بەستن بە ئەشراف و ناودارە پارێزگاکانی بەغدا زەحمەتە، کە بەهۆی بنەمای ئاینی بەرهەڵستکەری شۆڕشە تورکییەکە بوون، مەگەر بە ڕواڵەت ئەگینا پێی قایل نەبوون، کە جەنگە مەزنەکە کۆتایی پێهات ماڵەکەی لە بەغدا بووە مەڵبەندی پێك گەیشتنی پیاوانی کورد، پەیوەندییەکی بەتینی لەگەڵ نیشتیمان پەروەرانی کوردی سلێمانی پەیدا کردبوو،کاربەدەستانی بەریتانیا بۆ مەبەستی ئارام بوونی ناوچەی کوردستان ساڵی ١٩٢٠ ڕوویان لە حەمدی بەگ ناکە سەردانی سلێمانی بکا، کە فەرمان ڕەواکەی مێجەرسۆن بوو، بە پێنجوێن و هەڵەبجە و ڕانیەشدا گەرا، پاشان دەگەڕێتەوە بەغدا دوور کەوتنەوەو لاتەریکی لە کاری سیاسی بەباش زانیوە. کاتی زەویەکانی لە حارسیەی ڕۆژئاوای بەغدا ڵی زەوت کراو دەستی بەسەردا گیرا بۆ مەلیك فەیسەڵی یەکەم، دوای ئەوە حەمدی بەگ ناسرا و لەبری ئەوەشا

---

[37]– بە پێی ئەو بەڵگەنامە نەهێنیانەی کە لە کاتی خۆیدا بڵاو کراونەتەوە. مەلای گەورە و جەمیل ئاغای حەوێزی یاداشتێکیان لە ساڵی ١٩٢٠ دایتە کەپتان های ئەفسەری بەریتانی لە کۆیە تێیدا هاتووە دەڵێ: حەمدی بەگ بابان پیاوێکی لێوەشاوەیە شایستەی ئەوەیە بکری بە فەرمانڕەوای گشتی دامودەزگای حکومەتێکی سەربەخۆی کورد. لە بارێکا ئەگەر بەریتانیا ناڕەزایی و دڵنیگەرانیان لە شێخ مەحمود هەیە. چونکە لە بنەماڵەیەکی خانەوادەیە ڕۆشنبیر و دەوڵەمەند و لێهاتووە. لەوانەیە بە بێموچەش فەرمان بەجێ بێنێ. دەقی ئەم بەڵگەنامانەش لە کتێبی (مەلای گەورە و زانا و ئەدیب و شاعیر) دا هەیە "وەرگێر"

قایل نەبوو مزەی پارەکەش وەربگرێ، ساڵی ۱۹۲٦ عێراقی بەجی هێشت و رووی کردە لەندن، لێی نیشتەجی بوو. بە نیگەران و ناگزوری دەژیا، یارمەتیدانیشی لە هیچ کەسێك نەدەویست، تا لە تشرینی دووەمی ۱۹٦۰ دووچاری مەرگ دەبێ. کتێبەکانی لە بەغدا فرۆشرا، دکتۆر مستەفا جەواد هەندێکی کڕی، یاداشتە سیاسیەکانی تێدابوو کە حەمدی بەگ بە تورکی نووسیبووی. حەمدی بەگ نمونەیەکی سەرسەختی گەورەیی و بەخۆناز و نەفس بەرز بوو، یەعقوب سەرکیس بۆی باس کردم و گوتی: محەمەد رەشید پاشا (باوکی حەمدی بەگ) موتەسەریفی حیللە بوو، لە بەر مەزنی و بەخۆنازی ناسرابوو بە خدێو محەمەد رەشید پاشا، حەمدی بەگ لە باوکیەوە زەویوزارێکی کشتوکاڵی بەرفراوانی لەو پارێزگایە بۆ بەجی مابوو، لە ماوەی جەنگی یەکەمی مەزنا بە کرێی ساڵانە دەیداتە سلمان بەراك بە هەزار لیرەی زێڕی تورکی، هەموو ساڵی بەراك لیرەکانی بە نەختی بۆ دەهێنایە بەغدا، هەندێك ساڵیش دوای دەخست، دواجار حەمدی بەگ بۆ خۆی دەچێتە حیللە بە دوای کری گرتەکەدا دەنێری کابراش دێت و نۆسەد لیرەی بۆ دێنێ، داوای لێبوردنیشی لێدەکا و بەڵێن دەدا دوای ماوەیەکی کەم سەد لیرەکەیتریشی بۆ بێنێتە بەغدا، بەڵام حەمدی بەگ زۆر تورە دەبێ و بە توندی لەگەڵی دەدوی نۆسەد لیرەکەشی فڕێدەداتە عاردی و لێدەدا و دەرواتەوە، سەرکیس دەڵێ: دوای ئەوە بەراك ناچێتە بەغدا کاتێ ئینگلیز داگیری دەکات، وابزانم حەمدی بەگ هەزار لیرەکەی هەموو لە کیس دەچێ!. کە زەویەکانی حارسیەیان دەست بەسەردا گرت، نرخەکەی نیو ملێون روپیە دەدەنە حەمدی بەگ، بەڵام ئەو داوای ملیۆنێك دەکات، ئیتر پارەکە بەلاوە دەنی و هیچ وەرناگرێت، پاشان بە بێزاری دەربڕین بۆ ئینگلتەوە دەروا، بە کەساسی سەردەنێتەوە، برادەرو ئاشناکانی لە لەندن بە دەست کورتییەکەی دەزانن بەوپەری رێزو نەوازشەوە بانگ هێشتنی نان خواردنی نیوەڕۆ یان ئێوارەی بۆ دەکەن کەچی لەبەر ئەفس بەرزی و سەربەرزی خۆیەوە دەعوەتەکەیانی رەت دەکردەوەو نەدەچوو.

محەمەد رەشید پاشا، باوکی حەمدی بەگ لە ساڵی ۱۸۲۲ لە سلێمانی هاتۆتە جیهان. فەرمان بەریەتی لە فەرمانگەی ویلایەتی موسڵدا دەکات، پاشان دوو جار لە ساڵی ۱۸۷۷

و ١٨٨٢-١٨٨٣ دەبێتە موتەسەریفی حیللە، هەروەها موتەسەریفی مونتەفیك و تەعز لە یەمەن و دێرەزور، والی بەتلیس بووە (١٨٨٢-١٨٨٦)، لە کانونی یەکەمی ١٨٩٥ لە ئەستەنبۆڵ ماڵ ئاوایی لە ژیان دەکات.

لە رووشکێنی و سەر سەختیەکەی دەگێرنەوە: یەکێك لە گەورە پیاوانی ناوداری بەغدا بۆ هەندێك کاروباری تایبەتی دەچێتە بارەگای موتەسەریفیەتی حیللە، پاشا لەوی نابی دەیبەنە ژوورەکەی ئەو چاورێی هاتنەوەی دەکات کە محەمەد پاشا دەگەرێتەوە سەیر دەکا میوانەکەی لە ژوورەکەی ئەودا هاتوچوو دەکا! زۆر لێی تورە دەبێ، بەسەر زەنشتەوە پێی دەڵێ: چۆن رێت بەخۆ داوە ئەوها بەبی رێز و حورمەت لە ژوورەکەی مندا هاتووچۆ بکەیت هەروەك لە هەیوانی ماڵەکەی خۆتان بی!!

## میر لیوا فەتاح پاشا

فەتاح کوڕی سلیمان ساڵی ١٨٦١ لە بەغدا هاتۆتە دنیا، باوکی کڕین و فرۆشتنی کردۆتە پیشە، لە بنچینەدا خەڵکی شاری توز خورماتوە، فەتاح کە باوکی دەمری تەمەنی لە دە ساڵی تێپەر نەکردبوو، خوێندنی دوا ناوەندی لە بەغدا تەواو دەکات، پاشان هەوار دەباتە ئەستەنبۆڵ، دەچێتە خوێندنگای سوپایی. ئینجا قوتابخانەی ئەرکان، بە ئەفسەر روکن دەردەچێ، ماوەیەکی زۆر لە سوپای تورکی کارمند دەبێ، تا دەگاتە پایەی ئەمیر لیوا، بەرێوەبەری کارگەکانی چنینی سوپابووە لە بەغدا، پێش جەنگی گشتی (١٩١٤) تەقاعود دەکرێ. لەسەر ئەنجامی دامەزراندنی حکومەتی عێراق دەیکەنە پارێزگاری لیوای کەرکوك (١٥ شوبات ١٩٢١)، پایەکەی نزیکەی چوار ساڵ هەتا ١٩٢٤ بینیوە، لە ساڵی ١٩٢٦ لەگەڵ نوری بەگی کوڕی کارگەیەکی چنینی خوری لە کازمییە دادەمەزرێنێ، کە لەسەرەتای پرۆژە پیشەسازیە نوێیەکانی عێراق بووە، بەدرێژایی ساڵان پەرەی سەندو سەرکەوتنی وەدەست هێنا، هەتا حکومەت لە ساڵی ١٩٦٤ خۆماڵی دەکات. فەتاح پاشا لە

**٨ی کانونی دووەمی ١٩٣٦ کۆچی دوایی کردووە، دوو کوڕەکەی: سلێمان بەگ و نوری بەگ ناودار بوون.**

**سلێمان فەتاح لە ساڵی ١٨٩١ هاتۆتە دنیا لە خوێندنگای سوپایی لە ئەستەنبۆڵ دەخوێنێ، بە ئەفسەر لە سوپای تورکی خزمەت دەکا. لە ناوڕاستی ئابی ١٩٢٠ دێتە کفری، هانی سەردارانی ناوچەکە دەدا بۆ شۆڕش نانەوە و باسی سەرکەوتنەکانی شۆڕشگێڕانی فوراتی ناوەراستیان بۆ دەکات، ئیبراهیم سەرۆکی بەشێك لە عەشیرەتی دەلۆ بە یارمەتی هەندێك لە هۆزی جاف لە رووی کاربەدەستانی بەریتانی رادەپەرێ، سلێمان دێتەوە بەغدا، لە ١٨ کانونی یەکەم ١٩٢١ دەچێتە ناو سوپای عێراقی وە پایەی "ڕەئیس" رائدی پێ دەدرێ، دەیکەنە یاوەری وەزیری بەرگری دوایی یاریدەدەری ئامیری خوێندنگای سوپایی (١٩٢٥)، ساڵی ١٩٢٧ بۆ بەشداربوونی لە دەورەیەکی سوپاییدا دەینێرنە هیند بۆ ساڵی ئاینده بۆ پایەی (مقدم) باڵا دەکرێ، لە خزمەتگوزاری سوپا خۆی سەرفراز دەکا، لە تشرینی دووەمی ١٩٣٠ بە نوێنەری کەرکوك هەڵدەبژێردرێ، دوایی هەر بە نوێنەری کەرکوك دەمێنێتەوە (١٩٣٥)، پاشان هی هەولێر (١٩٣٤)، جارێکیتر نوێنەری کەرکوك (١٩٣٥-١٩٣٦) و تشرینی یەکەمی ١٩٤٣ و ئازاری ١٩٤٧ هەتا شوباتی ١٩٤٨، لە حوزەیرانی ١٩٦٠ لە لەندەن جیهان بەجێ دێڵێ.**

**نوری فەتاح لە ساڵی ١٨٩٣ لەدایك دەبێ، لە خوێندنگای سوپایی دەردەچێت، بە پایەی (ملازم) ی یەکەم دەبێتە ئەفسەر لە سوپای تورکیدا، دوای جەنگە مەزنەکە دەگەڕێتەوە عێراق، بەشداری لە بزوتنەوە نیشتمانییەکەدا دەکا، بۆ دورگەی هنجام ئاوارەی دەکەن (ئابی ١٩٢٠). لە شوباتی ١٩٢١ بەردەدرێ. لەگەڵ فەتاح پاشای باوکی کارگەی چنین لە (*کاظمیة*) دادەمەزرێنێ(١٩٢٦) بە بەڕێوەبەر هەتا خۆماڵی دەکرێ. هەڵبژێردرا بە ئەندامی لێژنەی بەڕێوەبەرایەتی ژووری بازرگانی بەغدا. ساڵەهای ساڵ تێیدا کارمەند دەبێ، دەبێتە سەرۆکی وەفدی عێراقی بۆ کۆنگرەی بازرگانییەتی دەوڵەتان کە لە**

(رای) سەر بە شاری نیویورك لە تشرینی یەكەمی ١٩٤٤ بەسترا. دوای خۆماڵی كردنی كارگەكانی دوا ساڵەكانی ژیانی لە بەیروت بەسەر بردووە، دەكەوێتە ژێرباری گرانی دەرد و بیماری تا تێیدا دووچاری مەرگ دەبێ (ئایاری ١٩٧٦).

## ئیبراهیم حەیدەری

شێخی ئیسلام و وەزیری ئەوقافی عێراقی ئیبراهیم حەیدەری كوڕی عاسم كوڕی ئیبراهیم حەیدەریە، رەچەڵەكی بنەماڵەكەی دەچێتەوە سەر برای شا ئیسماعیل سەفەوی كە بەغدای لە ساڵی ١٥٠٨ داگیر كردووە، ئەویش كوڕی سوڵتان جونەیدە وەك دەڵێ گوایا دەچێتەوە سەر ئیمام موسای كازم باپیری، بنەماڵەكەیان شێخ سەفیەدین لە پیاوە خواناس و سۆفیەكان بووە، لە نەوەكانی ئیبراهیم كە بۆ عێراق دێ و لێی نیشتەجێ دەبێ محەمەد كوڕی شێخ حەیدەر قوتبەددین بووە، ئەو خێزانە لە گوندی حەریر[38] نزیك هەولێر هەوارنشین بوون، نەوە دوای نەوە دەستەیەك لە زانا و ئەدیبانیان لێ پاشەكەت بووە، لە بەناوبانگترینیان ئیبراهیم فەسیح حەیدەریە (١٨٢٠-١٨٨١) دانەری كتێبی *(عنوان المجد في بيان احوال بغداد و البصرة و نجد)*. ئیبراهیم حەیدەری: لە ساڵی ١٨٦٤ لە هەولێر هاتۆتە دنیا، زانیاریەكانی عەرەبی و ئاینی لای زاناكانی سەردەمی خۆیدا دەخوێنێ. ئیجازەی زانستی پێدراوە، بە قازیەتی زاخۆ دادەمەزرێ، دوو ساڵی لێدەمێنێتەوە، پاشان رووی كردۆتە ئاستانە، دەچێتە خوێندنگای حقوق بڕوانامەكەی لێ وەردەگرێ، چەندین پایەی بینیوە، دەیكەنە سەرۆك دادگای بازرگانی لە (جەدە)، ئینجا داواكاری گشتی لە موسڵ، دەچێتەوە ئاستانە، دەیكەنە ئەندامی ئەنجومەنی مەعاریف، پایەی جیاجیای دادوەری بینیوە، تا ئەوەی ساڵی ١٨٩٨ دەیكەنە سەرەك ئەنجومەنی (دارالخير العالي). دەبێتە سەرەك

---

38- گوندی (ماوەران) نیشتەجێ بووی بنەماڵەی حەیدەریە نەك گوندی حەریر.

له هەندێك لێژنەی هەمیشەیی بەڕێوەبەری مەعاریفی عوسمانی. کە ئەنجومەنی مەعاریفیان نەهێشت، دەیکەنە قازی ویلایەتی دیاربەکر (١٩٠٦)، جا سەرۆکی کاروباری شەرعیە لە (*نظارة الدفتر الخاقانی*) [٣٩] لە پایتەختی خەلافەت، ئینجا ئەندام لە (*دارالحکمة الاسلامیة*) کە لە ١٩١٥ دامەزراوە. لە کۆتایی جەنگە مەزنەکەدا لە دامەزراندنی وەزارەتی ئەحمەد تۆفیق پاشا دەبێتە شێخی ئیسلام (١١ی تشرینی دووەمی ١٩١٨). هەروەها لە وەزارەتی دووەمی تۆفیق پاشا لە (١٣ی کانونی دووەمی ١٩١٩ هەتا ٣ی ئازاری ١٩١٩)، دوای ئەوە دەبێتە فەرمانبەرێکی تایبەت بە ئەنجومەنی وەزیرانی تورکی، ئینجا بۆ جاری سێیەم لە وەزارەتی عەلی رەزا پاشادا دەبێتەوە شێخی ئیسلام (٢٠ی تشرینی یەکەمی ١٩١٩)، هەمان پایە لە وەزارەتی سالح خلوسی پاشادا (٨ی ئازاری ١٩٢٠- ٢ی نیسانی ١٩٢٠). لە ساڵی ١٩٢٣ دەگەڕێتەوە عێراق، بە نوێنەری هەولێر بۆ ئەنجومەنی دامەزراندن هەڵدەبژێردرێ (١٩٢٤). لە وەزارەتی یاسین هاشمی وەزارەتی ئەوقافی پێ سپێردراوە. (٤ی ئابی ١٩٢٤ هەتا ٢٠ی حوزەیرانی ١٩٢٥). پاشان لە تەموزی ١٩٢٥ دەیکەنە ئەندام لە ئەنجومەنی (ئەعیان) تا لە یەکی کانونی دووەمی ١٩٣١ جیهان بەجێ دێڵێ. شێخ ئیبراهیم حەیدەری دەستخەتی لە فەلسەفەی مێژووی ئیسلامی و فەلسەفەی ئایینەکاندا هەیە، لە بەرهەمە بەجێماوە بڵاوکراوەکانی: مێژووی تەسەوف لە رێگەی ئیسلامەتیدا. لە ئاستانە چاپکراوە، هەروەها قەسیدەیەکی دووروودرێژی بۆ لە دەست چوونی عێراق هۆنیوەتەوە، یەکجار بیر تیژ و شارەزای ئەدەبی زمانەکانی عەرەبی و تورکی و فارسی و کوردی بوو، وتووێژی پڕچێژی ئەدەبی و زمانەوانی لەگەڵ جەمیل سدقی زەهاوی و ئەحمەد فەخری و ئاسەف قاسم ئاغا لە ئەنجومەنی پیراندا هەبووە. مەحمود سوبحی دەفتەری لە چۆنیەتی دانانی ئیبراهیم حەیدەری بە شێخی ئیسلام بۆی باس کردم گوتی: لە

---

39- *نظارة الدفتر الخاقانی*: واتای بەڕێوەبەری تەشریفاتی خەلافەت دەگەیەنێ. (وەرگێڕ)

ئاكامی تێكشكانی دەوڵەتی عوسمانی لە جەنگە مەزنە جیهانیەكەدا و داواكردنی ئاگربەستی تشرینی یەكەمی ١٩١٨.

ئەحمەد تۆفیق پاشا (سەدرِی ئەعزەمی) ی پێشوو كە پیاوێكی پیری پەككەوتەی دەستبەرداری كار و فەرمان و گۆشەگیری ناوماڵ بوو كەچی داوای لێكرا حكومەتێكی نوی دابمەزرێنێ. وەزیرەكان یەك لە دوای یەك دەستنیشان كران، كە لە (سەدرِی ئەعزەمی) یان پرسی كی بۆ پایەی شێخی ئیسلام دەپاڵێوی (كە بەرزترین پایەی دەوڵەتە دوای سەرەك وەزیران) دوودڵ و داماو پاشان ناوی پیاوێكی هێنا پێیان گوت: ئەوە مردووە. ناوی یەكێكیتری برد پێی دەڵێن: ئەوە نەخۆشە و لە ماڵەوە كەوتووە، لە دوایدا یەكێك لەوان ناوی شێخ ئیبراهیم حەیدەری دەبنی و دەكەوێتە ستایشی چاكە و لێهاتوویی ئیتر دەهێنی بۆ شێخایەتی باڵا، بەڵام هۆی لادانی لە وەزارەتدا دەفتەری دەڵێ: حەیدەری كتێبێكی داناوە دانەیەكی لێ دەكاتە دیاری بۆ سوڵتان محەمەدی شەشەم داوای تەمەندرێژی و نەمری لە سەر تەختی خەلافەت بۆ دەكا، بەڵام لەو دانەی كە بە دیاری بۆ جێگرەكەی ئەمیر عەبدولمەجید دەنووسێ: داواكارم كاتی وەرگرتنی دەسەڵاتداریەتیت بۆ بەختەوەری جیهان و بەرزیەتی پایەی موسڵمانان نزیك بووبێ، هەڵەیەك روودەدا كە سەرچاوەكەی نەزاندرا، نوسخەی كتێبی (جێگرەكە) دەدرێتە سوڵتان كاتی نووسراوی دیارییەكە دەخوێنێتەوە پێی پەست و توورِە دەبێ. لە دڵی خۆیدا دەیهێڵێتەوە، پاش ماوەیەكی كەم وەزارەت دەكەوی و ئیبراهیم حەیدەری لە شێخایەتی ئیسلام دەردەهێندرێ !! ئەوەش دوا سەردەمی بوو لەو پایە بەرزەدا. كە دەگەرێتەوە عێراق دەیكەنە وەزیری ئەوقاف، پایەكەی بە سەر گرانی وەردەگرێ، دوای ئەوە كە بەرزترین پایەی ئایینی لە دەوڵەتی عوسمانیدا هەبووە، رۆژێك مەحمود سوبحی لێی دەپرسێ: چۆن خۆت لە وەزارەتی ئەوقاف دەبینی؟ ئاهێكی هەڵكێشاوە دەڵێ: لە پێشەوە بووین وا ئێستاش بووین بە كلك!!. وەزیری ئەوقاف ئەوسا لە زنجیرەی وەزیرانی دەوڵەت بە دوا

وەزیر دادەندرا و، دەبوایە دوای هەموو هاورێکانی ئیمزا لەسەر یاساو دەستورەکان بکات، عەلی شەوقی لە کتێبەکەیدا (الاحکام) دەگێڕێتەوە دەڵێ: ڕۆژێك ئیبراهیم حەیدەری کە شێخی ئیسلام بوو لە ئەستەنبوڵ پێی گوتم: لە تۆمارگەی دیوانی شێخایەتیدا سەیری کرد کە ڕابەرو ئامۆژگارانی ئاینیان بۆ شاری دیوانیە ناردووتە عێراق گوایا فارسن و ئاینیان بت پەرستییە و پێویستیان بە ڕێنمایی و دەستوری ئیسلامەتی هەیە. ئیبراهیم حەیدەری لێی پرسیووە دەربارەی دیوانیەو خەڵك و دانیشتوانی؟ شێخ عەلی شەوقی ڕاست دەبێتەوەو لە وەڵامدا دەڵێ: دیوانیە یەك لە شارەکانی خوزاعەیە لە فوراتی ناوەراستدا، خوزاعەش لە گرنگترین هۆزەکانی عەرەبەو لە جەرگەی عەرەبەوەیە و لە گەورە خێڵە ڕەسەنەکانی ئیسلامە، بۆیە لەبارەی ئەوانەوە پێغەمبەری عەرەبی فەرمویەتی: خوا سەرکەوتوم ناکا ئەگەر خوزاعە سەرنەخەم، ئا لەو هەڵمەتەدا بوو کە مەککەی پیرۆز گیرا، خوزاعە فورس بووین؟ بەڵام درۆ و دەلەسەی ئەوانەن کە عەرەبن و بون بە تورك یان ئەو تورکانەی لەگەڵ نەتەوەیتر گەورە بوون و بون بە عەرەب ئەمەیان بۆ هەڵبەستون.

### شێخ محەمەد بریفکانی

دەچێتەوە سەر بنەماڵەیەکی ناسراوی ئاینی لە گوندی بریفکان سەر بە شاری دهۆك، باب و باپیرانی لە دێر زەمانەوە ڕابەری ڕێبازی قادریان پەیرەو کردووە.

محەمەد نوری کوڕی شێخ عەبدولجەباری بریفکانی لە ساڵی ١٨٧١ هاتۆتە جیهان، بووەتە شێخی ڕێبازەکە، دەست بە ڕابەری و ئیرشاد لە تەکیەکەی خۆیاندا دەکات، جگە لەمەش بە ئەرکی سەرداریەتی عەشیرەتی مزوریش هەڵدەستێ. لە تەموزی ١٩٢٥ بە نوێنەری موسڵ بۆ پەرلەمان هەڵدەبژێردرێ، دووبارە لە شوباتی ١٩٣٣ و تشرینی یەکەمی ١٩٤٣ هەڵدەبژێردرێتەوە. دەچێتە دهۆك پاشان بۆ موسڵ دەگوازرێتەوە. لە ١٩٤٤ کۆچی دوایی دەکات. ئەوەی شایەنی باس بێت، لە ناودار بوانی بنەماڵەکەیان، شێخ

عوبێدوڵلای بریفکانی کوڕی نور محەمەد کوڕی عەبدولقادرە. ساڵی ١٨٨٤ هاتۆتە دنیا، لە سەر دەستور و شێوەی ڕێبازی بنەماڵەکەیان پێگەیشتووە، لە ئایاری ١٩٢٨ و تشرینی دووەمی ١٩٣١ و ئابی ١٩٣٥ و حوزەیرانی ١٩٣٩ بە نوێنەری موسڵ هەڵدەبژێردرێ. مەحفوز محەمەد عومەر لە کتێبەکەیا (ئیمارەتی بادینانی عەباسی) باسی دەکا دەڵێ: نمونەیەك بوو لەو پیاوانەی کە زیرەك و هۆشمەند و نەفسبەرز و هیمەتباڵا. شیعری بە زمانی عەرەبی و کوردی و تورکی و فارسی هۆنیوەتەوە.

شێخ نوری بریفکانی ساڵی ١٩٢١ ئامادەی ئاهەنگی تاج لەسەرنانی مەلیك فەیسەڵی یەکەم دەبێ لە بەغدا، "میسس بێل" لە نامەیەکیدا وەسفی دەکا دەڵێ: پرچی و جلوبەرگ و عەمامەی سپی بوو، دەڵێ: خەڵکێکی زۆری لە دانیشتوانی سنوری باکور لەم جیهانە و دونیای ئەوسەری بە خۆیەوە گرتووە، چونکە سەرۆکی دونیایی و دینە پێکرا. لە ساڵی ١٩٥٦ لە موسڵ سەری ناوەتەوە.

### سەعید مەعروف

سەعید مەعروف ئاغا تەها ساڵی ١٧٨٥ لە سلێمانی لەدایك بووە، لە خێزانێکی ناسراو بە ناوی کەرکوکلی زادەیە، خوێندنی لە پەیمانگاکانی ئایینیدا تەواو کردووە، بە کاروباری بازرگانی و کشتوکاڵیەوە خەریك دەبێ، بە نوێنەری سلێمانی بۆ ئەنجومەنی "مەبعووسین" هەڵدەبژێردرێ (کانونی یەکەمی ١٩٠٨)، دوای ئەوە سەر لە نوی هەڵدەبژێردرێتەوە، لە ئاکامی دامەزراندنی حکومەتی عێراقدا دەبێتە ئەندامی ئەنجومەنی بەڕێوەبەرایەتی لیوای سلێمانی، پاشان دەبێتە ئەندام لە ئەنجومەنی پیران (ئەعیان) (تەموزی ١٩٢٥)، ئەندامیەتەکەی هەتا تشرینی یەکەمی ١٩٣٧ بۆ نوی دەکرێتەوە. لە ٢٠ی کانونی یەکەمی ١٩٦١ لە سلێمانی جیهان بەجی دێڵێ. سەبری عەلی ئاغا تەهای ئامۆزای بازرگانێکی ناودار بوو لە بەغدا هەر لەوێش کۆچی دوایی دەکا (کانونی یەکەمی ١٩٥٦). ساڵی ١٩٢٨-١٩٣٠ بە نوێنەری سلێمانی هەڵبژێردراوە، لە ساڵەکانی ١٩٣٣، ١٩٣٤، ١٩٣٧ هەڵدەبژێردرێتەوە،

له قوتابخانه‌ی ئه‌فسه‌رانی یه‌ده‌گ له به‌غدا (١٩١٥) وه‌ك ئه‌فسه‌رێك له ماوه‌ی جه‌نگی یه‌كه‌می گشتیدا له كۆڕ و مه‌یدانی عێراقدا خزمه‌تگوزار ده‌بێ.

## بابه‌كر سه‌لیم ئاغا

بابه‌كر سه‌لیم ئاغا سه‌رداری عه‌شیره‌ته‌كانی پشده‌ره له پارێزگای سلێمانی. سالی ١٨٧٥ له گوندی باده‌لیان له‌دایك بووه، له سه‌ر ده‌ستی زاناكانی ناوچه‌كه‌یدا خوێندویه‌تی، جگه له زمانی كوردی و فارسی و زانیاریه‌كانی ئاینیش فێر ده‌بێ. سه‌لیم ئاغای باوكی دوای ئه‌وه‌ی له كاربه‌ده‌ستانی عوسمانی هه‌لده‌گه‌ڕێته‌وه له ١٨٩٣ ده‌كوژرێ. بۆ تەمبی كردنیان هێزێكی گه‌وره ده‌نێرنه سه‌ریان، خه‌لكێكی زۆری پشده‌ری ده‌ربه‌ده‌ر ده‌كه‌ن و ده‌ست به‌سه‌ر شوێن و سه‌نگه‌ره‌كانیان داده‌گرن، ئه‌و سه‌لیم ئاغایه‌ش كوڕی بابه‌كر ئاغا كوڕی حه‌مه ئاغای میر عه‌بدال ئاغا زاده‌یه.

بابه‌كر جله‌وی سه‌رداریه‌تی عه‌شیره‌ته‌كه‌ی ده‌گرێته ده‌ست، هه‌ندێك جار دژایه‌تی ده‌وله‌تی توركیش ده‌كات، كه جه‌نگی مه‌زنی سالی ١٩١٤ به‌رپا ده‌بێ رق و كینه‌به‌ری به‌لاوه ده‌نی شانبه‌شانی سوپای توركی بۆ به‌ربه‌ستی هه‌لمه‌ته‌كه‌ی رووسی له‌و دیوی سنووری ئێرانه‌وه ده‌وه‌ستێ. حكومه‌تی توركی به ده‌ست رۆیشتوویی و پایه‌ی بابه‌كر ئاغای ده‌زانی ده‌یكاته قایمقامی قه‌زای پشده‌ر و ده‌یخاته سه‌ر ویلایه‌تی موسل. له دوا دوایی جه‌نگه‌كه‌دا ئینگلیز ئه‌و ناوچه‌یه داگیر ده‌كا، بابه‌كر ئاغا تا سالی ١٩٣٨ حكومڕانی ده‌گرێته ده‌ست، كه حكومه‌تی عێراق ده‌چێته پشده‌ر دامودەزگا و ده‌ستوری به‌رێوه‌به‌رایه‌تی داده‌مه‌زرێنێ. بابه‌كر له سه‌رۆكایه‌تی عه‌شیره‌ته‌كه‌یدا هه‌تا مردن به‌رده‌وام ده‌بێ (١٩٤٨).

بایزی كوڕی یا (بایه‌زید) جێگای ده‌گرێته‌وه، بایز له سالی ١٩١٥ له گوندی دۆلی سه‌ر به قه‌زای شاربازێڕ هاتۆته دنیا. له ته‌موزی ١٩٣٠ ده‌یكه‌نه مودیر ناحیه‌ی قه‌لادزه تا سالی ١٩٤٤ له پایه‌كه‌ی ده‌مێنێته‌وه، پاشان وازی لێدێنێ. له ئایاری ١٩٥٨ به نوێنه‌ری سلێمانی هه‌لده‌بژێردرێ. له ئایاری ١٩٦٨ له به‌غدا كۆچی دوایی ده‌كا.

## ئەحمەد عوسمان



ئەحمەد کوڕی عوسمان بەگ لە بنەماڵەی مەلا ئەفەندی ناسراوی هەولێرە، ئەحمەد بەگ لە ساڵی ١٨٧٩ لە موسڵ هاتووەتە دنیا، ساڵی ١٩٠٦ بە ئەندامی مەحکەمەی هەولێر دادەمەزرێ، دوایی بۆتە ئەندام لە مەحکەمەی موسڵ (١٩١١)، پاشان سەرۆکایەتی مەحکەمەکە وەردەگرێ. دوایی بۆتە سەرەك شارەوانی هەولێر (١٩١٧). لە ئاکامی دامەزرانی حکومەتی عێراقدا دەبێتە جێگری موتەسەریفی هەولێر (١٩٢١). پاشان بۆتە موتەسەریفی شارەکە (١٩٢٣) دوایی موتەسەریفی سلێمانی (١٩٢٧-١٩٣٠)، پاشان دەیکەنە ئەندام لە ئەنجومەنی پیراندا (٣٠ی نیسانی ١٩٣٠- ١٧ی تشرینی یەکەمی ١٩٣٧)، دوایی بە نوێنەری هەولێر هەڵدەبژێردری (حوزەیرانی ١٩٣٩) و (تشرینی یەکەمی ١٩٤٣- تشرینی دووەمی ١٩٤٦). لە ١٠ی کانونی یەکەمی ١٩٤٦ لە بەغدا جیهان بەجی دێڵێ.



## زەید ئەحمەد عوسمانی کوڕی:

لە ئایاری ١٩٥٨ هەتا شۆڕشی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ بە نوێنەری هەولێر هەڵدەبژێردرێ، یەکێك بوو لە نوێنەری عێراق بۆ ئەنجومەنی (ئیتحادی هاشمی). لە ساڵی ١٩٨٣ماڵئاوایی لە ژیان دەکا.[٤٠]

---

[40]- زەید ئەحمەد عوسمان: ساڵی ١٩٢٤ لە هەولێر هاتۆتە جیهان. کولیەی حقوق لە بەغدا تەواو دەکات. ماوەیەك بە کاری پارێزەری هەڵدەستێ. یەکێك بوو لە زمانزان و رۆشنبیرانی کوردە. جگە لە زمانی کوردی، عەرەبی و ئینگلیزی و فەرەنسیی زانیوە. هەستی نەتەوایەتی و هەڵوێستی جۆراوجۆری سیاسی کوردانەی هەبوو، تا ئەوەی سەردەمێك روو دەکاتە کەژ و کێو تێکەڵ بە بزوتنەوەی ئازادیخوازی

## ڕەشید بەگ بەرواری

حاجی ڕەشید بەگ دوا میرەکانی بەرواری بالاّ بوو، لە گوندی دێرەشیش لە باکوری ڕۆژئاوای ئامێدی نیشتەجی دەبێ، وەك لە دکتۆر محەمەد سدیق جەلیلیم زانی کەوا مێژووی ئیمارەتەکە دەگەڕێتەوەسەدەی هەڤدەمینی زاین. بنەماڵەی فەرمانڕەواییان بە خێزانی (*الملكائيزية*) ناو براون، مەحفوز محەمەد عومەر لە کتێبەکەیا "*امارة بهدينان العباسية*"دا (١٩٦٩) باسی دەکات دەڵێ: پیاوانی ئەم خێزانە بەردەوام بوون لە فەرمانڕەوایی حکومەتی بەرواری هەتا ١٩٢٢. دوایییەکەیان ڕەشید بەگ بوو، ساڵی ١٩٢٤ بە نوێنەری موسڵ بۆ ئەنجومەنی دامەزراندنی عێراق هەڵبژێردرا، دوای مردنی تۆفیق بەگی کوڕی لە سەرۆکایەتیدا جێگای دەگرێتەوە، هەروەها لە کوڕەکانیتری عەبدولمەجید ڕەشید بەرواری ساڵی ١٩١٩ لەدایك بووە لە ١٩٥٤ دەبێتە قایمقامی سنجار و بریکاری موتەسەریفی موسڵ (نیسانی ١٩٥٩).

## تۆفیق خالیدی

تۆفیق بەگ کوڕی عەبدولقادری خالیدی (خوولە) لە بنەماڵەی زەهاوە، ساڵی ١٨٧٩ لە بەغدا هاتۆتە جیهان منداڵ دەبێ کە باوکی بە نەخۆشی ڕشانەوە دەمرێ. لە قوتابخانەی سوپایی دەخوێنی و بە ئەفسەر دەردەچێ، پاشان دەچێتە هێزی دەرەك (جندرمە)، لە بەغدا دەبێتە مامۆستای خوێندنگای دەرەك و مامۆستای زمانی فەرەنسی لە قوتابخانەی دواناوەندی سوپاییدا، بۆ پایەی یوزباشی (ڕەئیس) بالاّ دەکرێ، ساڵی ١٩١٣ بووەتە بەڕێوەبەری قوتابخانەی دەرەك لە بەغدا، بە نوێنەری بەغدا بۆ (ئەنجومەنی مەبعووسین) هەڵدەبژێردرێ (نیسانی ١٩١٤)، کە جەنگی مەزن بەرپا دەبێ دەیکەنە ئامیری هێزی تورکی لە ئەهواز

---

کورد دەبێ. پاشان بە دڵنیگەرانیەوە دەچێتە فەرەنسا هەر لەوێش لە ١٩٧٨ بە نائومێدی سەردەنێتەوە تەرمەکەیان هێنایەوە لە هەولێر بەخاك سپێردرا. "وەرگێڕ"

(شوباتی ١٩١٥). ئەم هێزەش هەمووی لە عەشایری خۆبەخش پێك هاتبوو، پاشان هێزێکی گەورە لە سوپا بۆ ئەو مەیدانە بەری دەکرێ، سەرکردایەتیەکەشی بە فەریق فازل پاشای داغستانی دەسپێردری و خالید دەکاتە ئەفسەر روکنی خۆی (ئازاری ١٩١٥) و ئەو زانایانەی بەگەڵ هەڵمەتە تورکییەکە کەوتبوون: شێخ مەهدی خالیسی و عەبدولکەریمی جەزائیری و هیتر بوون. بەڵام سوپاکە نەیتوانی مەترسی بخاتە سەر داهاتی نەوتی بەریتانی لە باشوری ئێراندا. پاشان خالیدی لەگەڵ وەفدێکی تورکی بەئەفسەری پەیوەندیدار بۆ ناو سوپای ئەڵمانی نێردرا، تاکو ساڵی ١٩٢٠ لە ئەوروپا دەمێنێتەوە، کە دەگەڕێتەوە عێراق بە پایەی (مقدم) گەیشتبو. ساڵی ١٩٢١ وتوویژ بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق لە ئارادا بوو، کۆمەڵێك هەوڵی دانانی حکومەتێکی کۆمارییان دەدا و بانگەوازیان بۆ دەکرد، یەك لەوان هاری سنت جۆن فیلبی کە دوایی بە ناوی (شێخ عەبدوڵڵا فیلبی) ناسرا، ئەوسا راوێژکاری وەزارەتی ناوخۆی عێراق بوو، تۆفیق خالید و شێخ سالم خەیون و هەندێك لە پیاوانی حیزبی ئازادی عێراق تێکەڵ بەو بزوتنەوەیە بوون. بەڵام ئەو بانگەوازە دوای ئەوەی بڕیاری دامەزراندنی (پاشایەتی) دراو عەرش درایە ئەمیر فەیسەڵ کوڕی حوسێن کپ کرا. لە تەمموزی ١٩٢١ (فیلبی) یان لە پایەکەی خست و خالیدیان لە کانونی دووەمی ١٩٢٢ کردە پارێزگاری بەغدا، پاشان وەزیری ناوخۆ (یەکی نیسان ١٩٢٢). ئینجا وەزیری داد (٣٠ ئەیلولی ١٩٢٢ هەتا١٨ی تشرینی دووەمی ١٩٢٢)، ئیتر لەشەوی ٢٢ی شوباتی ١٩٢٤ لە بەغدا کاتی دەگەڕێتەوە ماڵەوە تیرۆر دەکرێ،وا دیارە بە گوێرەی ئەو نامانەی کە (ئەڵمس کرترود بیل) لە هاوینی ١٩٢٢. بۆ باوکی نووسیوە تاوانی تورك خوازی خراوەتە پاڵ تۆفیق خالیدی کەوا لە کەرکوك و ناوچەکانی سنوری باکور بانگەوازیان بۆ گەڕانەوەی عێراق و پاڵاوتنی سەید ئەحمەد سنوسی (<u>*الخطابي الحسيني الادريسي*</u>) (١٨٦٧-١٩٣٣) بکرێتە ئەمیر، بڵاوکردۆتەوە. سنوسی ساڵی ١٩١١ لە دژی ئیتالیەکان لە تەرابلوس جەنگاوە، لە ١٩١٥-١٩١٦ پشگیری لە هێرش بردنەکەی تورکی بۆ سەر سنووری میسری کردووە. لە کاتی دامەزراندنی وەزارەتی نەقیب لە ١٩٢١

خالیدی به وەزیرایەتی ناوخۆ دەست نیشان کرا، بەڵام ناوەکەی دوای دانیشتنی مەلیك فەیسەڵی یەکەم لەسەر عەرش لادرا، بۆ ساڵی ئاینده لە گۆڕانکاری وەزارەتدا دەبێتە وەزیری ناوخۆ. ئامادەی ئەو کۆنگرەیە دەبێ کە ساڵی ۱۹۲۲ لە کەربەلا دەبەسترێ تایبەت بە هێرشبردنەکەی (الاخوان الوهابین) خالیدی رۆڵێکی کاریگەری تێدا بینی، توانی کۆنگرەکە ئاراستەی ئەو لایەنەی بکا کە حکومەت مەبەستی بوو. کۆنگرەکە بڕیاری راگەیاندنی متمانە پێکردنی بە مەلیك فەیسەلی یەکەم داوە بەرگری لە سنوری عێراق بکا، فریاگوزاریش بۆ زیان لێکەوتەکان دابین بکرێ، بەڵام کۆنگرەکە خۆی لە مەسەلەی (ئینتیداب) ی بەریتانی و پەیمانەکەی نەگەیاند وەك سەرەك عەشیرەت و سەرداره ئاینییە توند رەوەکان گەرەکیان بوو.

مەحمود سوبحی دەفتەری پێی ووتم: تۆفیق خالیدی ئارەزویەکی سیاسی دووری هەبووە، پشتی سەید عەبدولڕەحمانی نەقیب سەرۆکی حکومەتی کاتی گرتبوو، پەیوەندی بە *(دار الاعتماد البریطانی)* باش بوو، بانگ هێشتی مەندوبی سامی و پیاوەکانی بۆ نان خواردن لەناو باغ و باخچەکەی لە دۆرە دەرەوەی بەغدا کرد، هەفتەیەك بەسەر ئەمە تێنەپەری لە باوردۆخێکی نەزانراودا خالیدی دەکوژرێ، تاوان بارەکە دەستگیرناکرێ، هۆکاری سیاسییان خستە پاڵ مەسەلەکەی و خوێنی بە خۆڕایی رۆیی، راپۆرتەکانی بەریتانی دەڵێ: لە شوباتی ۱۹۲٤ تۆفیق خالیدی لەگەڵ مەندوبی سامی بەریتانی (هەنری دوبس) بە پارێزگاکاندا دەگەرێن کە دێنەوە مەلیك فەیسەڵ لێی دەپرسێ: باسی چیتان کردووە! بە گوێرەی ئەو وتووێژەی لە "مسس بێل" کە لەگەڵ دوبس کردوویەتی خالیدی لەوەڵامی مەلیك دا گوتویەتی: لەبارەی کشتوکاڵەوە دواوین _ مەلیك پێی بڕواناکا، چەند رۆژێکی نەخایاند هەتا لەبەر دەرگای ماڵەوەیدا دەکوژرێ. مەندوبی سامی بۆ وەزیری موستەعمەرات لە لەندەن نوسیویەتی دەڵێ: لەوانە نیە تاوانبار بدۆزرێتەوە، بەداخەوە ئەوانەی کەزۆر ئاگاداری کارو بارن لەبەغدا گومان لەوە دەکەن کوشتنەکەی دەستی

مەلیك فەیسەڵی تێدابی و بە ئاگادار بوونی سەعید پاشا وەزیری بەرگری، بە بڕوایەکی تەواو پێیان گوتم: کوشتنی خالید هۆیەکی سیاسییە، وا بڵاوە کە نوری سەعید هانی کوشتنی دابێ. خالیدی لە خانویەك لە گەڕەکی جەدید حەسەن پاشا دادەنیشت، خانویەکی چۆڵ و بەتاڵی بە تەنیشتەوە دەبێ، دوو کەس دێنە ناوی، چاوەڕێی نێچیرەکەیان دەکەن، خالیدیش شەو زوو بەرەو ماڵ دێتەوە کۆڵانەکەش چۆڵ و تاریکە هەر کە دەگاتە بەر دەرگا دوو زەلامی پێڕا دەگا دەیدەنە بەر گوللەو گیانی دەردەچێت، دەست بەجێ تاوانباران دەگەڕێنەوە ناو خانوەکە دەرگاکەش کلیل دەدەن، ئەمانە هەمووی لە چەند دەقیقەیەکدا روو دەدا، پاشان کوژراوەکە دەدۆزرێتەوە کە هەموو گیانی خەڵتانی خوێنە. هەناسەی لێبڕاوە، لێتۆژینەوەی پۆلیس نەگەیشتە چ ئەنجامێك.

عەونی کوڕی ئەوسا منداڵێکی تەمەن دوازدە ساڵان دەبێ. ساڵی ١٩٣٣ لە جامیعەی ئەمریکی لە بەیروت دەرچووە، دەبێتە فەرمانبەرێکی بەرزی وەزارەتی دەرەوە، نوینەری عێراق دەبێ لە نەتەوە یەکگرتووەکاندا، دەبێتە سکرتێری گشتی پەیمانی بەغدا لە کاتی دامەزرانیدا (١٩٥٥ هەتا شۆڕشی ١٥ تەمموز ١٩٥٨).

دوای شۆڕش ساڵانێکی زۆری تەمەنی لە ئیتالیا بەسەر بردووە، قەسیدە دورو درێژەکەی (غادە ڤینسیا) و هەڵبەستەکانی تری لە کۆمەڵێکی چاپ کراودا لە بەیروت ساڵی ١٩٦٤ بڵاوکردۆتەوە. عەونی خالیدی لە ١٩١٢ هاتۆتە دنیا ساڵی ١٩٥٨ لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە.



## جەمیل هەویزی

دەچێتەوە سەر بنەماڵەی حەویز ئاغا، لە خێزانە ناسراوەکانی کۆیەی لیوای هەولێر. تاهیر ئاغای مامی لە بەغدا نیشتەجێ دەبێ، لە بازرگانە پیشەییەکانی توتنی ئەوی بووە، هەڵبژێردرا بە ئەندام لە مەحکەمەی بازرگانیدا. جەمیل ئاغا ساڵی ١٨٧٩ لە شارۆچکەی کۆیە هاتۆتە دنیا، لەوێ پێگەیشتووە، لە کۆتایی ساڵی ١٩١٨ لەسەر ئەنجامی داگیر کردنی بەریتانیا دەیکەنە یاریدەدەری حاکمی شارەکە، کە حکومەتی عێراق دادەمەزری جەمیل ئاغا دەکەنە قائیمقامی کۆیە (ئازار ١٩٢١) لە ئایاری ١٩٣٢ بۆ قائیمقامیەتی رانیە دەگوازرێتەوە، بەڵام لە ساڵی ئایندەدا واز لە فەرمانەکەی دێنی، لە حوزەیرانی ١٩٣٩ بە نوێنەری هەولێر هەڵدەبژێردری سەرلەنوی لە تشرینی یەکەمی ١٩٤٣ هەڵدەبژێردرێتەوە، هەتا کۆچی دوایی بە ئەرکی نوێنەریەتیەکە هەڵدەستێ. مەرگ لە ئازاری ساڵی ١٩٤٦ لە شوێنی هاتنە جیهانیدا لە باوەشی ژیانی هەڵگرتووە، لە ئاکامی هەڵبژاردنی بە نوێنەرایەتیەکەی (١٩٣٩) دێتە بەغدا، شوناسیم لەگەڵی پەیدا کرد، دیتم نمونەیەکە لە ئاغا رەسەنەکانی کورد کە پارێزگاریان لە خۆرسکی چیایی کردووە. پێی گوتم: *دەبینم بەغدا زۆر گۆراوە*؟ لێم پرسی: *ئایا کەی سەردانی بەغدات کردووە*.. لە وەڵامدا گوتی: *بەر لە چل ساڵ یا زیاتر لە هەرەتی لاویدا لە سەردەمی عوسمانی هاتووم*.

دێتە موسڵ لەوێ بە سواری (کەڵەك) بەزێی دیجلەوە بە گەشتێکی چەند رۆژ خایەن دەگاتە شاری ئاشتی(مدینە السلام)، چەند ساڵێك بوویتە نوێنەری حکومەت لە شارەکەیدا،

بە بیریدا نەدەهات کە دێتەوە پایتەخت و کاربەدەستانی وەزارەتی ناوخۆ دەبینی دوایی ئەوەی کە سیمای ژیانی شارەکە سەراپا گۆڕاوە و ڕێگای هاتووچوون پەیدا بووە.

(جەمیل ئاغا بەهاوبەشی لەگەڵ مەلای گەورە سکالاً نامەیان ئاراستەی حاکمی سیاسی ئینگلیزی لەکۆیە کردووە، بەڕاشکاوی پوختەی ئاوات و ئامانجی کوردستان تێدا دەربڕیووە، خواست و مافی ڕەوای کوردییان بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ لەحکومەتی بەریتانی سەرکەوتووی جەنگی یەکەمی جیهانی دەکات. ئەمە خۆی لەخۆیدا لاپەڕەیەکی شاراوەی شکۆداری پڕ شانازی جەمیل ئاغا دەگەیەنێت). (وەرگێڕ).



## محەمەد ئەمین زەکی

وەزیری زانا و مێژوونووس محەمەد ئەمین زەکی بەگ کوڕی حاجی عەبدولرەحمان (نۆسێوەتی) یە لە مانگی شوباتی ۱۸۸۰ لە شاری سلێمانی هاتۆتە جیهان، لە قوتابخانەی ئامادەیی سوپایی لە بەغدا خوێندویەتی (۱۸۹٦)، پاشان هەواری بردۆتە ئەستەنبول، چۆتە خوێندنگای سوپایی (۱۸۹۹)، لە کانونی دووەمی ۱۹۰۲ بە (ملازم سانی) دەرچووە، پاشان چۆتە کولیەی ئەرکانی جەنگی بە پایەی (رەئیس رووکن) لێی دەرچووە (۱۹۰٤)، لە سوپای شەشەمی جێگیربووی بەغدا بە ئەفسەر دادەمەزرێ. پاشان دەگوازرێتەوە بە ئەندازیار لە دەزگای (ئەملاکی سنیە)، کە دەستور لە ساڵی ۱۹۰۸ ڕاگەیەندرا دەگوازرێتەوە بۆ سوپای دووەم لە ئەدەنە، پاشان دەچێتە ئەستەنبول، دەیکەنە

ئەندامی لیژنەی نەخشەکێشان، نەخشە و خەریتەی پایتەختی تورکی و دەوروبەری داناوە (١٩٠٩)، پاشان لە ساڵی ١٩١٠ بە ئەفسەریەتی تۆبۆغرافیا کەوتە گەڵ لیژنەی دیاریکردنی سنووری تورکی و بولغاریا، دوای دوو ساڵ کارمەند بوونی لەو ئەرکەدا دەگوازرێتەوە بۆ لیژنەی دەستنیشان کردنی سنووری تورکی و رووسی لە قەفقاسدا (١٩١٢)، جەنگی بڵقان بەرپا دەبێ، بە ئەفسەر روکن خزمەتی لە تیپی پێنجەمدا لە مەیدانی (جتالجە١٩١٢) دا کردووە، پاشان لەگەڵ دەستەیەك لە ئەفسەران بۆ مەشقی سوپایی دەنێردرێتە کلیرمون لە فەرەنسە (تەموزی ١٩١٣)، نزیکەی ساڵێك لەوی دەمێنێتەوە. لە ساڵ١٩١٤ دەیگەرێننەوە بۆ لیژنەی دەس نیشان کردنی سنوری تورکی روسی، کە ئەرکی ناقار دانان کۆتایی پێدی لەگەڵ لیژنەکە دەچێتە (تفلیس)، چەند رۆژێکی بەسەردا تێناپەری جەنگە مەزنەکە بەرپا دەبێ. دەوڵەتی عوسمانی دەکەوێتە گێژەنی شەرەکەوە، لە رێگای سوێد دەگەرێتەوە تورکیا، دەیکەن بە ئەفسەر روکن لە فەیلەقی یەکەمدا، ماوەی سی مانگ بەشداری لە دەورەی فرۆکەوانی لە (ئەیائیستفانۆس) دا کرد. لە ئەیلولی ١٩١٥ بۆ پایەی موقەددەم بالا دەکرێ. دەگوێزرێتەوە بۆ کۆمیتەی ئەرکانی سوپای عێراق، لە دووی تشرینی دووەمدا دەگاتە بارەگای سرپاکە لە سەلمان پاك. پایەی (*مدیر حرکات*) لە مەوقیعی سەلمان پاك و شێخ سەعد و ئابلوقەی کوتدا دەبینی، لە نیسانی ١٩١٦ ئەرکی وەرگرتنی چەکی جەنراڵی ئینگلیزی (تاوسند) ی پێ دەسپێرن کە لە شاری کووت خۆی بەدەستەوە دا، هەروەها لە ٢٩ شارەکەش لە جیاتی سوپای تورکی وەردەگرێ، دووبارە جەیشی شەشەمی تورکی لە عێراق بە سەرکردایەتی خەلیل پاشا دادەنرێتەوە، ئەمین زەکی بە بەرێوەبەرایەتی مخابرات لێی کارمەند دەبێ. کە لە ئازاری ١٩١٧ بەغدا دەکەوێتە دەست ئینگلیز لەگەڵ سەرکردایەتی تورکی بۆ شاری موسڵ دەکشێتەوە. لە تەموزی ١٩١٧ دەیکەنە جێگری سەرەك ئەرکانی جەیشی حەفتەم بە سەرکردایەتی مستەفا کەمال پاشا (ئەتاتورك) لەگەڵ سوپاکەدا لە حەلەب دەمێنێتەوە، پاشان فەوزی پاشا دوای مستەفا کەمال سەرکردایەتیەکە وەردەگرێ، ئەمین زەکی لەگەڵ

سوپاکەدا بۆ فەلەستین دەڕوا، لە تشرینی یەکەمی ۱۹۱۷ دەگاتە شاری خەلیل بەشداری لە شەڕەکانی خەلیل ئەلڕەحمان و قدس و نابلس دەکات، لە ئەیلولی ۱۹۱۸ دەگوازرێتەوە بۆ سوپای سێیەم لە بەرەی قەفقاسدا. لە ۲۰ی تشرینی یەکەمی ۱۹۱۸ لە ئەستەنبول پێی رادەگاتەوە، لە کۆتایی ئەو ساڵەدا بە سەرۆکایەتی ئەرکانی گشتی تورکیەوە دەچنە سەر (هۆبەی مێژووی جەنگ)، مەگەر هەندێك دابڕانی کورت ئەگینا لەوی بەردەوام دەبێ تا لە ۲٤ی تەموزی ۱۹۲٤ دەگەڕێتەوە عێراق. ئەو خەلات و نیشانانەی کە وەری گرتبوو: مبداڵی جەنگ (۱۹۱٦)، میداڵی لێهاتوویی زیوین (۱۹۱٦)، میداڵی خاچی ئەڵمانی- پلەی دووەم (۱۹۱۷). دوایی پلەی یەکەمی هەمان خەلات (۱۹۱۸)، میداڵی جەنگی نەمساوی (تشرینی یەکەمی ۱۹۱۷). زۆر کتێبی بە زمانی تورکی لە سەر مێژووی جەنگ داناوە. محەمەد ئەمین زەکی کە دەگەڕێتەوە بەغدا دەیکەنە مامۆستای قوتابخانەی سوپایی (تەموزی ۱۹۲٤) دوایی دەبێتە ئامیری قوتابخانەکە و (دارالتدریب) لە هەمان ساڵدا.

بە نوێنەری سلێمانی هەڵدەبژێردری (تەموزی ۱۹۲٥)، کە پەرلەمان لە شازدەی هەمان مانگدا کۆ دەبێتەوە هەڵیدەبژێرن بە جێگری دووەمی سەرۆك. سەر لە نوی لە یەکی تشرینی دووەمی ۱۹۲٥ هەڵدەبژێردرێتەوە. پاشان لە وەزارەتی عەبدولموحسین ئەلسەعدون بە وەزیری مواسەلات و ئەشغال دادەنری (۲٤ی تشرینی دووەمی ۱۹۲٥). لە دووەمین وەزارەتی جەعفەر عەسکەری هەمان وەزارەتی پێدەسپێرنەوە (۲۱ی تشرینی دووەمی ۱۹۲٦). بە وەزیرایەتی مەعاریف دەگوازرێتەوە (٦ی ئابی ۱۹۲٦- ١٤ی کانونی دووەمی ۱۹۲۸). بە جێگری یەکەمی سەرەك پەرلەمان هەڵدەبژێردری (تشرینی دووەمی ۱۹۲۸). لە وەزارەتی تۆفیق سوێدی دەیکەنە وەزیری بەرگری (۲۸ی نیسانی ۱۹۲۹). پاشان لە چوارەمین وەزارەتی سەعدوندا دەبێتە وەزیری مواسەلات و ئەشغال (۱۹ی ئەیلولی ۱۹۲۹)، لە وەزارەتی ناجی سوێدی هەمان وەزارەتی پێدەدرێتەوە (۱۸ی تشرینی دووەمی ۲۳، ئازاری ۱۹۳۰). پاشان لە یەکەمین وەزارەتی نوری سەعیددا وەزیری دارایی و

مواسەلات و ئەشغالی پێدەسپێرن (٢ی تەموزی ١٩٣٠). هەمان پایەی لە وەزارەتی دووەمی نوری سەعیددا پێدرایەوە (١٩ی تشرینی یەکەمی ١٩٣١- ٣ی تشرینی دووەمی ١٩٣٢). سەرەرای پایەکەی خۆی جێکاری وەزارەتی بەرگریش وەردەگری (یەکی تشرینی دووەمی ١٩٣١). بە نوێنەری هەولێر هەڵدەبژێردری (کانونی دووەمی ١٩٣٢)، دەبێتە بەڕێوەبەری گشتی دارایی و هاتوچۆ( ٢٥ی ئازاری ١٩٣٣) ئینجا بەڕێوەبەری گشتی ئاودێری (ڕی) (١٢ی ئەیلولی ١٩٣٣). دوای ماوەیەکی کەم دەیگەڕێننەوە بۆ بەڕێوەبەرایەتی گشتی ئابوری (تشرینی ١/ ١٩٣٣- ٨ ئەیلولی ١٩٣٤).

جارێکیتر لە وەزارەتی سێیەمی مەدفەعی وەزارەتی دارایی و هاتوچۆ وەردەگرێتەوە (١٩٣٥)، هەروەها هەمان پایە لە وەزارەتی دووەمی هاشمی (١٧ی ئازاری ١٩٣٥- تشرینی یەکەمی ١٩٣٦). دیسان بە نوێنەری سلێمانی هەڵدەبژێردرێتەوە (ئابی ١٩٣٥- تشرینی یەکەمی ١٩٣٦). سەر لە نوی بە نوێنەری سلێمانی هەڵدەبژێردرێتەوە (کانونی یەکەمی ١٩٣٧)، دووبارە بە جێگری یەکەم هەڵدەبژێردرێتەوە (تشرینی ١٩٣٨) بە نوێنەری سلێمانی بە جێگری دووەمی سەرەك پەرلەمان دیسان هەڵدەبژێردری (١٢ی حوزەیرانی ١٩٣٩)، لە وەزارەتی پێنجەمی نوری سەعید دەکری بە وەزیری مواسەلات و ئەشغال (٢٢ی شوباتی ١٩٤٠)، پاشان دەبێتەوە وەزیری دارایی لە وەزارەتی سێیەمی گەیلانی (٣١ی ئازاری ١٩٤٠) تا ئەوەی خۆی وازی لی دێنی (٣ی تەموزی ١٩٤٠)، بە جێگری یەکەمی سەرەك پەرلەمان هەڵدەبژێردری (٥ی تشرینی دووەمی ١٩٤٠). هەروەها لە شەشەمین وەزارەتی نوری سەعیددا دەبێتەوە وەزیری مواسەلات و ئەشغال (٩ی تشرینی یەکەمی ١٩٤١)، بەڵام پایەکەی واز دەهێنی (٩ی شوباتی ١٩٤٢)، دیسان بە نوێنەری سلێمانی هەڵدەبژێردرێتەوە (تشرینی یەکەمی ١٩٤٣). دەیکەن بە ئەندامی ئەنجومەنی پیران (٢٥ی کانونی یەکەمی ١٩٤٣). لە ١٠ی تەموزی ١٩٤٨ مەرگ جیهانی پی بەجی دێڵێ؛

## دانانەکانی:

محەمەد ئەمین زەکی بە زمانی تورکی گەلێ بەرهەم و کتێبی لە سەر سوپا داناوە لەوانە: سوپای عوسمانی (بەغدا ١٩٠٨)، لێکۆڵینەوەی جەنگەکانی عوسمانی (ئەستەنبول ١٩٢٠)، چۆن عێراقمان لە دەست دا (١٩٢٠ ئەستەنبول)، مەیدانەکانی بەگژداچوونی شەری عوسمانی لە جەنگی گشتیدا (١٩٢١)، جەنگی عێراق و هەڵەکانی (١٩٢١)، شەری سەلمان پاك و پاش ماوەکانی (١٩٢٢)، بەغدا و دوا رووداوی لەدەست چوونیدا (١٩٢٣)، کورتە مێژووی جەنگی عێراق (١٩٢٣)، کتێبی دەستخەتیتری هەیە و بلاّو نەکراینەوە لەوانە: هەڵمەت بردنە سەر کوت و ئابڵوقەدانی (دوو بەش)، (*خواطر سێر دۆگلاس هێگ*)، ... هتد.

دوای گەرانەوەی بۆ عێراق گەلێ راپۆرتی گرنگی لەسەر سوپای عێراق و ئاودێری و توتن نووسیوە، کە بونەتە سەرچاوە و رابەرایەتی کاربەدەستان. کتێبی مێژوویی بە زمانی کوردی داناوە کە زۆربەشیان وەگێراون بۆ زمانی عەرەبی لەوانە: مێژوویی کورد و کوردستان بەشی یەکەمی بە کوردی لە ١٩٣١ و بەشی دووەمی لە ١٩٣٧ چاپکراوە. و محەمەد عەلی عەونی بەگ وەرگێر لە دیوانی شاهانەی میسری وەریگێراوەتە سەر زمانی عەرەبی کە بەشی یەکەمی لە ١٩٤٠ و بەشی دووەم لە ١٩٤٨ چاپکراوە. ناودارانی کورد و کوردستان لە دوو بەش (١٩٤٥-١٩٤٧)، مێژووی سلێمانی و دەوروبەری بە کوردی ١٩٣٩، بە عەرەبییەکەی ١٩٥١.

محەمەد ئەمین زەکی بەگ پیاوێکی رەوشت کارامە بووە، ساتێکی لە کات و وەختی ژیانی خۆی بەفیرۆ نەداوە لە فەنن و هونەری سوپاییدا بالاّ دەست بوو، کچەکەی لە سەری دەدوی دەڵێ: سەراپا ژیانی خۆی هەمووی بۆ خزمەتی گەل و نیشتیمانەکەی تەرخان کردبوو، مرۆڤ بوو بە هەموو مانای وشەوە، لە هەموو ساتێکا هێمن و لەسەرخۆ ، دوژمنێکی هەرە گەورەی توندرەوی بوو، بروای وابوو کە زانیاری و زانست چاکترین

هۆی راپەرینی گەل و دەستکەوتنی مافەکانیەتی، دەڵێ: بە نیاز بوو یاداشتەکانی خۆی بنووسێتەوە، بەڵام نەخۆشی پەکی خست و مەرگ زوو بەرەنگاری بوو، چەند دێڕە شیعرێکی بە کوردی هۆنیوەتەوە. خواستی بوو لەسەر گۆڕەکەی نەقش بکرێ، کچەکەی لەسەری دەروا و دەڵێ: پیاوانی سەردەم و هاوچەرخەکەی دەیانزانی کە باوکم شاعیر بووە و چێژی لە شیعر وەرگرتووە، کەم کەس لەسەر حەقیقەتی خۆی ناسیویەتی، مرۆڤێك بوو لە سینەیدا دڵێکی پڕهەست و ناسك لە مێشکیا هۆش و عەقڵی زانایەکی بەرز، هونەرمەندێکی بەتوانا بوو بەهرەی لە وێنەکێشانی رەسەنایەتیدا هەبوو.

## هەیبەتوڵڵای موفتی

هەیبەتوڵلا کوڕی محەمەد سەعید کوڕی عەبدولڕەحمان کوڕی مەلا یەحیای مزوری ئامێدیە، مەلا یەحیای باپیرە گەورەی بەناوبانگ بووە (١٧٧٢-١٨٣٧)، لە گەورە زانایانی ئایینی دەژمێردرا، مامۆستای (*ثناء الالوسی*) بووە.
هەیبەتوڵلا لە ساڵی ١٨٨٠ لە ئاکری هاتۆتە دنیا، زانیاریەکانی شەرع دەخوێنێ، لەسەر دەستی زانای هەولێر ئەبوبەکر مەلا ئەفەندی دەرچووە، ساڵی ١٩٠٦ بوویتە موفتی شارەکەی و مودەریس لە مزگەوتی گەورەدا، ساڵی ١٩٠٩ سەرۆکایەتی ئەنجومەنی مەعاریفی پێ سپێردراوە، دەیکەنە قازی ئاکری (١٩٢٨). بە نوێنەری موسڵ هەڵدەبژێردری (١٩٢٥)، سەر لە نوی لە ساڵانی (١٩٢٨-١٩٣٠) و (١٩٣٣)، (١٩٣٤- ١٩٣٥)، (١٩٣٧- ١٩٣٩)، (١٩٣٩- ١٩٤٣) و (١٩٤٣- ١٩٤٦) هەڵدەبژێردرێتەوە، دەبێتە جێگری سەرەك پەرلەمان (١٤ی ئازاری ١٩٤٠). سەرلەنوی لەم ساڵانەشدا هەڵبژاردنەکەی بۆ نوی دەکرێتەوە (یەکی تشرینی دووەمی ١٩٤٢)، (تۆی تشرینی یەکەمی ١٩٤٣)، (یەکی کانونی یەکەمی ١٩٤٢- کانونی یەکەمی ١٩٤٤)، دەیکەنە ئەندامی ئەنجومەنی ئەعیان (٣٠ی حوزەیرانی ١٩٤٧)، بە جێگری دووەمی

سەرەك ئەنجومەنەکە هەڵدەبژێردری (یەکی کانونی یەکەمی ١٩٤٧)، ساڵ لە دوای ساڵ هەڵدەبژێردرێتەوە، هەتا پایانی ژیانی لە ١٠ی کانونی دووەمی ١٩٥٥.

### ئەحمەد کەرکوکلی

ئەحمەد کەرکوکی ناسراو بە ئەحمەد ئاغای کەرکوکلی زادە، لە بازرگانەکانی بەغدایە، دەچێتەوە سەر خێزانێکی بەناوبانگی کورد، لە ساڵی ١٨٨١ هاتۆتە دنیا، هەر لە زوویەکەوە خەریکی بازرگانی دەبێ، لە شوباتی ١٩٣٧ بە نوێنەری کەرکوك هەڵدەبژێردرێ، سەرلەنوی لە کانونی یەکەمی ١٩٣٧ هەڵدەبژێردرێتەوە، شوێن و پایەیەکی بەرزی لە ناو کۆڕ و مەجلیسی بازرگان و کۆمەڵایەتیەکاندا هەبوو، تەحسین عەلی نامەیەکی سەیر و سەمەری کە ئەحمەد ئاغا لە هەندێك گەشت و سەفەرەکانیدا بۆی ناردبوو، لای خۆی هەڵی گرتبوو، نامەکە خۆی لە خۆیدا هەرەمەیەکی تێکەڵاو بە شێوازی ڕێزمانی و ڕەشۆکی عەرەبی و کوردی و فارسی بوو، ناوی لی ناوە (پینە و پەرۆی ئەحمەد ئاغا) !! تەحسین عەلی بۆ خۆشی بە پیاوێکی مەشرەبخۆش و نوکتەبێژ ناسرا بوو. وەکو نمونەیەك لە ئەدەبی ڕازاوە بۆ گوێگرانی دەخوێندەوە!! ئەحمەد ئاغا لە ٢٥ی حوزەیرانی ١٩٧١ لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە.

### میرزا فەرەج شەریف زادە

لە پیاوانی کار و بازرگانیەتیدا میرزا فەرەج حاجی شەریف لە ساڵی ١٨٨١ هاتۆتە دنیا، لەسەر دەستی مامۆستایانی تایبەتی دەخوێنێ، پاشان وەك ئەندامانی خێزانەکەی ئاسا خۆی بە کاروباری بازرگانیەوە خەریك کردووە. لە سەردەمی عوسمانیدا هەڵدەبژێردری بە ئەندامی ئەنجومەنی بەرێوەبردنی لیوای سلێمانی. دوای جەنگە مەزنەکە دەگوازرێتەوە بۆ بەغدا (١٩٢١)، لەوێش هەر خەریکی بازرگانی دەبێ. دەبێتە نوێنەری شارەکەی لە ئەنجومەنی دامەزراندا (*المجلس التاسیسی ١٩٢٤*). دوای ئەوە لە پەرلەمان (١٩٢٥-١٩٢٨)، کارمەند دەبێ لە ژووری بازرگانی بەغدا و کۆمەڵانی خێرخواز و ڕۆشنبیریدا، وەك کۆمەڵەی فرۆکەوانی عێراق و هیتر.

جارێکیتر لە کانونی یەکەمی ١٩٣٧ بە نوێنەری سلێمانی هەڵدەبژێردرێتەوە. گەشتوگوزاری بۆ تورکیا و وڵاتانی عەرەبی کردووە، زمانی عەرەبی، کوردی، تورکی و فارسی باش زانیوە. لە ١٢ی تشرینی دووەمی ١٩٥٣ جیهان بەجی دێڵێ.

**سەبیح نەشئەت**

ئەحمەد سەبیح نەشئەت کوڕی بەکر ئەربیلی ساڵی ١٨٨٢ لە سەماوە لە دایك بووە، لە کاتێکا نەشآئەت ئەفەندی باوکی لەوی قایمقام دەبێ، بنچینەی بنەماڵەکەی لە هەولێرە، بەکر کوڕی مەحمودی باپیری لە کاتی خۆیدا هەوار دەگوێزێتەوە لە بەغدا نیشتەجی دەبێ، ساڵی ١٨٧٩ ئەندامی ئەنجومەنی شارەوانی بووە، سەبیح نەشئەت لە بەغدا خوێندویەتی، روو دەکاتە ئاستانە، لە خوێندنگای سوپایی بە ملازم دەردەچی (١٩٠٠)، دەچێتە قوتابخانەی ئەرکانی جەنگ، لە ١٩٠٣ بە رەئیس روکن دەرچووە، لەو بوارەشدا دەورەی سوپایی لە ئەڵمانیاو فەرەنسا دەبینی، بەئەفسەر دەکەوێتە پاڵ سوپای شەشەمی تورکی لە بەغدا، پاشان بە ئەندازیار لە ئەملاکی سنیە لە عەمارە دەست بەکار دەبێ. کچی لیوا یوسف پاشا سەرکردەی تورکی و جێگاری والی بەغدای هێناوە، کە دەستوری عوسمانی راگەیەندرا دەگەرێتەوە ئەستەنبۆڵ، دوایی دەیکەنە بەرێوەبەری قوتابخانەی دەرەك (جندرمە) لە ئەزمیر، بۆ پایەی مقدم باڵا دەکرێ، دەکەوێتە گەڵ تیپی بیست و نۆیەم، بەڵام دوای ئەوە دیسان دەچێتەوە ئاستانە، کەساڵی ١٩١٢ جەنگی بولقان بەرپا دەبێ دەچێتە کۆڕی جەنگەوە، پاشان دەیکەن بە ئەندامی لیژنەی دیاریکردنی سنوری تورکی و ئێرانی (١٩١٣)، پاشان سەرکردایەتی دەرەکی لە بەیروت پی دەسپێرن، ساڵی ١٩١٤ ئاگری شەری گەورە هەڵگیرسا دەبێتە سەرکردەی تیپی (ناسرە)، دوایی دەگوازرێتەوە بە ئەفسەر روکن لە دەست و پێوەندی جەمال پاشا سەرکردەی فەیلەقی چوارەم لە سوریا و لوبنان و فەلەستیندا، پاش ئەوە لە مەدینەی منەوەرە دەبێتە سەرەك ئەرکان حەرب لە سوپای تورکی بەسەرکردایەتی فەخری پاشا، ئینجا پشکنێنەری ئازوقەی سوپایی لە ئەستەنبۆڵ دا، لە ١٤

ئەیلول ١٩١٨ لە پایەی مقدمدا تەقاعود دەکرێ. دەکەوێتە کاری بازرگانیەوە، بۆ ئەم مەبەستەش دەچێتە بەرلین و پاریس، بەڵام سەرکەوتنێکی ئەوتۆی بەدەست نەهێناوە، دەگەڕێتەوە بەغدا، لە یەکی نیسان ١٩٢٢ لە ئاڵوگۆڕی وەزارەتی دووەمینی نەقیب دا دەبێتە وەزیری مواسەلات و ئەشغال، لە وەزارەتی سێیەمینی نەقیب دا هەمان وەزارەتی پێدراوە (٣٠ ئەیلول ١٩٢٢-١٧ تشرینی دووەم ١٩٢٢)، دوای ئەوە دەبێتە سەرەك شارەوانی بەغدا (١٣ شوبات ١٩٢٣)، بریکاری مەتەسەریفی بەغدا (٥ ئەیلول ١٩٢٣)، پاشان لە کابینەی وەزارەتی یەکەمی جەعفەر عەسکەری بەوەزیرایەتی مواسەلات و ئەشغال بەشدار دەبێ (٢٢ تشرینی دووەم ١٩٢٣-٣ ئاب ١٩٢٤)، بەنوێنەری هولێر لە ئەنجومەنی دامەزراندنا هەڵدەبژێردری (١٩٢٤)، دەبێتە نوێنەری عێراق لە کۆنگرەی (محەمەرە) بۆ دیاریکردنی سنوری عێراق نەجد (مایس ١٩٢٢)، هەروەها لە کۆنگرەی (عەقیر). دوو پرۆتۆکۆڵی بۆ ڕێکخستنی کاروباری عەشیرەتەکان لەگەڵ نەجد دانا، دەبێتە نوێنەری عێراق لە کۆنگرەی کوێتدا کە لە کانونی یەکەم ١٩٢٣ لەبەینی عێراق و نەجد و حیجازو شەرقی ئوردن بەسترا، ئەوەش بۆ مەبەستی پەیوەندی دۆستایەتی نێوان ئەو وڵاتانە بوو، پایەی عەقیدی لە سوپای عێراق پی دەدرێت، بەڵام هەربەناو تا ساڵی ١٩٢٥ تێیدا دەمێنێتەوە، پسپۆڕی عێراق بووە لەمەسەلەی موسڵدا (١٩٢٥). بەنوێنەری هەولێر هەڵدەبژێردری (١٩٢٥-١٩٢٧)، بە وەزیرایەتی بەرگری بەشداری لە وەزارەتی دووەمی سەعدون دەکات (٢٦ حوزەیران ١٩٢٥) و بریکاری وەزارەتی مواسەلات و ئەشغال (٢٥ تەموز ١٩٢٥)، ئینجا وەزیری دارایی (٢٤ تشرینی دووەم ١٩٢٥-٢١ تشرینی دووەم ١٩٢٦)، پاشان دەبێە نوێنەری حکومەت لە کۆمپانیای نەفتی تورکی دا (٢ ئاب ١٩٢٧)، دوایی دەبێتە نوێنەری سیاسی عێراق لەتورکیادا (٢٦ کانونی یەکەم ١٩٢٧)، لە١٨ کانونی دووەم ١٩٢٨ لە پایەکەی دەست بەکار دەبێ لە ئەنقەرە. پلە و پایەی بۆ وەزیر مفەوەز بەرز دەکرێتەوە (١٢ ئەیلول ١٩٢٨).

وەزیرێکی زرنگ و مەشرەبخۆشی نوکتەبێژ و دەم بە پێکەنین بووە، لە ساڵەکانی دواییدا پەیوەندیەکی دۆستایەتی بەتینی لەگەڵ مستەفا کەمال (ئەتاتورك) پەیدا کردبوو. *روفائیل بطي* دەڵێ: دوای ئەوەی ئاماژە بۆ زیرەکی و بەهرەمەندیەتی سیاسی و بیرتیژی و بە هۆی نوکتە و گاڵتە پڕ ئامێزەکانی توانی سەرکەوتن بەسەر گیروگرفتی وتووێژی کۆنگرەی محەمەرە و عەقیر و کوێتدا بەدەست بێنێ. توانی خۆشی و نیازپاکی بخاتە دڵی هەموویانەوە. دەڵێ: ئەوەی کاری کردبووە سەر کۆنگرەی کوێت پارچە زەویەك بوو لە نێوان عێراق و نەجد، هەردوولا رێك کەوتن کە بیکەنە ناوچەیەکی بێلایەن، بەڵام لە ناو لێنانەکەیدا سەریان سوڕمابوو، سەبیح پێشنیاری کردووە کە ناو بندری بە (پاقلاوە) چونکە هەر بە پاقلاوە دەچێ، گەشبینی لە ناوەکەشیدا وای بۆ لێکدەدانەوە کەوا شیرینی ببێتە رەمز و نیشانەی خۆشەویستی و دۆستایەتی هەردوو هەرێمی عەرەبی دراوسێ.

لە زانیاریەکانی سوپاییدا شارەزا بوو، رۆشنبیریەکی بەرفراوان و خوێندنەوەی گەلی زۆر بووە. لە ١٩ی تەموزی ١٩٢٩ لە ئەستەنبول مەرگ جیهانی پێ بەجێ دێڵێ.



## مەعروف عەلی ئەسغەر جیاوك

مەعروف کوڕی عەلی ئەسغەر جیاوك، باوکی ئیمام و مودەریسی سوپا بووە، بەڵام مەولود سەعدی (*بدیع الزمان*) ی باپیری لە سەردەمی خۆیدا لە زانا بەناوبانگەکانی شەرع بووە لە کوردستانی باشوردا، دەچێتەوە سەر عەشیرەتی باڵەك کە نیشتەجێی ناوچەی رەواندوزی سەر بە هەولێرە، لە ساڵی ١٨٨٤ لە بەغدا هاتۆتە دنیا، ساڵی ١٩١٢ بڕوانامەی دواناوەندی بەدەست هێناوە، چەند فەرمانبەریەتێکی جیاجیای بینیوە، پاشان

دەچێتە خوێندنگای حقوق لە ئاستانە، بڕوانامەکەی لێ وەردەگرێ، کە دەستور راگەیەندرا کەوتە گەڵ حیزبی ئەحرار بە سەرۆکایەتی ئەمیر سەباحەدین، دەستی کردووە بە نووسینی وتار لە رۆژنامەکانی ئەستەنبولدا. لە کاتی روودانی بزوتنەوە کۆنەپەرستیەکەدا لە ١٣ی نیسانی ١٩٠٩ ناچار دەبێ کە ماوەیەك خۆی بشارێتەوە، پاشان دەگەرێتەوە بەغدا، رۆژنامەیەکی بە ناوی (حقوق) دەرچواندوە (١٩١٢). دەیکەنە یاریدەدەری بەرێوەبەری خانەی مامۆستایان لە بەسرە (١٩١٣)، کە جەنگە مەزنەکە بەرپا دەبێ دەچێتە کۆڕی شەرەکەوە، ئینگلیزەکان بە دیلی دەیگرن بە بەندیەتی دەینێرنە (بڕمە)، لە ساڵی ١٩١٤ هەتا ساڵی ١٩١٩ لەوێ دەمێنێتەوە، پاشان دێتەوە بەغدا بەشداری لە بزوتنەوەی نیشتیمانیدا دەکات، خەریکی کاری پارێزەرایەتی دەبێ، دەیکەنە حاکم لە دادگاکانی کەرکوك (١٩٢٣)، بۆ حاکمی بەدائەی هەولێر دەگوازرێتەوە (١٩٢٤)، ئینجا حاکمی سوڵحی دیوانیە (١٩٢٥)، دوایی لەحەی (١٩٢٦) و موسەیەب (١٩٢٧)، لە ساڵی ١٩٢٨ بە نوێنەری هەولێر هەڵدەبژێردرێ، دەبێتە جێگری یەکەمی سەرەك پەرلەمان (٩ی حوزەیرانی ١٩٢٨) دەیگەرێننەوە، بە حاکمی (مونفرید) ی کەربەلا (١٩٣١)، دوایی حاکمی (بەدائەی) کەرکوك (١٩٣٣)، پاشان جێگری یەکەمی سەرەك مەحکەمەکە (١٩٣٤)، دەگوازرێتەوە بە پشکنێنەری دادوەری (١٩٣٦)، دوایی جێگری سەرەك مەحکەمەی بەدائەی حلە (١٩٣٦)، جا پشکنێنەری دادوەری پاشان داواکاری گشتی ١٩٣٨، بە (مودون قانون) ی دەگوازرێتەوە (١٩٤١)، دوایی ئەندام لە مەحکەمەی تەمیز (١٩٢٤)، پاشان پارێزگاری سلێمانی (١٩٤٤).

لە ئاداری ١٩٤٦ تەقاعود دەکرێ، لە ئابی ١٩٤٦ دەیگەرێننەوە بۆ فەرمانی بەرێوەبەری گشتی ئینحیساری توتن، لە کانونی دووەمی ١٩٤٧ واز لە خزمەتگوزاری دێنێ، لە ٢١ی کانونی دووەمی ١٩٥٨ جیهان بەجێ دێڵێ. لە هەولێر بەخاك دەسپێردرێ. وتارەکانی کە لە رۆژنامەکاندا نووسیوی لە کتێبێکدا لە ژێر ناوی (*القضية*

*الکردیة*) بلاو کرایەوە (١٩٢٥). هەڵوێستی توندی لە ئەنجومەنی نوێنەراندا نواندووە (١٩٢٨- ١٩٣٠)، لە کۆبونەوەی پێش خۆکوشتنی عەبدولموحسین سەعدونی سەرەك وەزیران مەعروف جیاوك هێرشێکی سەخت و بەتینی هێناوەتە سەری و پێدەڵێ: ئێوە مەبەستانە شۆڕش لە ولاتەدا بەرپا بێ. مەعروف جیاوك کتێبێکی لەسەر رێنووسی کوردی داناوە (١٩٣٠)، و (*مأساة بارزان المظلومة*) (١٩٥٤)، لە بەرهەمەکانی تری (*لیایتی*) (١٩٣٨)، لەگەڵ پەندی پێشینان بە زمانی کوردی.

## سدیق مەزهەر مستەفا

سدیق مەزهەر کوڕی مستەفا لە بنەماڵەی بنزرت لی زادەیە، بنچینەی خانەوادەی لە سەردارانی هۆزی ئاکۆی کوردی دانیشتوانی رانیەی سەر بە لیوای هەولێرە. ساڵی ١٨٨٢ لە کەرکوك هاتۆتە دنیا، قوتابخانەی دواناوەندی لە بەغدا تەواو دەکا، پاشان رووی کردۆتە ئاستانە، دەچێتە خوێندنگای حقوق (١٩٠١)، لە ساڵی ١٩٠٥ لێی دەرچووە، لە سەردەمی تورکەکاندا لە عێراق فەرمانەکانی حقوقی بینیوە، لە قوتابخانەی پۆلیس دەبێتە مودەریسی یاسا، دوایی بەرێوەبەرایەتیەکەی، پاشان جێکاری سەرەك شارەوانی بەغدا، ئینجا حاکم لە دادگای ئیستیئناف، لە تشرینی دووەمی ١٩١٨ بۆتە یاریدەدەری حاکمی سوڵح لە موسڵ، دوایی حاکمی (مونفەرید) لە سلێمانی و لە هەولێر جا حاکمی سوڵحی نەجەف (١٩٢٥)، پاشان حاکمی جەزای بەسرە، دوایی حاکمی منفرید لە کەرکوك، و سەرۆك عەدلیەی ناوچەکە، لە تشرینی دووەمی ١٩٣١ دەبێتە جێگری سەرۆك مەحکەمەی بەدائەی موسڵ، پاشان بووە ئەندام لە مەحکەمەی تەمیز (تشرینی دووەمی ١٩٣٤)، دوایی دەبێتە (مدون قانونی) هەتا تەموزی ١٩٤٠، دەیگەرێننەوە بۆ سەرۆکایەتی مەحکەمەی بەدائەی کەرکوك (نیسانی ١٩٤٢). ئیتر لە فەرمان دەستبەردار

دەبێ. بە نوێنەری رانیە هەڵدەبژێردری (ئازاری ١٩٤٧– شوباتی ١٩٤٨). دەبێتە جێگری دووەمی سەرەك پەرلەمان بەڵام لە ١٣ی نیسانی هەمان ساڵدا واز دەهێنێ. دوای ساڵی ١٩٧٤ کۆچی دوایی دەکات.

## محەمەد حەبیب تاڵەبانی

شێخ محەمەد حەبیب کوڕی شێخ عەلی کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی ئەحمەد تاڵەبانییە، بنچینەی بنەماڵەکەی لە گوندی تاڵەبان نزیك شارۆچکەی چەمچەماڵە، سەرۆکایەتی ئایینی و شێخایەتی سۆفیەتی یان لە سەر ڕێبازی قادری هەبووە، شێخ عەلی کوڕی شێخ عەبدولرەحمانی باوکی لە زانا ناودارەکانی ئایینی و شێخانی ڕێبازی قادری بووە، لە ساڵی ١٩١٢ لە کەرکوك کۆچی دوایی کردووە.

محەمەد حەبیب ساڵی ١٨٨٤ لە کەرکوك هاتۆتە جیهان. زانیارییەکانی ئایینی و زمانی عەرەبی دەخوێنێ، لە تەموزی ١٩٢٠ بووەتە مودیر ناحیەی قەرەحەسەن، بە نوێنەری کەرکوك بۆ ئەنجومەنی دامەزراندن هەڵدەبژێردرێ(١٩٢٤)، پاشان بە نوێنەری ئەو شارە بۆ پەرلەمان هەڵدەبژێردری (١٩٢٥)، کە دەورەی پەرلەمان کۆتایی دێت بە قازی شەرعی کەرکوك دادەمەزی (کانونی یەکەمی ١٩٢٨)، دووبارە لە تشرینی دووەمی ١٩٣٠ و شوباتی ١٩٣٣ بە نوێنەری پارێزگای کەرکوك هەڵدەبژێردرێ. لە کانونی دووەمی ١٩٣٤ دەیکەنە سەرەك شارەوانی کەرکوك، پازدە ساڵ لە پایەکەی دەمێنێتەوە، لە تەموزی ١٩٤٦ واز لە خزمەت دەهێنێ. شێخێکی مەشرەبخۆش و نوکتە شیرین و بیر ئازاد و دوور لە توندڕەوی بووە.. لە ئەیلولی ساڵی ١٩٥٩ لە بەغدا جیهان بەجێ دێڵێ.

## فایق تاڵەبانی

فایق شێخ رەئوف تاڵەبانی دەچێتەوە سەر بنەماڵەیەکی ناسراوی کەرکوك. لە ساڵانی ١٩٣٥ و ١٩٣٩ بە نوێنەری کەرکوك هەڵدەبژێردرێ، لە ئابی ١٩٥٦ کۆچی دوایی

دەکات، ئەو فایقە کوڕی محەمەد ڕەئوف کوڕی عەلی تاڵەبانیە. لە پیاوە ناسراوەکانیتری ئەو بنەماڵەیە شێخ عەبدولوەهاب کوڕی شێخ مەجید کوڕی عەزیز تاڵەبانیە.. لە کانونی یەکەمی ۱۹۳۷ و تشرینی یەکەمی ۱۹٤۳ لەگەڵ حوزەیرانی ۱۹٤۸ بە نوێنەری کەرکوك هەڵدەبژێردرێ.

## خدر ئەحمەد دزەیی



خــدر بــەگ کــوڕی ئەحمــەد پاشــا ســەرۆکی عەشــیرەتەکانی کــوردی دزەییــە کــە لــە خــوار ناحیــەی قوشــتەپە و هــەموو ناوچــەکانی قــەزای مــەخمور لــە پارێزگــای هــەولێرن. ئەحمــەد پاشــا لــە بنەماڵــەی حوســێن ئاغــای بەناوبانگــە کــە پایــەی پاشایەتی لە دەوڵـەتی عوسمـانی لـە سـەردەمی والی بەغــدا تەقیــەدین پاشــا پێــی دراوە، لــە ئــەیلولی ۱۹۲۰ ئاژاوەی لە ڕووی کاربەدەستانی بـەریتانی لەگەڵ حاجی پیرداود ئاغـای دزەیـی لـە هەنـدێك ناوچەی هەولێر بەرپا کرد، بەڵام مەلا ئەفەندی بە لایەنگری ئینگلیزەکان وەستا.[41]

---

[41]- بنەماڵەی دزەیی یان لە بنچینەدا لە دێی (دزدی) گوندی سەید تەهای نـەهری لـە کوردسـتانی بەشـی ئێرانەوە لەبەر هەر هۆیەك بوبێ هاتینە ناوچەی قوشتەپە نزیك شاری هەولێر و ئەم خانەوادەیەش لـە چـوار بەرەباب پێك هاتین و هەر یەکێك لەو بەرەبابانەش سەردار و براگەورەی تایبەتی خۆیان هەیە.

۱- بەرەبابی ماڵی پاشا کە خدر بەگ دوای مردنی باوکی دەبێتە سەردار و سەرۆکیان.

۲- بەرەی ماڵی فارس: برا گەورە و سەرداریان مەعروف پیرداود ئاغا بووە.

۳- بەرەی ماڵی بایز: گەورە پیاو و سەرۆکیان برایم ئاغا بور کە لە مەخمور دادەنیشێت دوای ئەو ئەحمەد حەمەد ئەمین لە دوو گردکان بوو.

خدر ئەحمەد لە شوباتی ١٩٣٧ بە نوێنەری هەولێر هەڵدەبژێردرێ، سەرلەنوێ لە کانونی یەکەمی ١٩٣٧، تشرینی یەکەمی ١٩٤٣، ئازاری ١٩٤٧، حوزەیرانی ١٩٤٨، کانونی دووەمی ١٩٥٣، ئەیلولی ١٩٥٤ و ئایاری ١٩٥٨ هەتا شۆڕشی ١٩٥٨ هەڵدەبژێردرێتەوە.

خدر ئەحمەد ساڵی ١٨٨٢ هاتۆتە دنیا، لە ئازایەتی و سوارچاکی و راستگۆیی و بەهرەی نیشانشکێنی و راووشکاردا نمونەیەك بوو لە سەردارانی کوردی دێرین، ئێستاش ئەگەرچی تەمەنی خۆی لە نەوەد ساڵ داوە لەگەڵ ئەوەشا تەندروستی و چوستی و چالاکی خۆی پاراستووە، پاش ساڵی ١٩٧٥[42] لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە.

---

٤- بەرەی ماڵی کاکە خان: عەلی مەحمود سەرداریان بووە. هەواری گوندی مورتکە دەبێ. بەشێك لە بنەماڵەی کاکە خان بە مام خولەیی ناسراون. براگەورەیان سلێمان ئاغا لە دیبەگە نیشتەجی بووە. "وەگێڕ"

42 ساڵی ١٩٥٣ ساڵی تازە دەرچوونی خوێندنم بوو بەڕێوەبەری قوتابخانەی قوڕشاغلو بووم. خدر بەگ زووزوو سەردانی ئەو گوندەی دەکرد کە هی ئاغای برای بوو (باوکی حاکم رەحمان ئەندامی مەحکەمەی تەمیز). دۆستایەتیمان لەگەڵ خدر بەگ خۆش بوو، ئەو شەوەم هەرگیز لەبیرم ناچێتەوە کە لە دیوەخانی ئاغا دانیشتبووین زۆربەی خەڵکی گوندەکەش لەوێ بوون. لە ناکاو خدر بەگ بە ژوور کەوت، تێکڕا هەستاینە سەر پێ. دوای سڵاوکردن بەلای سەرەوەدا هات و رووبەڕووی حاجی رەسوڵ وەستا کە لە تەنیشت من وەستابوو. ئاغا تاوێك لە حاجی راما، پاشان کوتوپڕ دەمانچەکەی هەڵکێشا و کەوتە گوللەباران کردنی حاجی. چواردە گوللە یەك لەدوا یەك بە پشتە سەر و بە چەپ و راستیدا رەت بوون و هەموویان تاکە پەنجەیەك لە لەشی حاجی دوور بوون. تەوژمی دەمانچەی چواردەخۆر ژوورەکەی دەهەژاند، حاجیش وەك تاوێرە بەرد رەق وەستابوو هەستی لە خۆی بڕیبوو، دەستەکانی بە خۆیدا شۆڕکردبۆوە. پاشان خدر بەگ دەستی کرد بە پێکەنین و هەندێك جنێوی بە حاجی دا. بەراستی من حەپەسام و سەرم لەوە سوڕما، هەندێك لە گوللەکانیش نێوان من و حاجیان گرتەوە! گوتم: *حاجی دەك ماڵت بە قوڕ گیری ئەوە چۆن نۆقرەت گرت نەجوڵای و نەشێوای؟* گوتی: *مامۆستا شارەزای دەست و قامی نیشانشکێنی*

## داود حەیدەری



داود پاشای حەیدەری، ئەو داود وەهبییە کوڕی ئیبراهیم (شێخی ئیسلام) کوڕی عاسم حەیدەرییە. ساڵی ١٨٨٦ لە هەولێر هاتووەتە دنیا. قوتابخانەی دواناوەندی لە موسڵ تەواو کردووە، دوای ئەوە روو دەکاتە ئەستەنبول (١٩٠٤)، دەچێتە خوێندنگای حقوق بڕوانامەکەی لە ١٩٠٨ لی وەردەگرێت، لە هەمان کاتیشدا فەرمانبەر بووە لە وەزارەتی مەعاریفی تورکی (شوبات ١٩٠٤)، دوایی وەکیلی دەعاوی (حوزەیرانی ١٩٠٨- ئەیلول

ی ١٩٠٩)، پاشان خەریکی پارێزەری دەبێ، کە جەنگی مەزن بەرپا دەبێ لە تەك سوپای تورکیدا دەچێتە کۆڕی جەنگەوە. لە ساڵی ١٩٢١ دێتە بەغدا، بە پشکنێنەری دادوەری دادەمەزری (١٩٢٢)، لە تشرینی یەکەمی ١٩٢٢ بۆتە ئەمینداری دەربارەگا (*البلاط الملکی*). بە نوێنەری هەولێر بۆ ئەنجومەنی دامەزراندن هەڵبژێردراوە (١٩٢٤)، دەکری بە جێگری سەرۆکەکە (١٩٢٤)، لە ئاکامی هەڵوەشانی ئەنجومەنەکەدا بە ئەمینداریێتیی دەرباری پاشا دەگەڕێتەوە (٧ی ئابی ١٩٢٤)، بە نوێنەری هەولێر بۆ پەرلەمان هەڵدەبژێردری (تەموزی ١٩٢٥)، بە جێگری دووەمی سەرەك پەرلەمان (١٩٢٦)، سەر لەنوی لە ١٩٢٧ هەڵدەبژێردرێتەوە، پاشان لە ئایاری ١٩٢٨ دەبێتە جێگری یەکەمی

---

*ئەوم هەر بجولاَبام مێشکی دەهاریم*! .. خدر بەگ تا بڵێی مەشرەبخۆش و خێرخواز و بێ فیز بوو - (وەرگێر).

سەرۆكی ئەنجومەنەكە، دەبێتە وەزیری داد لە وەزارەتی سێیەمی سەعدوندا (٤ی حوزەیرانی ١٩٢٨- ٢٨ی نیسانی ١٩٢٩). لە وەزارەتی ئایندەی تۆفیق سویدی بە وەزیرایەتی داد بەردەوام دەبێ (٢٨ی نیسانی ١٩٢٩- ١٩ی ئەیلولی ١٩٢٩). هەڵبژاردنەكەی بە نوێنەرایەتی هەولێر لە ساڵانی ١٩٢٨، ١٩٣٠، ١٩٣٣ هەتا ئەیلولی ١٩٣٤ نوی دەكرێتەوە. دوای ئەوە بە كاری پارێزەری و راوێژكاری یاسایی لە كۆمپانیاكەی نشوتمای نەوتی بەریتانی هەڵدەستێ. لە كاتی بزوتنەوەكەی رەشید عالی گەیلانی داود حەیدەری بەرەو عممان و قودس دەروات، لەگەڵ ئەمیر عەبدولئیلا دەگەرێتەوە بەغدا. لەسەر ئەنجامی ئەوەدا دەیكەنە وەزیری مفەوەزی عێراق لە تەهران (حوزەیرانی ١٩٤٦)، دوایی وەزیری داد (٩ی شوباتی ١٩٤٢- ٢٣ی حوزەیرانی ١٩٤٣). بە نوێنەری سلێمانی هەڵدەبژێردری (نیسانی ١٩٤٢)، پاش ئەوە بە وەزیر مفەوەزی عێراق لە لەندەن دادەمەزری (تشرینی یەكەمی ١٩٤٣)، دوو ساڵ لە پایتەختی بەریتانی بەسەر دەبا. دەیكەنە ئەندام لە ئەنجومەنی (ئەعیان- ١٩٤٥- ٥ ئازاری ١٩٤٩).

كاتی واز لە راوێژكاری كۆمپانیاكانی نەفت دێنی بە جێگری دووەمی سەرەك ئەنجومەنی ئەعیان هەڵدەبژێردری (١٧ی ئازاری ١٩٤٧)، بەڵام لە سێی نیسانی ١٩٤٧ خۆی لە ئەركەكە دەستبەردار دەكا. لە وەزارەتی سید محەمەد سەدر دەیكەنە وەزیری بی وەزارەت (٢٩ی كانونی دووەمی ١٩٤٨)، پاشان وەزارەتی كاروباری كۆمەڵایەتی پی دەسپێرن (٤ی ئازاری ١٩٤٨- ٢٥ی حوزەیرانی ١٩٤٨). ساڵی ١٩٥٨ عێراق بەجی دێڵی و ژیانی لە هاتوچوونی نێوان توركیا و سویسرا و فەرەنسا بەسەر بردووە، تا لە ٢٠ی تشرینی دووەمی ١٩٦٥ لە ئەستەنبول جیهان بەجی دێڵێ.

ئەمیر عەبدوڵلا ئەمیری رۆژهەڵاتی ئوردن پایەی پاشایەتی پی بەخشیوە (كانونی یەكەمی ١٩٣٣). داود حەیدەری گوتی: ساسۆن حسقێل وەزیری دارایی رەحمەتی خوای لێبی خێرێكی زۆرم لی دی كە پێی داگرت لەسەر ئەوەی كە دەبێ بەرهەم و دەستكەوتی نەفت

لەسەر بنەما و ئەساسی زێڕ بدرێت، کە بە راوێژکاری کۆمپانیای نەفتی بەریتانی دامەزرام هەمان مەرجم لە بارەی موچەکەوە دانا، سودێکی زۆرم لی بینی، دوای ئەوە بەریتانیا لەسەر دەستوری زێڕ هاتە دەر و نرخی پاوەندی ئیستەرلینی دابەزی.

داود حەیدەری لە پاش کۆتایی جەنگی جیهانیدا لە ساڵی ١٩٤٥ لەگەڵ ئەمیر عەبدولئیلای وەسی لەسەر عەرش بە سەردانە رەسمیەکەی بۆ وڵاتە یەکگرتوەکان دەچێت. لەو گەشتەشیدا سندرسن دکتۆری تایبەتی ئەمیر لەگەڵ یان دەبێ لە کتێبەکەیدا (دە هەزار شەو شەوگار) باسی حەیدەری دەکا دەڵێ: حەیدەری کە دەچووە سەردانی کۆڕی جەنگی پێشو خۆی زۆر لە نەڵغام دەپارێزێ، جا لە کاتی گەرانەوەیاندا لە رێگای ئیتالیاوە سواری باریجەیەك دەبن لە کەنداوی ناپۆلی داود پاشا نەیتوانی ترس و پەشۆکاوی خۆی لە نەڵغامی چاندراو ناو دەریا بشارێتەوە، ئەمیر بە گاڵتەوە پێی دەڵێ: مردنی حەیدەری بە خنکاوی کارەساتێکی نیشتمانیە، وای پێشنیار کرد کە شەو و رۆژ پشتێنی دەربازبوون ببەستێ، حەیدەری شەرمی دەکرد بە رۆژ پەیرەوی ئەو ئامۆژگاریە بکا، بەڵام بە شەو کاتی نوستن کاری پی دەکرد. لە پایزی ١٩٥٧ لە جنێڤ توشی داود حەیدەری بووم، بە شانازی و خۆشیەکەوە پێی راگەیاندم کە ئەو ناوبژی لە خوازبێنی ئەمیرە فازلە بۆ مەلیك فەیسەلی دووەم کردووە، کەچی ئەو دەستگیرانیەی ئەو تێیدا گەشبێن بوو بە کارەساتێکی شاهانە کۆتایی پێهات. یەك لە گۆڤارە گەورەکانی ئەوسای فەرەنسی دەنگوباسی خوازبێنی و وێنەی هەردوو دەستگیرانەکەشی لە ژێر ناوی (شادومانی پاشایەتی لەسەر بورکانە) بڵاو کردەوە.

## سالم زەکی ساحێبقران زادە



سالح زەکی کوڕی حوسێن بەگ کوڕی داود بەگ کوڕی مەحمود بەگە، لە بنەماڵەی ناسراوی ساحێبقرانە، لە شەشی مارتی ١٨٨٦ لە شارۆچکەی هەڵەبجە هاتۆتە دنیاوە، کە دایکی دەمری کۆرپەیەکی ساوا دەبێ و باوکیشی بە دوای ئەودا کۆچی دوایی دەکات. عوسمان بەگی مامی دەیگرێتە خۆی، لە سلێمانی و بەغدا دەخوێنێ، پاشان لە ١٩٠٢ روو دەکاتە ئاستانە، دەچێتە خوێندنگای جەنگی بە ملازم دەردەچی (١٩٠٦)، بۆ ساڵی ئایندە دەکەوێتە گەڵ فەیلەقی شەشەم لە عێراقدا. بەشداری لە جەنگە مەزنەکەدا دەکا، لە شەری شعێبە بریندار دەبێ. دوای ئەوە بۆ پایەی مقدم باڵا دەکرێ، ساڵی ١٩٢١ واز لە خزمەتگوزاری سوپای تورکی دێنی دەگەرێتەوە عێراق، دەیکەنە قایمقامی ئاکری (ئازاری ١٩٢٢)، دوای تێکچوونی شۆڕش گۆڤاری (دیاری کوردستان) بە زمانی عەرەبی و کوردی و تورکی لە بەغدا دەردەچوێنێ، زۆری پی ناچی دەگەرێتەوە سەر کاری بەرێوەبەرایەتی، دەبێتە مودیر ناحیەی قزائیە (١٩٢٦)، ئینجا ناحیەی شەهرەبان دوایی قایمقامی شەهرەبان پاشان عەفەك و چەمچەماڵ. دەگوازرێتەوە بە یاریدەدەری بەرێوەبەری گشتی ناوخۆ (١٩٣٠)، دوایی قایمقامی کۆیە (١٩٣٣)، پاشان هی ئامێدی. دەیکەنە پارێزگاری سلێمانی (یەکی ئایاری ١٩٣٥) دوایی پارێزگاری دیالە (تەموزی ١٩٣٦)، پاشان دەبێتە سەرۆکی تەسویەی مافی زەویوزار (کانونی یەکەمی ١٩٣٦) ئەو فەرمانەشی لە موسڵ و کەرکوك و کوت بینیوە. دەبێتە پارێزگاری هەولێر (١٩٣٩)، بەڵام لە ئایاری ١٩٤١ تەقاعود دەکرێ. لە

کانونی یەکەمی ١٩٤٢ دەیگەڕێننەوە بە پشکێنەری بەڕێوەبەرایەتی هەتا مەرگ لە ١٣ی کانونی یەکەمی ١٩٤٤ لە بەغدا جیهانی پێ بەجێ دێڵێ[43].

ئەدەب و شیعری بە کوردی داناوە[44] بە زمانی عەرەبی و تورکی دەینوسی، زانیاری لە فەرەنسی و فارسیدا هەبوو.

## فەریق ئەمین زەکی سلێمان

ئەمین زەکی کوڕی سلێمان ساڵی ١٨٨٤ لە بەغدا هاتۆتە جیهان، بنچینەی بنەماڵەکەی لە هەولێرە، ساڵی ١٩٠٥ لە قوتابخانەی سوپایی لە ئەستەنبول بە پایەی ملازم سانی دەرچوو، و لە سوپای تورکی خزمەتگوزار دەبێ لە ٧ی ئابی ١٩٢٤ بە پایەی رەئیس ئەوەڵ دەچێتە ناو سوپای عێراق، دەیکەنە فەرماندەی ئینزیباتی عەسکەری، بۆ پایەی موقەددەم باڵا دەکری (١٩٣٠)، دەبێتە ئامیر کەتیبەی پیادەی چوارەم، دوایی پایەی عەقید وەردەگری (١٩٣٤)، پاش ئەوە دەیکەنە ئامیر مەنتیقەی سوپایی لە فوراتدا. لە حوزەیرانی ١٩٣٦ بۆ پایەی لیوا باڵا دەکرێ، لە هەمان ساڵدا دەیکەنە فەرماندەی تیپی دووەم لە کەرکوك، لە شوباتی ١٩٤٠ بریکاری سەرۆکایەتی ئەرکانی سوپای عێراقیان پێ سپاردووە. لە حوزەیرانی ئەو ساڵەدا دەبێتە (فەریق)، لەو ماوەیەی کە ئەو پایەی وەرگرتبوو عەقید سەلاحەدین سەبباغ و عەقیدەکانیتری هاوڕێی- فەهمی سەعید، کامیل

---

[43]- سالح زەکی بەگ ئەم کوڕانەی لە پاش بەجێماون: یوسف و شامل لە هەولێر دادەنیشن ئەمیر و تەیمور لە بەغدا نیشتەجێ بوون. ئێستا لە ئەڵمانیان. هەروەها (عماد) کە لە ئیمارات کار دەکات.

[44]- لە بارەی شاعیریەتی سالح زەکی بەگ و بەرهەمەکانی شتێکی وام دەست نەکەوت تەنیا ئەم دوو دێڕ شیعرەم بەرچاو کەوت کە لە پشتی ئەو وێنە یادگاریەی کە لەگەڵ مەلای گەورە لە کۆیە گیراوە

هات و چوونە حالی عالەم -- حاڵی نابی پایەدار

حاڵی رابردوو بەحەسرەت -- با بمێنی یادگار

شبیب و مەحمود سەلمان دەستیان بەسەر کاروباری سوپادا گرتبوو، خۆیان لە رووداوە سیاسیەکان هەڵقورتاندبوو، فەریق ئەمین زەکی هەر بە ناو سەرۆك بوو، بۆی نەبوو هیچ بڕیارێك و فەرمانێکی سوپایی دەرچوێنێ و ئاراستەی بکا.

## محەمەد سالح

محەمەد سالح لە خانەوادەی محەمەد عەلی بەگ کە لە سەرۆکەکانی پشدەرە، ساڵی ١٩٢٥ بە نوێنەری سلێمانی هەڵدەبژێردرێ. سەرلەنوێ لە هەشت خولی نوێنەرایەتیەکەدا بێ دابڕان هەتا حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٣ هەڵدەبژێردرێتەوە، دیسان لە نیسانی ١٩٤٤ هەتا تشرینی دووەمی ١٩٤٦ بە نوێنەری سلێمانی هەڵدەبژێردرێتەوە. دوای ساڵێك کۆچی دوایی دەکا (١٩٤٧).

مەجید خدوری لە کتێبەکەیدا (*نظام الحکم فی العراق*) (١٩٤٦) دا دەڵێ: ئەوە دەگەیەنی کە تا چ رادەیەك گیانی بەردەوام بوون لە خۆ هێشتنەوەی ئەنجومەنی نوێنەراندا هەبووە، نزیکەی ٤٧ نوێنەر هەر یەکەیان بەشداری لە پێنج دەورەی نوێنەرایەتی و یا زیاتریان کردووە، لە ناو ئەوانەدا محەمەد سالح (نائیبی سلێمانی و نوێنەری عەشیرەتەکەی خۆی کە پشدەرە). سەرتاپا بەشداری لە هەموو دەورەکانی نوێنەرایەتیدا کردووە لە ساڵی ١٩٢٥ هەتا ئێستا (مەبەستی ساڵی ١٩٤٦/ وەرگێڕ).

## فارس ئاغای محەمەد زێباری

سەرەك هۆزەکانی زێبارە، نیشتەجی بوونیان نێوان ئاکری و زێی گەورەیە. فارس ئاغا کوڕی محەمەد ئاغا ساڵی ١٨٨١ هاتۆتە دنیا، لە شوباتی ١٩٣٧ بە نوێنەری لیوای موسڵ هەڵبژێردراوە، پاشان لە کانونی یەکەمی ١٩٣٧ هەتا شوباتی ١٩٣٩ هەڵدەبژێردرێتەوە.

له شوباتی ١٩٤١ کۆچی دوایی کردووه، دکتۆر عەبدوڵڵا فەیاز له کتێبەکەیدا (*الثورة العراقية الكبرى*) ساڵی ١٩٢٠ له خاتوو جرتود بیل دەگێڕێتەوه دەڵێ: دوای جەنگی یەکەمی مەزن پڕوپاگەندەی تورکەکان زیرەکانه له ناوچەی بارزان و زێباریەکاندا دەگێڕدرا، له ناکۆکی نێوان فارس، ئاغای زێباری و شێخ ئەحمەدی بارزانی ناوبژیيان له پێکهاتنیاندا دەکرد، بۆ یەکگرتنی تەقەلاکانیان له ناوچەکەدا.

## سەعید دۆسکی

سەعید ئاغا سەرۆکی عەشیرەتی دۆسکی که بارەگاکەی له گوندی (گەرماوی) نزیك شاری دهۆکه، له شوباتی ١٩٣٧ به نوێنەری موسڵ هەڵبژێردرا، سەرلەنوی له تشرینی دووەمی ١٩٤٤ و ئازاری ١٩٤٧ هەڵدەبژێردرێتەوه. له ئەیلولی ١٩٤٧ له ئاکامی ناکۆکی لەگەڵ هۆزەکانی دەوروبەری ناوچەکەی خۆیان له موسڵ دەکوژرێ.

## فەریق حوسێن فەوزی

حوسێن فەوزی له باوکێکی کورد و دایکێکی عەرەب له ١٧ی کانونی دووەمی ١٨٨٩ هاتۆته دنیا، خوێندنی له قوتابخانەی دواناوەندی سوپایی تەواو کردووه، پاشان دەچێته خوێندنگای جەنگی له ئەستەنبول (١٩٠٦)، ساڵی ١٩٠٩ به ملازم تۆپچی لێی دەرچووه. له لیوای پێنجەمی تۆپچیەتی له ئەدرنه دادەمەزرێ، له سەردەمی والی نازم پاشادا دەگوازرێتەوه بەغدا (١٩١٠)، بەشداری له دامرکانەوەی شۆڕشی عەشیرەتەکانی ناوچەی غەرڕافدا کردووه. دوای ئەوه ئەزمونی قوتابخانەی ئەرکانی داوه، بەشداری له جەنگی بلقان دەکا. بۆ ملازمی یەکەم باڵا دەکری (١٩١١)، که جەنگه مەزنەکه بەرپا دەبێ دەیکەنه پاش بەندی کۆمیتەی ئەرکان له هێڵی جتاله و گەلوی بۆسفۆر، پاشان بەرگری له لێواری دەریای رەش دەکا (١٩١٦)، دوای ئەوه ناردیانه بەرلین بەشداری له دەورەی تۆپسازی

دەکا، پاشان دەگەڕێتەوە بۆ مەڵبەندی مەشقکردن لە ئەستەنبول، لە کۆتایی ١٩١٧ خستیانە گەڵ سوپای تورکی لە عێراقدا، لەوی دەمێنێتەوە هەتا ئاگربەست رادەگەیەندرێ، کە حوکمی نیشتمانی لە عێراق دادەمەزری خزمەتی رابردوویان رەچاو کردووە، ناجی شەوکەت لە بەسەرهاتیدا دەڵێ: کە لە نیسانی ١٩٤١ دەبێتە وەزیری بەرگری بە پێی ئەوەی ئەمین زەکی ئەفسەر روکن نەبووە، هەرچەندە سەر راست و دڵسۆزو دەستپاك بووە بەڵام زەعیفە و دەسەڵاتی بەسەر ژێر دەستەی خۆیدا ناشکێ، ویستی لە سەرۆکایەتی ئەرکان دوری خاتەوە، بەڵام سەرەك وەزیران رەشید عالی گەیلانی بەرهەڵستی لە پایە لادانەکەی کردووە.

پاش بزوتنەوە و هەرای ئایاری ١٩٤١ بۆ ئێران هەڵدێ، لەوی دەیگرن و بە بەندکراوی دەینێرنە باشوری ئەفریقا، دوای ئەوە گەڕاندیانەوە عێراق. پێنج ساڵیان حکومدا (ئایاری ١٩٤٢)، دوای بەردانی چەندەها ساڵی بە گۆشەگیری و هێمنی بردە سەر هەتا لە دووی شوباتی ١٩٧٢ جیهان بەجی دێڵێ. مەحمود دورە لە کتێبەکەیدا *الحرب العراقية البريطانية* ( ١٩٤١) _ (١٩٦٩) باسی دەکا دەڵێ: ( فەریق ئەمین زەکی پیاوێکی پاك و قسە خۆش وسەربازێکی پیشەیی بوو، زۆرترین ژیانی سوپایی خۆی لە وەحدەکان و ئۆردوگاکاندا بەسەر بردووە، هەرگیز ئارەزووی سیاسەت مەداری نەبووە، پێبەپی بە گوێرەی ساڵان پایەو نیشانەکانی وەرگرتووە، لە کولیەیەکی سوپایی بەرز دەرنەچووە، لەبەر ئەوە رۆشنبیریەتی سوپایی و رۆشنبیریەتی گشتی لەو چوار چێوەیە دەرنەچووە).

براکەی عەقید حەمدی سلێمان خزمەتی لەهەردوو سوپاکەی تورکی و عێراقی دا کردووە، هەتابە پایەی ( عەقید ) واز دەهێنێ، لەحوزەیرانی ١٩٣٩ بە نوێنەری هەولێر هەڵدەبژێردرێ، لەساڵی ١٩٥٢ لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە.

مێجەر یوسف ئاشیر سالم کە لە بنچینەدا عێراقیە بۆ رۆدیسیا باشوری ئەفریقا رەو دەکا، جنسیەی بەریتانی پی دەدرێ، کە جەنگ بەرپا دەبێ لە سوپای ئینگلیزی دەبێتە ئەفسەر. لە

کۆتایی ساڵی ١٩٧٤ لە لەندەن پێك گەیشتین، بۆی باس کردم و گوتی : کە سەرکردەو سیاسیە عێراقییەکان، ئەوانەی پشتگیریان لە بزوتنەوەکەی رەشیدعالی کردبوو لە١٩٤١ دەیاننێرنە رۆدیسیا، بە هۆی ئەوەی زمانی عەرەبی دەزانی دەیکەنە ئامێری گرتووخانەکە، ئاگاداری و خزمەتێکی زۆریان دەکات تا ئەوەی بووەتە جێگای متمانەو بڕوایان، بۆ هەموو کارو بارێکیان هەر روو لەو دەنێنن.

بۆ ساڵی داهاتوو بڕیاری گەرانەوەیان بۆ عێراق دەدرێ. لەوەشدا دەبێ تەسلیمی کاربەدەستانی حکومەتی عێراقی بکرێنەوە. هەرچەند عوزریان بۆ دێنێتەوە کەوا خۆی لە بنچینەدا عێراقییە و بۆی ناشی و جوان نیە پەناهەندە بداتەوە حکومەتەکەیان ناچاریە فەرمانێکی سوپایی داوای لێکراوە دەبێ بەجێی بێنێ. بەڵام ئەم عوزر خوازییەی سوودی نابێ. بۆی ناسەلمێنن. ئیتر بە سواری کەشتی لە گەڵیان هەتا بەسرە دەچێت و ئەوە ئەرکە گران و قورسەی کۆتایی پی دێت.

## جەمیل بابان

جەمیل کوڕی مەجید پاشا، کوڕی ئەحمەد پاشا، کوڕی خالد پاشا، کوڕی بەکر بەگ، کوڕی سلێمان بەگ، لە پیاوانی بنەماڵەی ناسراوی بابانە.. ساڵی ١٩٢٤ بە نوێنەریی کەرکوك بۆ ئەنجومەنی دامەزراندن هەڵدەبژردرێ. پاشان لە شوباتی ١٩٣٣، کانوونی یەکەمی ١٩٣٧ و کانوونی یەکەمی ١٩٤٣ بووەتە نوێنەری پارێزگای ناوبراو لە پەرلەماندا. لە تەمووزی ١٩٤٦ جیهان بەجێ دێڵێ.

## لیوا خالید مەحموود زەهاوی

خالید کوڕی مەحموود، کوڕی موفتی محەمەد فەیزی زەهاوییە. لە ٣ تەممووزی ١٩٨٩ لە بەغدا هاتۆتە دنیا. روو دەکاتە ئەستەنبوول. لە خوێندگای جەنگی دەخوێنێ. لە ساڵی ١٩٠٦ بە ئەفسەر دەردەچێ. خزمەت.. لە سوپای تورکیدا دەکات. لە ٢٤ی حوزەیرانی ١٩٢٤ دەگەڕێتەوە عێراق. بە پایەی رەئیس ئەوەل ( رائید) دەبێتە یاوەری مەلیك فەیسەلی یەکەم. پاشان لە ١ی حوزەیرانی ١٩٣٠ بە پایەی عەقید دەبێتە ئامری خوێندنگای سوپایی. ساڵی ١٩٣٣ دەینێرنە ئینگەلتەرە. دەچێتە کولیەی ئەرکان و دەورەی گەورە ئەفسەران. لە ساڵی ئایندەدا لە وەزارەتی بەرگریدا دەبێتە مودیری ( حەرەکات). دوایی سەرکردەی هێزی ئاسمانی، پاشان مودیری ئیدارە. لە ئەیلوولی ١٩٣٨ بۆ پایەی لیوا باڵا دەکرێت. پاشان لە ئەرکی سوپایی دەستبەردار دەبێ.

دەیکەنە پارێزگاری کوت. پاشان پارێزگاری بەغدا( حوزەیرانی ١٩٤٠). لە ١٩٤١ بۆ بەرێوەبەری گشتی ئاودێری دەگوازرێتەوە. دەیگەڕێننەوە بە پارێزگاری بەغدا ( ئایاری ١٩٤١). لە ١٠ی کانوونی دووەمی ١٩٤٣ هەتا ١٩٤٨ دەبێتە وەزیر موفەوەزی عێراق لە کابول. دوای ئەوە دەکەوێتە ژیانی سەرفرازی تایبەتی خۆیەوە. لە نێوان ئەستەنبوڵ و بەغدا لە هات و چووندا دەبێت. پاشان بە یەکجاری لە ١٩٦١ لە ئەستەنبوڵ نیشتەجی دەبێ. هەرلەوێش لە ساڵی ١٩٨١ جیهان بەجی دێڵێ.

## عەبدووڵڵا سلیمان بەیاتی

شێخی بەیات سلیمان لە ناوچەی توزخورماتو. لە حوزەیرانی ١٩٣٩ و تشرینی یەکەم ١٩٤٣ بە نوێنەری پارێزگای دیالە هەڵدەبژێردرێ. پاشان لە حوزەیرانی ١٩٤٨ و کانونی دووەمی ١٩٥٣ دەبێتە نوێنەری کەرکوك. لە ١٩٥٧ ماڵ ئاوایی لە ژیان دەکات.

## عەبدولحەمید جاف

عەبدولحەمید کوڕی عەبدولمەجید بەگ کوڕی عوسمان پاشای جافە. ساڵی ١٨٨٩ لە هەڵەبجە هاتۆتە دنیا، لەسەر دەستی مامۆستایانی تایبەتی دەخوێنێ. لەسەرئەنجامی داگیرکردنی بەریتانی دەیکەنە یاریدەدەری حاکمی سیاسی، ساڵی ١٩٢٥ دەبێتە قایمقامی هەڵەبجە، دەگوازرێتەوە بۆ قەزای چەمچەماڵ (١٩٣١-١٩٣٣). لە ساڵی ١٩٣٥ بە نوێنەری سلێمانی هەڵدەبژێردرێ، سەرلەنوێ لە شوباتی ١٩٣٧، ئازاری ١٩٤٧، حوزەیران ١٩٤٨، کانونی دووەم ١٩٥٣ و ئەیلولی ١٩٥٤ هەتا ئازاری ١٩٥٨ هەڵبژێردراوەتەوە.

## بەکر سدقی



فەریق بەکر سدقی (١٨٩٠-١٩٣٧) پاڵەوانی کودەتای عێراقی لە ٢٩ تشرینی یەکەم ١٩٣٦. راستی بنچینەکەی دەچێتەوە سەر ئەو بنەماڵە عەسکەرەی کە جەعفەر عەسکەری لی پەیدا بووە. گوایە دەڵێن دەچێتەوە سەر عەبدوڵلا مەدەنی کەوا لەسەدەی شازدەیەمی زایینیدا لە مەدینەی منەوەرە دەگوازرێتەوە بۆ گوندی (عەسکەر) لەسەر زێی بچوك لە قەزای چەمچەماڵ سەر بە پارێزگای کەرکوك و لێی نیشتە جی دەبێ.

وایان خستۆتە پاڵی کەوا بەکر سدقی بەنیاز بووە هەموو کوردە لێك دابڕاوەکان لە رۆژهەڵاتی ئەنازۆڵ و رۆژئاوای ئێران و باکوری عێراق کۆبکاتەوە، لە ژێر سایەو

سەرداریەتی ئەودا ببنەیەك، بەڵام دکتۆر کەمال مەزهەر و رۆشنبیرانی تری کورد دەڵێن: بەکر سدقی لایەنگری بزوتنەوەی کوردی نەکردووە بەڵکو لە راستی دا دژی وەستاوە[45].

## تۆفیق وەهبی



وەزیری عێراقی ئەدیب و زانای کورد تۆفیق وەهبی بەگ کوڕی مەعروف کوڕی محەمەدە، باپیری لە دایك را رەسول مستی ئەفەندی نازناو بە شێخی گەورەی دانایان، لە پیاوە زانا بەرێزەکانی سەردەمی خۆی بووە.

توفیق وەهبی لە یەکی کانونی دووەمی ١٨٩١ لە سلێمانی هاتۆتە جیهان. منداڵ دەبێ کە باوکی نامێنێ، بەرەو بەغدا دەروا. لە قوتابخانەی دواناوەندی سوپایی دەخوێنی (١٩٠٤). ئەو خوێندنگایەش سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم دایمەزراندووە. لە ساڵی ١٩٠٨خوێندنی لەوی تەواو دەکا. دوای ئەوە خۆی دەگەیەنێتە ئەستەنبول پایتەخی سوڵتاننشین، دەچێتە کولیەی ئەرکان بەڵام هەتا ساڵی ١٩١٨ بڕوانامەکەی وەرنەگرتووە. بەشداری لە بزوتنەوەکانی باکوری ئەلبانیادا کردووە(١٩١١).

---

45- لە زۆر سەرچاوەی باوەرپێکراودا بە تایبەتی ئەفسەرانی کوردی هاوسەردەم و شارەزا بە هەڵوێست و ژیانی بەکر سدقی ئەوە دەگەیێنن کەوا هەستی نەتەوایەتی کوردایەتی و هەڵوێستی دلێرانەی هەبووە. تا ئەوەی دەڵێن: لە کاتی فەرمانرەوایی ئەودا زۆربەی خوێندکاری کورد لە کولیەی سوپایی وەدەگیران، کە گەلی ئەفسەر و سەرکردەی سوپایی لێهاتووی کورد پێگەیشتن لە ناو سوپای عێراقدا. بەکر سدقی نیاز و ئارەزوویەکی دور و بەرفراوانی بۆ چارەنووسی کورد هەبووە. "وەگێر"

دەینێرنە تەرابلوسی غەرب. پاشان لە بولقان جەنگاوە. لە کۆتایی ساڵی ١٩١٤ جەنگی گشتی ڕاگەیەندرا. ڕووداوەکانی شەری هەموو بینیوە. ئەفسەری روکن دەبێ لەو تیپە تورکیەی کەوا لە جناق قەلعە (دەردەنێل) شەری کردووە، دوای ئەوە لە سەماوە خزمەتگوزار دەبێ. لە کۆتایی ئەیلولی ١٩١٧ ئامادەی شەری رومادی بووە، کە ئەو شارۆچکەیە دەکەوێتە ژێر دەستی سوپای بەریتانی توانیویەتی بۆ "هیت" بکشێتەوە. دەگوازرێتەوە بۆ تیپی پەنجاوسێ لە کۆڕی فەلەستینیدا (١٩١٨). پاشان بە پایەی یوزباشی (رائید)، واز لە خزمەتگوزاری سوپای تورکی دەهێنێ، لە کۆتاییەکەی ساڵی شەرە گشتیەکەدا ئەڵمانیا (ویسامی سەلیبی حەدیدی) پی دەبەخشێ. لە ئابی ١٩١٩ دەگەرێتەوە عێراق. دەیکەنە قایمقامی قەزای رانیە. پاشان دەچێتە ناو سوپای عێراقییەوە کە لە کانونی دووەمی ١٩٢١ دادەمەزرێ، لەبەشی حەرەکات دادەمەزرێ. بەڵام لە ساڵی ١٩٢٢ دەچێتە پاڵ شۆڕشەکەی شێخ مەحمود لە سلێمانی، کە بزوتنەوەکەی دادەمرکێننەوە تۆفیق وەهبی چل و دوو رۆژ دەگیرێ، دوای ئەوە دەیگەڕێنەوە بۆ سوپا، دەیکەنە ئامیری (دار التدریب العسکری) ١٩٢٣، پاشان لە وەزارەتی بەرگریدا دەبێتە مودیری حەرەکات (تەمموز ١٩٢٥)، ئینجا ئامیری قوتابخانەی سوپایی (ئاب ١٩٢٥)، ساڵی ١٩٢٩ بەوەفد بۆ ماوەی سی مانگ دەینێرنە ئینگلتەرە دەچێتە دەورەی ئەفسەرانی پێشکەوتو لە شاری شیرنس. ساڵی ١٩٣٠ بۆ پایەی عەقید باڵا دەکرێ، سوپا بەجی دێڵی (کانونی دووەم ١٩٣١). دەیکەنە موتەسەریفی لیوای سلێمانی (ی٣٠ نیسان ١٩٣٠)، هەتا ئەیلولی هەمان ساڵ لە پایەکەی دەمێنێتەوە، پاشان بە تاوانی پشێوکردنی باری ئاسایشی دەوڵەت دەگیرێ، کە ئەمەش لە ئاکامی پێشکەش کردنی سکاڵا نامەیەك لە لایەن کوردەکانەوە خواستی ئەوەیان بووە نەتەوە کەمایەتیەکان بپارێزرێ، ئەوەش پێش ئەوەی عێراق لە (عصبە الامم) وەربگیرێ. فەرمانەکانی دەوڵەتی پی دەدرێتەوە. بەرێوەبەرایەتی گشتی ئەشغالی پی دەسپێرن (١٩٣٦). دەگوازرێتەوە بۆ بەرێوەبەرایەتی گشتی "مەساحە" (یەکی ئازار ١٩٣٨).

لە ساڵی ١٩٤١ لە فەرمانەکانی میری دەست بەردار دەبێ. دەکەوێتە کاروباری تایبەتی خۆیەوە. دەبێتە وەزیری دارایی لە وەزارەتی حەمدی پاچەچی دا (٤ حوزەیران ١٩٤٤– ٢٣ شوبات ١٩٤٦)، لە تشرینی دووەمی ١٩٤٤ بە نوێنەری موسڵ هەڵدەبژێردرێ. لە وەزارەتی ساڵح جەبر دەبێتە وەزیری پەروەردە (٢٩ ئازار ١٩٤٧–٢٧ کانونی دووەم ١٩٤٨)، بە نوێنەری سلێمانی هەڵدەبژێردری (٣١ ئاب ١٩٤٧)، هەڵدەبژێردری بە ئەندام لە کۆڕی زانیاری عێراق لە کاتی دامەزراندنیدا. بە جێگری وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی لە وەزارەتی سێیەمی تۆفیق سوێدی پی دەسپێردری (٥ شوبات ١٩٥٠–١٦ ئەیلول ١٩٥٠)، بە سەرۆکی ئەنجومەنی باڵای زانیاری لە وەزارەتی مەعاریف هەڵبژێردراوە (تەمموز ١٩٥١)، بەڵام دوای مانگێك وازی لی دەهێنێ، لای باشتر بووە کەلەئەندامیەتی ئەنجومەنی پیران بمێنێتەوە. لە ساڵی ١٩٥١ بەشداری لە دامەزراندنی حیزبی ئومەی ئیشتراکی بە سەرۆکایەتی ساڵح جەبر دەکا و بەجێگری سەرەك حیزبەکە هەڵدەبژێردرێ، لە کانونی یەکەمی ١٩٥٥ بە جێگری دووەمی سەرەك ئەنجومەنی ئەعیان هەتا ئەیلولی ١٩٥٦ هەڵبژێردراوە. کاتی ماوەی ئەندامیەتی کۆتایی پی دێت دووبارە لە ساڵی ١٩٥٧ هەتا شۆڕشی تەموزی ١٩٥٨ ئەندامییەتی ئەنجومەنەکەی پی دراوەتەوە. پێش بەرپابوونی شۆڕشەکە دەچێتە بەریتانیا لە پایتەختەکەی نیشتەجی دەبێ، خوی داوەتە لێکۆڵینەوەو دانان لەگەڵ مێجەر ئەدمۆندس راوێژکاری پێشوی وەزارەتی ناوخۆی عێراق کە بەزمان زانێکی کوردی ناسرا بوو، پێکەوە فەرهەنگی کوردی و ئینگلیزییان داناوە، لە ساڵی ١٩٦٦ چاپکراوە. گەلی جار لە ساڵانی ١٩٧٦– ١٩٨٣ لە لەندەن سەردانیم دەکرد، دەمدیت پیرێکی لەسەرخۆ سەرەرای تەمەن درێژی و بی تاقەتی هەر خەریکی دانان و نووسین بوو، لەدووا ساڵەکانا بە ئیفلیجی لەسەر جێگا کەوتبوو.

تۆفیق وهەبی دانان و وتار و موحازەراتی بە زمانی عەرەبی، تورکی، کوردی و ئینگلیزی هەیە، لەوانە: (ڕەشاشات _ بە تورکي_ ١٩١١)، بەڵام دانانە کوردیەکانی ئەمانەن:

ڕێزمانی کوردی ١٩٢٩ و ١٩٥٦ زمانی کورد به پیتەکانی لاتینی ١٩٣٣، فەرهەنگی کوردي_عەرەبی ١٩٤٣، فەرهەنگی کوردی _ ئینگلیزی لەکەڵ ئەدمۆنس (١٩٦٦)، له دانانەکانی به زمانی عەرەبی: *(القصد و الاستطراد في اصول معنى بغداد (١٩٥٠)، دروب السياسة*. ئالتون کوپری (١٩٥٦)، بهرام گور (١٩٥٧)، اصل اسم كركوك (١٩٥٨)، *اصل تسمية شهزور* (١٩٦١)، *سفرة من دربندی بازيان الى (مله) ی تاسلوجه* (١٩٦٥).

کتێب و نامەی به زمانی ئینگلیزیش داناوه لەوانه: هەڵکۆڵین و نەقشی بەردەکان له ئەشکەوتی گندۆك (١٩٤٩)، *بقايا الشرائية في الحضر) و (كردستان العراقية اليزيدية*، (١٩٦٢) *دراسات كردية* بەشی یەکەم (١٩٨٦)، هەروەها کتێبی لێکۆڵینەوەی لەسەر ئایین و داستانه کۆنەکانی داناوه، به تایبەتی هی ئێرانی، لەسەر (صوببەکان) و لەسەر (سۆفیگەری). بایەخی به کتێب و چەك و شتی نایابی دەگمەن داوه، کتێبخانەکەی ماڵەوەی له بەغدا پڕ بوو له چاپەمەنی و دەستنووس و کۆمەڵێك کەلوپەلی دەگمەن و پەیکەر و پارچەی چەکه کۆنەکان و شتی سەیر. له ئاکامی دامەزراندنی کۆڕی زانیاری کورد له حوزەیرانی ١٩٧١ له بەغدا (تۆفیق وەهبی) یان تێدا کردووه به ئەندامی فەخری، ئەویش بڕیاریدا هەموو دەستنووسەکانی خۆی بۆ کۆڕ بکاته دیاری. دوای دەرد و نەخۆشیەکی گران له پێنجی کانونی دووەمی ١٩٨٤ له لەندەن کۆچی دوایی کرد، تەرمەکەیان بردەوه بەغدا له سلێمانی بەخاك سپێردرا.

بیروڕاکانی وتووێژ لەگەڵیدا: له تۆفیق وەهبیان پرسی: له بنچینەدا تۆ پیاوێکی عەسکەری بووی چۆن رووتکردە زانست؟ گوتی: حاڵی منیش وەك حاڵی ئاشەوانەکەی تۆلیستۆی لیهات، له کتێبێکی تۆلیستۆدا (فەلسەفەی ژیان) هاتووه: ئاشەوانێك له دەستکەوتی ئاشەکەی خۆشبەخت و دڵنیا دەژیا، ڕۆژی ویستی بزانی چۆن کاری هاڕین روودەدا، دیتی ئەوا پێچکه گڕنیه گڕنیەکانی یەك یەك تێك هەڵکێشراوه بەردە ئاشەکه دەسوڕێنێ، ماوه به دوای ئەو هێزەدا بگەری که پێچکەکان دەجوڵێنێ، سەیری کرد ئەو

ئاوەیە کە لە تەوقەسەری چیاکە دێتە خوار، پیا هەڵگەرا سەرچاوەی ئاوەکە بدۆزێتەوە، کانیەکەی دیتەوە، جا کەوتە توێژینەوە و پرسیار لەم و لەو، کە زانی سەرچاوەی ئەو ئاوەی کە لە کانیەکە دێتە دەر لە ئاوی باران پێکهاتووە کە دێتە خوار و نغزۆ دەبێ و لە ناخی زەوی پێچ دەخوا دەگوێزرێتەوە و کۆ دەبێتەوە تا لە شوێنێك دەردەچی کانی لی پەیدا دەبێ. جا ما پرسیار بکا لە چۆنیەتی پێکهاتنی باران!!. هەروەها تۆفیق وەهبی گوتی: کە ئامریەتی کولیەی عەسکەریم وەرگرت، گوتنەوەی دەرسی فارسیم کەوتە ئەستۆ، سەبارەت بەوەی ئەو زمانە (لقێکە) لە زمانی هیندی ئەورووپی یان ئاری کۆنە، ناچار بووم دەست بە لێکۆڵینەوەی هەموو ئەو لایەنانە بکەم. کە لە شێوە و تەبیعەتی ئەدەبی کوردی یە لێیان پرسی وتی: ئەو ئەدەبە کوردیانەی بەجێماون هەمووی هۆنراوە و هەمەچەشنن، هەیە مەحەمەیە، هەشە داستان و چیرۆکی خۆبەخت کردنی دڵدارییە یان وەسفی جەنگ و شەرەکانە و هیتر. دەربخست کە شاعیرانی دێرین: ئەحمەدی خانی و مەلای جەزیرییە، بەڵام لە سەردەمی ئێستادا:

حاجی تۆفیق پیرەمێرد و رەمزی مەعروف، گۆران، شێخ سەلام کە وەرگێڕی چوارینەکەی خەیامە بۆ کوردی، تۆفیق وەهبی لە پێشەوەی بایەخدەرانی زمانی کوردییە، کەوتووەتە دیراسەت و توێژینەوەی شێواز و دەستورەکانی، لە لەندەن وتارێکی بۆ رۆژنامەی (التآخي) بەغدای نووسیوە، لە ١٠ی ئازاری ١٩٧٣ بۆی بڵاو دەکرێتەوە، ئەوەی تێدا نیشان داوە کە زمانی کوردی بێتوانا یا خود کەم وشە نییە، بەڵام وشەکانی کۆنە لە ئاکامی پێشکەوتنی زانست و هونەر و پیشەسازی پێویست بەجی نایەنن، وەك حاڵی عەرەب ئاسا ناچار بوون وشەی بێگانە وەربگرن و لە چوارچێوەی وشەی عەرەبی بیتوێننەوە و بە کاری بێنن. تۆفیق وەهبی دەڵێ:

هەندێك نامیلکەی مەشقی سوپایم وەرگێڕاوەتە سەر کوردی و لە سلێمانی چاپم کرد بۆ بەکارهێنانی لە سەردەمی حکومەتی شێخ مەحمود، پاشان ساڵی ١٩٢٤ دەستم بە

بڵاوکردنەوەی وتار کرد لە گۆڤاری (دیاری کوردستان) ی بەغدا لە ژێر ناوی "چۆن زمانی کوردی بنووسین".

وەزارەتی مەعاریف ساڵی ١٩٢٣ داوای لێکرد ڕێزمانی کوردی دابنێ تا لە قوتابخانەکان بخوێندرێ، کە کەوتە کارکردن دیتی پیتەکانی عەرەبی دەنگ و بزوێنەکانی کوردی بەجێ ناهێنن، لە باسەکەی کۆڵیەوە، ڕەمز و نیشانە داهێنان بۆ یەکبوونی دەنگ کە وێنەیان لە پیتەکانی عەرەبیدا نییە، بەڵام وەزارەتی مەعاریف کارەکەی پەسند نەکرد، و ڕێزمانی کوردی ساڵی ١٩٢٩ تەواو کرد، پاشان لە ساڵی ١٩٣٣ نامەیەکی کوردی بڵاو کردەوە لە ژێر ناونیشانی خوێندنەوەی نوێ (*القراءة الحديثة*) لە بارەی بەکارهێنانی تیپی لاتینی بۆ نوسینی کوردی ساڵی ١٩٢٤ فەرهەنگێکی کوردي- عەربی بڵاو کردەوە، کە هەزار تاکە وشەی کوردی پەتی تێدابوو، ساڵی ١٩٥٦ دەچێتە بەیروت بۆ سەرپەرشتی دارشتنی تیپە تایبەتییەکان، لە دوو بەشدا بڵاوی کردەوە بەشی یەکەم و دووەم لە سەر گرامەری زمانی کوردی بوو.

هاوسەرەکەی: خاتو ئاسیای خێزانی کچی ڕەزا ڕێزەلی بازرگانە، خوشکی ماهیر و دکتۆر عەبدولجەبارە، لە پێشەوای ڕاپەرینی ئافرەتانی عێراقە، بەشداری لە کۆمەڵەی ڕۆشنبیر و خێرخوازەکاندا کردووە، سەرۆکایەتی کۆمەڵەی منداڵپارێز – بەشی ئافرەتان- دەکا. لە کاتی دامەزراندنیدا (ئازاری ١٩٤٥)، ئەندامێکی هەمیشەیی بوو لە کۆمەڵەی قەڵاچۆ کردنی نەخۆشی و گیروگرفتەکانی کۆمەڵایەتیدا، سەرۆکایەتی یەکێتی ئافرەتان دەکا لە کاتی دامەزراندنیەوە ١٩٤٥ هەتا شۆڕشی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ و گۆڤارەکەشی لە تشرینی دووەمی ١٩٤٩ دەرچواندووە، لە ماوەی سەرۆکایەتی ئەودا یەکێتییەکە داوای یەکسانی مافی ئافرەتانی لەگەڵ پیاودا کردووە کە لە بواری سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی مافی هەڵبژاردنی پێ بدرێ و مافی سیاسی خۆی بەکار بێنێ. یەکێتییەکە لە ساڵی ١٩٤٥هەینییەکی بۆ ئافرەتانی ڕێکخست، کۆمەڵێك لە سیاسەتمەدار پیاوی ناسراس

و رۆژنامەگەر و ئەدیبان بەشدارییان تێدا کرد و خاتو ئاسیا سەرۆکایەتی کۆنگرەی ئافرەتانی عەرەبی دەکا کە لە ئازاری ۱۹۵۲ لە بەغدا دەبەسترێ، نوێنەرانی میسر و سوریا و لوبنان و فەلەستین بەشدارییان تێداکرد، هەروەها ئافرەتانی عێراقی لە چەندین کۆنگرەی عەرەبی و دەوڵەتان لە لوبنان و سوریا و پاکستاندا بەشداریان کردووە.

لە حوزەیرانی ۱۹۵۵ کۆنگرەیەك لە هاوینەهەواری حەمدون لە لوبنان بۆ لێکۆڵینەوەی باری ئافرەتان لە رۆژهەڵاتی ناوراست لە ژێر سایەی نەتەوە یەکگرتووەکاندا بەسترا، ئاسیا خان بەشداری تێدا دەکا و دوانێکی لەسەر لێپرسراوی ئافرەتانی عەرەبدا. دوای شۆڕشی تەموز لەگەڵ هاوسەرەکەی لە لەندەن دەژیا، تا لە ۱-٦-۱۹۸۰ لەوی سەردەنێتەوە، تەرمەکەیان هێنایەوە بەغدا لە ئارامگای گەیلانی نێژرا. لەدایکبوونی لە دەوروبەری ساڵی ۱۹۰۰ بووە، لە بەغدا لە سەردەمی تورکەکاندا لە قوتابخانەی رۆشنبیری کچان خوێندویەتی.

ساڵی ۱۹۲۷ بۆتە هاوسەری تۆفیق وەهبی، لە کاتی کۆچکردنیدا لە حوزەیرانی ۱۹۸۰ بۆ سەرەخۆشی چوومە سەردانی تۆفیق وەهبی، سامی خوندەی وەڵلاش زاوای لەوێ بوو کە لە بەغداوە هاتبوو، پێی گوت: وەسیەت بی لات کە مردم لە ناوچەی سلێمانی لە دۆڵی جوانرۆ لە قەد چیای پیرەمەگرون بمنێژن[46]. خاك و گەردی ژنەکەشم بگوازنەوە، با لە تەنیشتم ئارام بگری لە ژیانی سەرمەدیدا. هەروەها گوتی: پیرەمەگرون پیاوێکی (وەلی) بووە و لەوی نێژراوە، چیاکەش هەر بە ناوی ئەو ناو دەبرێ، کوردەکانی ئەو ناوچەیە بڕوایان وایە (ئەصحابە) بووە، کە ئەویش راست نییە، تۆفیق وەهبی هەتا مرد هەر

---

46- وەسیەتەکەی تۆفیق وەهبی بەگ بە ئەنجام گەیەندرا. بە رێوڕەسمێکی شکۆدارەوە بە ئامادەبوونی خەڵکێکی زۆر لە سەرکردەی سیاسی و ئەدیب و خوێندکارانی کورد تەرمەکەیان لە قەد چیای پیرەمەگرون بەخاك سپارد (وەرگێر).

بەردەوام بوو لە بایەخەندی جوغرافیا و زمانی کوردی، هەمیشە لە لێکۆڵینەوە و نووسینی ئەو باسانەدا بووە، لێی پرسیم: وشەی (*قافیة*) لە چییەوە هاتووە؟ پێم گوت: بێگومان لە (*قفو*) هاتووە و (*اقتیفاء*) واتە پێکەوتن و (*تعقیب*) و بەدواداچوون. زمانزانەکان کردویانەتە نیشانەی (*استطراد*) دوا وشە لە هۆنینەوەدا. گوتی: لە کوردیشدا بە هەمان واتا بۆ قافیەی شیعر بە کار دەهێنرێ، ئەو وشەی (کۆك) ی بۆ دارێشت، پیاوانی کورد پێی قایل نەبوون، بەڵکو بەردەوام بوون لە بەکارهێنانی وشەی عەرەبیەکە، وتم: بۆ دەتەوی بیگۆڕی، هەموو زمانێك وشەی بێگانە هاتۆتە ناوی و لاشیان نەداوە، نمونەم بە ناوی هەندێك خواردەمەنی و ئامراز و شتیتر بۆ هێنایەوە کە عەرەب لە فارسیان وەرگرتووە.

مستەفا کەمال ئەتاتورك هەوڵیدا زمانی تورکی لە عەرەبی و فارسی پاك بکاتەوە کەچی پەنای بردە بەر زمانە ئەورووپیەکان، لە هەوڵدانەکەی سەرنەکەوت.

تۆفیق وهەبی بەگ وتی: زمان سیمای ژیانی نەتەوەیە، دەبێ کورد زمانەکەیان پاك بکەنەوە، ناسکی بکەن، هەتا هەست بە نەتەوەی خۆیان و کەرامەتیان بکەن. ئەوەی شایانی وتنە کەمن لە دەمی ساڵەوە لە بەغدا، تۆفیق وهەبی بەگ دەناسم ویستی کۆمەڵەیەکی رۆشنبیری دابمەزرێنی و بەشداری لە راپەرینی ئەدەبیدا بکا. داوای کۆبوونەوە لە ماڵەکەی خۆیا لێکردین، دەستەیەك لە پیاوانی زانست و ئەدەب ئامادەبوون، لەوانە: ئیبراهیم واعیز، مستەفا جەواد، محەمەد حەسەن سەلمان، عەبدولمەجید قەساب، *صفاءالخلوصی*، فوئاد جەمیل، گورگیس عەواد، مومتاز عومەری، عومەر خالید شابەندەر، ئەمیر نورەدین و ناهیدە رەفیق حیلمی...هتد. کۆمەڵەی دانان و وەرگێڕان و بڵاو کردنەوەمان دامەزراند، تۆفیق وهەبیمان بە سەرەك هەڵبژارد، *ابراهیم الواعظ* بە جێگری سەرۆك، لە حوزەیرانی ١٩٥٨ ژمارەی یەکەم لە گۆڤارەکەی بە ناوی "الکتاب" مان دەرچواند، ژمارەی دووەمی لە مانگی داهاتوودا دەرچوو، پاشان لە تەموز شۆڕش بەرپا بوو، کۆمەڵەکە هەڵوەشا و گۆڤارەکەش ون بوو. تۆفیق وهەبی لە وتە سەرەتاییەکەی کردنەوەی گۆڤارەکەدا ئاواتی

خواست کۆمەڵەکە بەشداری لە بزوتنەوەی دانان و وەرگێڕاندا بکا، گوتی: من ئومێد دەکەم هەوڵداغان لە مەیدانی وەرگێڕان و گواستنەوە لە زمانی فرەنجی و رۆژهەڵاتی بۆ سەر عەرەبی بەند نەبی، بەڵکو کرد و کۆشمان دەبێ کتێبی عەرەبیش بۆ ئەم سەر زمانانە وەگێڕین، ئەدەبی بەرزمان دەرخەین، بەرهەمەکانی زانستیمان بڵاو بکەینەوە، بەوە رووبارێکمان دەبێ دەرژێتە ناو باغی رۆشنبیری جیهانی سەردەم. بزوتنەوەی دانان و بڵاوکردنەوە لە هەر وڵاتێکدا چوست و چالاك نابی ئەگەر جوڵانەوەیەکی وەرگێڕانی لەگەڵ نەبی و پشتگیری لی نەکرێ، دەبێ رۆشنبیریمان موتربە بکەین بە رۆشنبریەتێك دەبێ بۆ نشونماو بەهێز بوونی دەوڵەمەند بکرێ، بەوەی کە لە رۆشنبیریەتیتردا هەیە، خەلیفەکانی عەباسی بەم راستیەیان دەزانی تایبەت لەوانەی باسیان بکەم، مەنسور دوای ئەو مەئمون هانی بزوتنەوەی وەرگێڕان و گواستنەوە لە هیندی و فارسی و ئیغریقی داوە تا ئەوەی سەردەمەکەیان لە دەوڵەمەند و گەشەدارترین سەردەمی رۆشنبیریەتی ئادەمیزادی لێهات[٤٧].

## محەمەد عەلی مەحمود

محەمەد عەلی ساڵی ١٨٩٢ لە شاری کۆیە سەر بە لیوای هەولێر لەدایك بووە، مەحمودی باوکی فەرمانبەر دەبێ. ساڵی ١٩١٣ چۆتە کولیەی حقوق لەبەغدا.

کە جەنگی مەزن بەرپا دەبێ لە سوپای تورکی دەیکەن بە ئەفسەر (ئیحتیات)، لە شەرەکانا بریندار دەبێ، لە کۆتایی ساڵەکانی جەنگ بۆ موسڵ دەینێرن، پاشان دەگەرێتەوە بەغدا، لە خوێندن بەردەوام دەبێ و بڕوانامەی حقوق ساڵی ١٩٢٠ بەدەست دێنێ، لە هەمان کولیەشدا نووسەر دەبێ(١٩١٩- ١٩٢٠)، ساڵانێکی زۆر کاری پارێزەری

---

[47]- لە ئێوارەی ١٩٩٩/٣/١٦ پەردە لەسەر پەیکەری ئەو زانا مەزنە کوردە لە سلێمانی لادرا. کە لە دەستکردی هونەرمەندی لێهاتوو "زاهیر سدیق"ە. (وەرگێڕ)

دەکات، هەتا دەیکەنە سەرەك تەدوینی یاسا و بەڕێوەبەری گشتی کاری پارێزەری عەدلیە (تشرینی یەکەمی ١٩٣٣)، پاشان بەریوەبەری گشتی تاپۆ (١٠ی حوزەیرانی ١٩٣٤) ئینجا ئەندامی مەحکەمەی تەمیز (کانونی یەکەمی ١٩٣٤)، لە هەمان کاتیشدا موحازەراتی لە کولیەی حقوق هەبووە. لە ئابی ١٩٣٥ بە نوێنەری لیوای دیالە هەڵبژێردرا، لە هەشتی ئەو مانگەدا دەیکەنە جێگری یەکەمی سەرەك ئەنجومەنی نوێنەران، پاشان بە نوێنەری هەولێر هەڵدەبژێردری (شوباتی ١٩٣٧)، هەروەها لە بیستوحەوتی ئەو مانگەدا هەڵدەبژێردری بە جێگری یەکەمی سەرەك نوێنەران. دەبێتە وەزیری دارایی (٢٤ی حوزەیرانی ١٩٣٧- ١٧ی ئای ١٩٣٧)، جارێکیتر بە نوێنەری هەولێر هەڵبژێردرایەوە (کانونی یەکەمی ١٩٣٧- شوباتی ١٩٣٩)، دوای ئەوە بۆ ماوەی دوو رۆژ دەبێتە وەزیری دارایی (لە ٢٩- ٣١ی کانونی دووەمی ١٩٤١)، لە دوا دوایەکەی سەردەمی وەزارەتی سێیەمی گەیلانی، دەبێتە وەزیری دارایی، پاشان لە حکومەتی بەرگری نیشتیمانیدا دەیکەنە وەزیری مواسەلات و ئەشغال ١٢ی نیسانی ١٩٤١. لە ٢٢ی ئایاری ١٩٤١ پەنا دەباتە بەر ئێران، لەوی دەیگرن و رەوانەی باشوری ئەفریقای دەکەن ١٩٤٢. لە نیسانی ١٩٤٤ دەیگەرێننەوە عێراق. پێنج ساڵ حوکمی قورسی بەسەر دادەدەن ١٦ی ئابی ١٩٤٤. بەڵام لە ٨ی تەموزی ١٩٤٧ بەری دەدەن. لە تشرینی دووەمی ١٩٥٠ بە نوێنەری کۆیە هەڵدەبژێردرێ، هەتا تشرینی یەکەمی ١٩٥٢. دەبێتە وەزیری داد ٧ی ئایاری ١٩٥٣، دوایی جێگری سەرەك وەزیران ١٧ی ئەیلولی ١٩٥٣ تا ٢٩ی نیسانی ١٩٥٤. دووبارە دەبێتەوە وەزیری داد ٨ی ئازاری ١٩٥٤ تا ٢٩ی نیسان دەکرێ بە ئەندام لە ئەنجومەنی ئەعیان ئازاری ١٩٥٤، تێدا دەمێنێتەوە هەتا شۆڕشی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨. لە ٣ی ئابی ١٩٥٤ بە وەزیرایەتی داد دەگەرێتەوە، هەروەها بە ئەرکی بریکاری وەزارەتی ئەعمار هەڵدەستی ٨ی ئایاری ١٩٥٥. لە ١٤ی تشرینی دووەمی ٥٥ هەتا ٧ی کانونی یەکەمی ١٩٥٥ بە وەزیرایەتی ئەعمار دەگوازرێتەوە. لە ٢١ی کانونی دووەمی ١٩٦٥ لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە. عەلی شێخ مەحمودی

هاوڕێی لە حکومەتی نیشتمانیدا لە یاداشتەکانیدا دەڵێ: محەمەد عەلی مەحمود و کامیل شبیب لە ئێرانەوە نامەیان بۆ کاربەدەستانی عێراق نووسیوە، پەشیمانی و توانج و گلەییان لە بزوتنەوە نیشتمانیەکە داوە، خۆیان لە لێپرسراوی ئاکامەکەیان بێبەری کردووە. دەست و دامێنبوونی حکومەتە تازە داهاتووەکەیان نیشان داوە بەڵام دادی نەدان.

## دارا بەگ

دارا محەمەد عەلی سەرداری عەشیرەتەکانی داودە، کوری محەمەد بەگ کوڕی عەلی ئاغا کوری ئیسماعیل کوڕی محەمەد کوڕی حەقی بەگە، لە ساڵی ١٨٩١ هاتۆتە دنیا. نیشتەجێبوونی عەشیرەتەکەی لە ناحیەی سەر بە لیوای کەرکوکە، بە نوێنەری کەرکوك بۆ ئەنجومەنی دامەزراندن هەڵبژێردراوە ١٩٢٤، دوای ئەوە لە ئەنجومەنی نوێنەران سەر لە نوێ لە شوباتی ١٩٣٥، ١٩٣٩ هەتا ١٩٤٣، و ١٩٤٣، ١٩٤٦، ١٩٤٧، ١٩٤٨ هەڵدەبژێردرێتەوە، لە شوباتی ١٩٥٦ کۆچی دوایی دەکات. مێژوونووس عەباس عەزاوی لە کتێبەکەیدا (عشائر العراق الکردیە) باسی دارا بەگ دەکات: دەڵێ لەناو میلەتەکەی خۆیدا خۆشەویست و ڕێزدار و گوێڕایەڵی بووین[٤٨].

---

[48]- دارا بەگ لەو سەردارە ناودارانە بووە کە شایستەی زیاتر نووسینە لەسەری، پیاوێکی بەخشندە و دڵفراوان و میهرەبان بووە. جوامێرانە بە هانای هەژار و لێقەوماوان هاتووە. گەلێ کەسی لە مەینەتی و بەندی ئەشکەنجەیی ڕزگار کردووە. بە دڵ و بە گیان خەڵك و عەشیرەتەکەی خۆشیان دەویست و ڕێز و شوێنی تایبەتی لای کاربەدەستانی حکومەتی ئەوسا هەبووە. خەتی تایبەتی تەلەفونی بۆ ڕاکێشراوەتە گوندەکەی کە بە ناوی ئاوایی دارابەگ ناوبراوە. سکەی شەمەندەفەریان بە ناودا بردووە هەر کاتێ سەفەری بکردبا فارغۆنی تایبەتی بۆ دەبەسترا. ژمارە (یەك ١) دراوە بە ئۆتۆمبێلەکەی. وەجاغ کوێر بوو. ئەوەی لە دوا بەجێ نەماوە. لە سەر وەسیەتی خۆی هەر لە ماڵەکەی خۆشی نێژراوە (وەگێڕ).

## ئەمین رەشید ئاغا

لە سەرۆکەکانی هۆزی هەماوەندە لە ناوچەی بازیان سەر بە لیوای سلێمانی. ئەمین رەشید ئاغا دەچێتەوە سەر تیپی رەمەوان، ئەگەرچی عەباس عەزاوی لە بەشی دووەمی کتێبەکەیدا "العشائر الکردیە" دەڵێ: باپیری ئەو تیپە رەمەیە، واتە رەمەزان. ئەمین کوری رەشید کوری قادر کوڕی حەیدەرە، لەسەر ئەنجامی هەرای شێخ مەحمود لە سلێمانی دەیکەنە قایمقامی قەزای چەمچەماڵ ئازار ۱۹۲۳، بەڵام رووداوی تاڵانکردنی ناوچەکەیان خستە ئەستۆی ئەو، لای دەبەن و لە تەمووزی هەمان ساڵدا بەندی دەکەن، ئەمین رەشید لە حوزەیرانی ۱۹۳۹ و حوزەیرانی ۱۹٤۸ و کانونی دووەمی ۱۹٥۳ و ئەیلولی ۱۹٥٤ بە نوێنەری کەرکوك هەڵدەبژێردرێ، لە ئەیلولی ۱۹٦٦ جیهان بەجێ دەهێڵێ.

عەشیرەتی هەماوەند وەك ئەمین زەکی بەگ لە کتێبەکەیا " مێژووی سلێمانی و دەورروبەریدا" دەڵێ: هەماوەند لە ئازاترین عەشیرەتەکانی کوردە، لە شەرو شۆڕشدا لە هەمووان خۆڕاگرو چەتونترن، تا ئەوەی ژنەکانیشیان لە هەرا و هۆریاکانیاندا بەشدارن، ئەو عەشیرەتە حکومەتی عوسمانییان گێژکردبوو، چەندین جار یاخی بوون و هەڵمەتی سوپایی دەنارده سەریان، بە تایبەتی لەسەردەمی والی بەغدا.

نامیق پاشای گەورە، مەدحەت پاشا، رەئووف پاشا، تەقییەدین پاشا، لەسەرۆکە بە ناوبانگەکانیانن، فەقی نادر کەوا لە ساڵی ۱۸۷۲ خۆی تەسلیمی حکومەت دەکاو دێتە بەغدا، جوامێر کە بەدەستی ئێرانیەکان لە ۱۸۸٦ دەکوژرێ، پاشان هەماوەندەکان لە هاوینی ۱۹۰۹ رێگای نێوان کەرکوك و سلێمانی دەگرن، هەردوو حکومەتی تورکی و ئێرانی بۆ سەرکوتکردنیان هێزیان ناردۆتە سەریان، ناچار روویان کردۆتە ناوچەی زەهاو، بۆ ساڵی ئاییندە والی نازم پاشا رێگای گەرانەوەیان بۆ بازیان دەدا.

گەنجەکانی هەماوەند لەسەردەمی تورکدا ناویان بە ڕێگری و تالآنکردنی ڕێبواری ناوچەکەیان دەرکردبوو، خاوەیان بەسەردا دەسەپاندن، تا وای لێهاتبوو لە ناو عێراقیەکاندا وشەی هەماوەند مانای ڕێگر بگرێتەوە.

## سەلاحەددین بابان

سەلاحدین کوڕی لامیع بەگ لە بنەماڵەی بابانە، لە سوێرە ساڵی ١٨٩١ هاتۆتە جیهان، باوکی لەوی قایمقام دەبێ و لە کوت و بەغدا خوێندویەتی، چۆتە حقوق و بڕوانامەکەی لە ١٩١٤ لی وەرگرتووە، لەسەر ئەنجامی بەرپابوونی جەنگی گشتی بۆ خزمەتی سوپایی بانگ هێشت دەکرێ، دەچێتە ناو کۆڕی شەڕەوە، باسکی چەپی برینداد دەبێ، پاشان خەریکی بەرێوەبردنی موڵکەکانی دەبێ. ساڵی ١٩٣٠ بە نوێنەری هەولێر هەڵدەبژێردرێ، کانونی یەکەم ١٩٤٥، بە نوێنەری خانەقین هەڵدەبژێردری ١٩٤٧.

لە ٣٠ی ئازاری ١٩٥٠ لە بەغدا کۆچی دوایی دەکا. دایکی کورد بوو، هەمیشە هەستی کوردایەتی هەبوە، بە پێچەوانەی جەلالی برای کە دایکی عەرب بووە، بەشداری لە کۆمەڵە نهێنیەکانی داواکار بە مافی عەرەب دەکرد.

## جەلال بابان

جەلالەدین کوڕی ڕۆستەم لامیع بابان زادەیە، خانەوادەی بابان لە بەناوبانگترین خێزانانی کوردە، مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ حەفت سەدە لەمەوبەر، فەرمانڕەوای ناوچەی شارەزووریان کردوە، پاشان سنوری ئیماراتەکەیان بەرفراوان کرد. میر ئیبراهیم پاشا پایتەختەکەی لە ساڵی ١٨٧٥ بۆ سلێمانی دەگوێزرێتەوە، ڕۆلەی بنەماڵەکەیانی تێدا فەرمانڕەوا دەبن هەتا دەوڵەتی عوسمانی لە ساڵی ١٨٤٨ ئیماراتەکەیانی لەناو دەبات.

رۆستەم لامیع بەگ قایمقام دەبێ لە سوێرەو قەزاکانی تر، کوڕی ئیسماعیل بەگ کوڕی ئیبراهیم پاشا کوڕی ئەحمەد پاشایە، جەلال بابان لە ساڵی ۱۸۹۲ لە بەغدا هاتۆتە جیهان. دایکی لە هۆزی (المیاح) ی عەرەبیە، لە قوتابخانەی ئامادەیی عەسکەری خوێندویەتی، ساڵی ۱۹۰۹ روو دەکاتە ئەستەنبۆڵ، لە خوێندنگای سوپایی دەخوێنێ. لە نیسانی ۱۹۱۲ بە ئەفسەر تۆپسازی دەرچوە، چۆتە ناو لیوای هەشتەم، بەشداری لە جەنگی بولقاندا کردوە. دوای ئەوە دەگوازرێتەوە بۆ فەیلەقی سێزدەم کە خراوەتە سەر لیوای سی و حەفتەمی مەدفەعیەی بیابان لە عێراق. کە جەنگی گشتی بەرپا دەبێ خۆی و تیپەکەی ماوەی سی ساڵ شەرەکانی قەفقاس دەبینێ، لە یەکی ئەیلولی ۱۹۱۵ بۆ ملازمی یەکەم باڵا دەکرێ، لە چوارەمین ساڵی جەنگا دوای کەوتنی بەغدا بە دەستی سوپای ئینگلیز لەگەڵ تاقمی سوارە کە خۆی سەرکردایەتی دەکرد رەوانەی مەیدانی عێراقی دەکەن. هەر بەردەوام دەبێ لەشەر هەتا ئاگر بەست و راوەستانی جەنگەکە. جەلال بە لاویەتی کاری بۆ مەسەلەی عەرەبی کردوە، چۆتە ناو کۆمەڵەی "عەهدی نهێنی. کە دەگەڕێتەوە عێراق، پاش کۆتاییهاتنی جەنگی مەزن دەستی بە تێکۆشانی نیشتمانی کردۆتەوە. بەشداری لە دامەزراندنی حیزبی "حرس الاستقلال"ی نهێنی کردووە. ساڵی ۱۹۲۰ کاربەدەستانی داگیرکەر گرتوویانە بۆ دورگەی "هنجام" لە خەلیج ئاوارەی دەکەن. یانزدە مانگی لێ دەمێنێتەوە. دوای راگەیاندنی لێبوردنی گشتی بەردراوە. دەچێتە ئەرکی بەڕێوەبەرایەتی. دەیکەنە قایمقامی سامەرا (٢٤ی کانونی یەکەمی ۱۹۲۱) ئینجا خانەقین (۱۹۲۲)، دێلتاوە (۹ی تەموزی ۱۹۲۲)، دوای ئەوە دهۆك ۱۹ی ئاب. جا موتەسەریفی لیوای مونتەفیك (۱ی شوباتی ۱۹۲۷)، موتەسەریفی کەربەلا (۸ی نیسانی ۱۹۳۰)، موتەسەریفی لیوای هەولێر (٢٦ی تشرینی دووەمی ۱۹۳۱). لە وەزارەتی ناجی شەوکەت دەبێتە وەزیری دارایی و هاتوچۆ (۳ی تشرینی دووەمی ۱۹۳۲) لەوەزارەتی یەکەم و دووەمی رەشید عالی گەیلانی. دەکری بە وەزیری بەرگری (۲۰ی ئازاری ۱۹۳۳- ۹ی تشرینی دووەمی ۱۹۳۳). بە نوێنەری هەولێر بۆ ئەنجومەنی نوێنەران هەڵدەبژێردری

(ئازاری ١٩٣٣- ئەیلولی ١٩٣٤). لە وەزارەتی دووەمی مەدفەعی پایەی وەزیری (مەعاریف) ی پێدەدری (٢١ی شوباتی ١٩٣٤) هەتا (٢٥ی ئابی ١٩٣٤). پاشان لە (١١ی کانونی یەکەمی ١٩٣٤) دەیکەنە بەڕێوەبەری گشتی دارایی ئینجا بەڕێوەبەری دارایی گشتی و هاتوچۆ (٢٧ی حوزەیرانی ١٩٣٥). بۆ جاری دووەم بەڕێوەبەری گشتی ئابووری (١٤ی کانونی یەکەمی ١٩٣٦). بە وەزیرایەتی دارایی و هاتوچۆ بەشداری لە وەزارەتی مەدفەعی چوارەما کردووە (١٧ی ئابی ١٩٣٧). لە ١٤ی ئایاری ١٩٣٨ لە فەرمان دەستبەردار دەبێ. دەیکەنە ئەندام لە ئەنجومەنی ئەعیان (١٩٣٧). هەڵبژێردراوە بە جێگری سەرۆکی ئەنجومەنەکە (٣١ی تەموزی ١٩٣٩). لە وەزارەتی نوری سەعید وەزیرایەتی مواسەلات و ئەشغالی پێدراوە ئەیلولی ١٩٣٩- ٢٢ی شوباتی ١٩٤٠، هەڵبژێردراوە بە جێگری سەرەك ئەنجومەنی ئەعیان (٢٧ی ئازاری ١٩٤١)، لە وەزارەتی مەدفەعی پێنجەما دەبێتە وەزیری مواسەلات و ئەشغال لە ٢٣ی حوزەیرانی ١٩٤٣ هەتا تشرینی یەکەمی ١٩٤١، پاشان لە وەزارەتی حەفتەمی نوری سەعید وەزارەتی دارایی پی سپێردراوە (٢٣ی حوزەیرانی ١٩٤٣). لە ٦ی تشرینی یەکەمی ١٩٤٣ دەستبەردار دەبێ. بە جێگری یەکەمی ئەنجومەنی ئەعیان هەڵدەبژێردری (٢ی کانونی یەکەمی ١٩٤٤)، هەتا ماوەی کۆتایی بوونی ئەندامیەتی (١٧ی تشرینی یەکەمی ١٩٤٥) دەیکەنە چاودێرکەری گشتی حیسابات (٢٥ی ئەیلولی ١٩٤٦)، لەو پایەی دەمێنێتەوە هەتا جارێکیتر لە وەزارەتی محەمەد سەدر دەبێتەوە وەزیری مواسەلات و ئەشغال (٢٩ی کانونی دووەمی ١٩٤٨). دوایی لە وەزارەتی موزاحیم پاچەچی وەزارەتی مواسەلات و ئەشغال بریکاری وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی پێدراوە. هەر بە وەزیرایەتی مواسەلات و ئەشغال لە وەزارەتی دەیەمینی نوری سەعید دەمێنێتەوە (٦ی کانونی دووەمی ١٩٤٦- ١٠ی کانونی یەکەمی ١٩٤٩). لە هەمان وەزارەتا بریکاری وەزارەتی دارایی پێدراوە (٦ی کانونی دووەمی ١٩٤٩ هەتا ١٦ی ئەو مانگە). دەیکەنە ئەندامی کارامە لە ئەنجومەنی ئاوەدان کردنەوە (٥ی تشرینی دووەمی ١٩٥٠). تێیدا دەبێ هەتا شۆڕشی

(١٤ی تەموزی ١٩٥٨) دوای ئەوە دەرد و نەخۆشی رووی تێدەکا. لە بەیروت نیشتەجی دەبێ. لە ٢٢ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٠ کۆچی دوایی دەکا.

## جەمال بابان



کوڕی رەشید کوڕی عەبدوڵلا بەگ کوڕی خالید پاشا کوڕی ئەحمەد پاشای بابان زادەیە، ساڵی ١٨٩٣ لە بەغدا هاتۆتە جیهان، لە کولیەی حقوق دەخوێنێ و بڕوانامەکەی ساڵی ١٩١٤ لی وەردەگرێت، لە ٨ی شوباتی ١٩١٤ گۆڤارێکی بە کوردی و تورکی نیومانگی بە ناوی "بانگی کورد" دەرکردووە. تەنیا پێنج دانەی لی دەرچوو کە جەنگی گەورە راگەیەندرا دەچێتە کۆڕی مەشق لە بەغدا (١٩١٤) بە نائیب زابت ئیحتیات دەرچووە. (١٩١٥) خزمەتی سوپای تورکی لە کۆڕی فەلاحیە و کوتدا دەکا. بۆ پایەی ملازم باڵا دەکری (١٩١٦). پاشان لە شەری (*ام الطبول*) شەری داگیر کردنی بەغدا بەدیل دەگیرێ. ئازاری ١٩١٧ دەگوازرێتەوە بۆ گرتوخانەیەك لە هیند. بە پایەی ملازم ئەوەل تێکەڵ بە سوپای شۆڕشی عەرەبی دەبێ لە عەقبە. لەگەڵ لەشکری عەرەبی دەبێ کە شام داگیر دەکەن. باڵا دەکری بۆ پایەی "رەئیس" و ئامیرەتی دەستەی تۆپچیەتی پێدەسپێرن، کە فەرەنسیەکان سوریا داگیر دەکەن دەگەرێتەوە بەغدا (١٩٢٠) بە کاری پارێزەری هەڵدەستێ، دەیکەنە معاون حاکمی جەزای بەغدا (١٥ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٤). جا حاکمی سولحی بەغدا (٢٥ی ئایاری ١٩٢٥)، (حاکمی منفرد) ی سلێمانی (٢٧ی ئەیلولی ١٩٢٥). حاکمی جەزای موسڵ (یەکی تشرینی دووەمی ١٩٢٦)، کە بە نوێنەری هەولێر بۆ ئەنجومەنی نوێنەران

هەڵدەبژێردری لە کاری قەزایی دەستبەردار دەبێ (١٣ی ئایاری ١٩٢٨). بە نوێنەری موسڵ هەڵدەبژێردری (١٩٣٠- ١٩٣٣). دیسان لەسەر هەولێر (١٩٣٤- ١٩٣٥). جارێکیتر نوێنەری هەولێر لە ئەنجومەنەکەدا (١٩٣٧- ١٩٣٩- ١٩٤٣). دەیکەنە وەزیری داد لە وەزارەتی نوری سەعیدی یەکەمدا (٢٣ی ئازاری ١٩٣٠). سەرەرای پایەکەی خۆی بریکاری وەزارەتی ئابووریشی پێدەسپێرن (١٣ی ئەیلولی ١٩٣٠- ٩ی تشرینی یەکەمی ١٩٣٠). لە وەزیرایەتی داد بەردەوام دەبێ لە وەزارەتی دووەمی نوری سەعید (١٩ی تشرینی یەکەمی ١٩٣١- ٣ی تشرینی دووەمی ١٩٣٢). بە وەزیرایەتی داد دەگەرێتەوە لە وەزارەتی یەکەمی مەدفەعیدا (٩ی تشرنی دووەمی ١٩٣٣) و لە وەزارەتی دووەمەکەشیدا (٢١ی شوبات ١٩٣٤) و لە وەزارەتی ئەیوبی (٢٧ی ئابی ١٩٣٤- ٣ی ئازاری ١٩٣٥). لە وەزارەتی شەشەمی نوری سەعیددا دەبێت بە وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتی (٩ی تشرینی یەکەمی ١٩٤١- تشرینی یەکەمی ١٩٤٢). بە نوێنەری هەولێر هەڵدەبژێردرێتەوە (١٩٤٣- ١٩٤٦). پاشان لە وەزارەتیساڵح جەبر دەبێتە وەزیری داد و بریکاری وەزیری ئابووری (٢٩ی ئازاری ١٩٤٧). پاشان بووەتە ئەندام لە ئەنجومەنی ئەعیان (تەموزی ١٩٤٧- ٢٩ی حوزەیرانی ١٩٥٥). واز لە بریکاری وەزارەتی ئابووری دێنی (٩ی ئەیلولی ١٩٤٧). لە وەزارەتی داد دەمێنێتەوە هەتا وەزارەت دەکەوی (٢٧ی کانونی دووەمی ١٩٤٨). کە ساڵح جەبر لە لەندەن دەبێ جەمال بابان بە ئەرکی بریکاری سەرەك وەزیران هەڵدەستی (١ی کانونی دووەمی ١٩٤٨- ٢٣ی تشرینی دووەمی ١٩٥٥). بە ئەندامیەتی ئەنجومەنی ئەعیان دەمێنێتەوە هەتا ١٤ی تەموزی ١٩٥٨. جەمال بابان پارێزەرێکی ناسراو بوو. لە کانونی دووەمی ١٩٦٥ لە بەیروت کۆچی دوایی دەکات.

## سدیق رەسوڵ قادری

جەنەرالی بێلۆڕووسیا و فەرمانبەرێکی بەڕێوەبەرایەتی عێراقی سدیق رەسوڵ قادر لە ساڵی ١٨٩١ لە بەغدا هاتۆتە دنیا. لە ئەستەنبوڵ خوێندویەتی کاتی بەرپابوونی جەنگە مەزنەکە دەبێتە ئەفسەر لە سوپای تورکیدا. لە بەرەکانی شەری قەفقاس جەنگاوە. بە دیلیەتی دەکەوێتە دەست روسەکان. کە شۆڕشی بەلشەفی روو دەدا (١٩١٧) خۆی دەخاتە پاڵ ئەو سوپا روسیەی کە بۆ بەگژداچوونی شیوعیەکان بە سەرکردایەتی جەنەرال دینکین و جەنەرال رانغل و ئەمێرال کۆشاك پێك هێنرابوو. پایەی جەنەرالی پێدراوە نازناوی پاشا بە خۆیەوە دەگرێ. بەرەو حیجاز دەروا. چاوی بە مەلیك حوسێن دەکەوێ. فتوایەك بە (تحریم) کردنی شیوعیەت دەردەچووێندرێ. دەگەرێتەوە سیبریا بە مەبەستی ورە بەرزکردنەوەی موسڵمانەکانی باشوری روسیا. بەلأم بەرەی خۆراگری و بەرگری لە ساڵی ١٩٢٠ دەروخێ. لایەنگرانی هەڵدێن و سەرکردایەتیەکەیان پەرت و بلأو دەبێ. قادری دەگەرێتەوە عێراق. کتێبەکەی لە ژێر ناوی (یاداشتی قادری لە شۆڕشە مەزنەکەی روسی) ساڵی ١٩٢٤ دەری چوواندووە. دەچێتە ناو فەرمانرەوایی حکومەتی عێراق (ئابی ١٩٣١). دەیکەنە مودیر ناحیە لە هەندێك ناوچەکانی باکوردا. دوایی قایمقام بۆ قەزای شەهربازار دەگوازرێتەوە (ئابی ١٩٣٨). پاشان بۆ سلێمانی (١٩٤١) و چەمچەماڵ (١٩٤٢). دەکری بە جێگری پارێزگاری بەسرە (١٩٤٣). دوایی قایمقامی زاخۆ (١٩٤٤). ئینجا قایمقامی ناو کەرکوك (١٩٤٦). بۆ قەزای رەواندوز دەگوازرێتەوە (١٩٥٠). پاشان بووەتە پشکێنەری بەریوەبەرایەتی. دوای ئەوە خانەنشین دەکرێ. کتێبەکەی (مەترسی سوور) کە دژ بە شیوعیەتە ساڵی ١٩٥٧ بە چاپی گەیاندووە. خزمەتگوزاریەکانی خۆی لە بەگژداچوونی لەشکرەکانی بەلشەفی ساڵی ١٩١٨ تێدا تۆمار کردووە.

دوای چەند ساڵێك لە کۆڕ و مەجلیسی مەحمود سوبحی دەفتەری دیتم: پیرێکی پەرێشانی پەککەوتووی دڵشکاو بوو. بۆی باس کردم: هەر کتێبەکەی (مەترسی سوور) ی دەرچوواند شۆڕشی تەموزی ١٩٥٨ی بەسەر داهات. شیوعیەکان تێدا باڵا دەست بوون ئەوەندەی پێی کراوە دانەی کتێبەکانی کۆ دەکاتەوە و لە ناویان دەبا. لە ترسان خۆی لە ماڵەوە گۆشەگیر دەکا هەتا هەڵپە و هەڵچوونیان سنووربەند دەبێ. لە بەسرە نیشتەجێ بووە تاکو ساڵی ١٩٨١.

## شێخ قادر شێخ سەعید حەفیدزادە

شێخ قادر شێخ سەعید بەرزنجی برای شێخ مەحمودی سەرداری شۆڕشگێڕی کوردە، ساڵی ١٨٩٥ لە سلێمانی هاتۆتە جیهان. زانیاریەکانی ئاینی لەسەردەستی شێخەکانی شارەکەیدا وەرگرتووە. بەسەرکردەی لەشکری گیان فیداکانی کورد بۆ پشگیری تورکەکان لە شەری دژ بە ئینگلیز لە باشوری عێراق دەچی (١٩١٥)، ساڵی ١٩٢٤ بە نوێنەری سلێمانی لە ئەنجومەنی دامەزاندن هەڵدەبژێردرێ، پاشان لە تەموزی ١٩٢٥ دەیکەنە ئەندامی ئەنجومەنی (ئەعیان) بەڵام دامەزرانەکەی لەبەر تەمەن نەگەیشتنی یاسایی هەڵدەوەشێ، لە ئازاری ١٩٤٠ بەسەرۆکایەتی (غرفە) ی کشتوکاڵی سلێمانی هەڵدەبژێردرێ. ساڵی ١٩٥٩ کۆچی دوایی دەکات[٤٩].

## داود جاف

لە کفری سەرەك عەشیرەتەکانی جافە، داود لە ساڵی ١٨٩٤ لە دایك دەبێ، خۆی بە کشتوکاڵەوە خەریك دەکا، لە ماوەی جەنگی یەکەمی مەزندا بەلایەنگری تورکەکان دژ بە

---

[49]– شێخ قادر لە حکومەتی شێخ مەحموددا پایەی سوپاسالاری بووە. هەروەها سەرەك وەزیرانی حکومەتەکەی مەلیك مەحمود بوو.

لەشکری رووسی لەسەر سنوری ئێران جەنگاوە، لە ئابی ١٩٣٥ بە نوێنەری لیوای کەرکوك هەڵدەبژێردرێ، دووبارە لە حوزەیرانی ١٩٣٩ هەڵدەبژێردرێتەوە، هەروەها لە ئەنجومەنی نوێنەرایەتییەکانی یەك لە دوای یەك هەتا شۆڕشی تەموزی ١٩٥٨ هەڵدەبژێردرێتەوە، دوای ئەوە پەنا دەباتە بەر ئێران. لە ئایاری ١٩٦٦ لە تاران کۆچی دوایی دەکات.

دواد جافێکی تر کە (١٩٠٤-١٩٧٤) یەك لەسەرەك خێڵەکانی جافە لە هەڵەبجە، کوڕی محەمەد سەعید بەگ کوڕی عوسمان پاشای جافە.

## ئیسماعیل رەواندوزی

ئیسماعیل بەگ رەواندوزی کوڕی سەعید کوڕی عەبدوڵڵا موخلس لە نەوەی رەسول ئاغای برای محەمەد پاشای رەواندوزی ناسراو بە محەمەد پاشای کۆرە، کەمیری رەواندوز بور، هەتا دەوڵەتی عوسمانی ساڵی ١٨٣٦ فەرمان رەواییەکەی لەناو بردووە. ئیسماعیل بەگ ساڵی ١٨٩٥ لە رەواندوز هاتۆتە جیهان، کاربەدەستانی بەریتانی ساڵی ١٩٢٠ لە کاتی بەرپا بونی ئاژاوە لە ناوچە کوردیەکاندا دەیکەنە فەرمانڕەوا لە شارەکەی خۆیدا. لە تەمووزی ١٩٢٥ بە نوێنەری لیوای هەولێر هەڵبژێراوە و لە ١٩٢٨ لە نوێ هەڵدەبژێردرێتەوە، لە حوزەیرانی ١٩٣٣ لە رێگای چونەوەیدا بۆ رەواندوز بەغەدر دەکوژرێت.

ئیسماعیل بەگ ساڵی ١٩٢٧ بەرهەڵستی (تەجنیدی ئیجباری) کردووە، بەیان نامەیەکی لە رۆژنامەی (الاوقات البغدادیە) دا بڵاودەکاتەوە تێیدا دەڵێ: هەندێك خەڵك وادەزانی تەنیا شیعە لە تەجنیدی ئیجباری ناڕازین، بەڵام هەروەها کوردەکانیش بەتەواوی سەرپێچی دەکەن و لەگەڵ جەعفەریەکان رێك دەکەون کەوا یاسای تەجنید لەگەڵ بارودۆخی سیاسی و ئاستی ئێستامان ناگونجێ، ئەو راو بۆچونەش سەراپای کورد بڕوای پێیەتی.

## حازم شەمدین ئاغا

یوسف پاشا شەمدین ئاغای باوکی حازم بەگ لەسەردەمی خۆیدا سەردارو سەروەری زاخۆ بووە.. حازم بەگ ساڵی ١٨٩٥ لە زاخۆ هاتۆتە دنیا، لە ساڵی ١٩٢٥ بەنوێنەری موسڵ هەڵدەبژێردرێ، سەر لە نوی هەڵدەبژێردرێتەوە (١٩٢٥-١٩٣٠)، هەروەها لە دەورەکانی ساڵانی داهاتودا: لە کانونی یەکەمی ١٩٣٤ هەتا ١٩٤٦ هەڵبژاردنەکەی نوی دەکرێتەوە. لە ئازاری ١٩٤٦ دەیکەنە ئەندامی ئەعیان، تێیدا دەمێنێتەوە هەتا ٢٧ی شوباتی ١٩٥٤، لە وەزارەتی سێیەمی تۆفیق سوێدی دا دەبێتە وەزیری بی وەزارەت (٥ی شوبات ١٩٥٠-٦ ئەیلول ١٩٥٠). [٥٠]

---

[50]- کار و رەفتاری خێرخوازی و جوامێرانەی حازم بەگ تاکو ئەمڕۆش لەسەر زار و یادی خەڵکی ناوچەی زاخۆ و دەوروبەریەتی. بەشبەحاڵی خۆم یەك دوو جار چوومەتە زاخۆ بۆ ئەوەی بتوانم وێنە و هەندێك زانیاری لە بەسەرهات و هەڵوێستی تایبەتی ئەو پیاوە دلێرە بەدەست بێنم. بەڵام وەك پێیان ڕاگەیاندم هەموو کوڕ و نەوەکانی لە دەرەوەی وڵاتدا دەژین. زۆربەیان پیاوی کارامە و لێهاتوون. خوێندەوار و خاوەن بڕوانامەی بەرزن. بە ڕێکەوت توشی مامۆستایەکی بەتەمەن بووم بۆی باس کردم گوتی: بەراستی حازم بەگ باوکی هەژار و کەساس و لیقەوماوی میللەتەکەی بوو. بۆ نمونە: لە ساڵی ١٩٤٢ و یا١٩٤٣ خەڵکێکی زۆری کوردی تورکیا بە ماڵ و خێزانەوە ڕوو لە زاخۆ دەکەن لە خانی حاجی ئیبراهیم کە ئێستا مزگەوتە دادەبەزن. قایمقامی ئەوسا شاکر هورموزی کە پیاوێکی تورکمان بوو فەرمان دەدا کە ئەو کوردانە هەموویان دەربکرێن. کە حازم بەگ بەوە دەزانی زۆر دڵنیگەران دەبێ. بە عادەتی خۆی هەموو ڕۆژێ لە دیوەخانەکەیدا پێشوازی لە میوانەکانی دەکات. قایمقامیش یەك لەوان دەبێ. حازم بەگ بە تووڕەییەوە پێی دەڵێ: چۆن ئەم کوردانە بەم زستانە سارد و پڕبەفرە کە لەوانەیە هەموویان بمرن و لەناوبچن دەریان دەکەی. قایمقام دەڵێ: چیان بەسەردی با بەسەریان بێ. من بە گوێرەی یاسا کە بە بێشەرعی هاتوون دەریان دەکەم. دوای ئەوە حازم بەگ تەلەفۆن بۆ موتەسەریف دەکات مەسەلەکەی تێدەگەیێنێ. لەسەر داواکاری ئەو قایمقام لەوێ لادەچێ. کوردەکانیش لە جێگای خۆیان دەمێننەوە. لە لایەکیتریشەوە هەمزە عەبدوڵلا کە ئەمڕۆ لە کوردە سیاسیە ناسراوەکانە لە بنچینەدا کوردی تورکیایە. لە کاتی جەنگی دووەمی جیهانی لە هەردوو حکومەت تورکیا و عێراق تاوانبار

له حوزەیرانی ١٩٥٤ له موسڵ جیهان بەجی دێڵێ. مەحفوز محەمەد عومەر له کتێبەکەیدا (*امارة بهدينان العباسية*) به پیاوێکی مرۆڤانەی ناو بردووه، نازناوی باوکی هەژارانی پی داوه. له بنەماڵەی شەمدین ئاغا محەمەد کوڕی حاجی ئاغای ئامۆزای حازم بەگ ناسرابوو، لەسەردەمی تورکەکاندا سەرەك شارەوانی زاخۆ دەبێ. له ئازاری ١٩٢٤ به نوێنەی موسڵ له ئەنجومەنی دامەزراندندا هەڵبدەبژێردرێ، بەڵام له ٢٣ی تەموزی هەمان ساڵدا بەهۆی رووداوی کەوتنی فڕۆکەکەی له کاتی گەرانەوەی له موسڵەوه بۆ بەغدا گیانی له دەست داوه.

ئیلیاس زخوڕا له کتێبەکەیدا (*مراه العصر فی تاریخ ورسوم اکابر الرجال بمصر ـ قاهیرة ١٩١٦*) دەڵێ: بنەماڵەی شەمدین ئاغا له خێزانه کوردە ناسراوەکانە، هەندێك له کوڕەکانیان بۆ شام و میسڕ رەویان کردووه، بکباشی مەحمود ئەفەندی شەمدین ئاغا لەسەردەمی والیەتی محەمەد عەلی پاشادا له ئەفسەرانی سوپای میسڕ بووه، دوایی محەمەد ئەفەندی لەو کاتەی که ئەفسەر دەبێ له سوپای تورکیدا لەگەڵ کامیل لوتفی کوڕەکەی که تەمەنی دووساڵان دەبێ له ١٨٧١ له شامەوه دەچنه لای مەحمود ئەفەندی برای له میسڕ و کامیل لوتفی بەگ دەبێته یەك لەناودارو موڵکدارە گەورەکانی (فەییووم).

---

کرابوو. حازم بەگ له ماڵی خۆی داڵدەی دەدا و رێزی لی دەنی و به ناز و نیعمەت پارێزگاری دەکا هەرچەندە پۆلیس و کاربەدەستیش بەوه دەزانن بەڵام لەبەر حازم بەگ ناتوانن هیچ بکەن. مامۆستا لەسەر باسەکەی رۆیشت و گوتی: ئەوەندە پیاوێکی بەخشندە و لێبوردە بوو ئەگەر یەکێك پاشمله باسی به چاکە نەکردبایە و شاڵاوی هێنابایە سەری ئەو دەچوو گەنم و برنج و دیاریتری دەدایە!! رۆژی له رۆژان هەندێك نیش و کاری لەناو زەویەکاندا دەبی سەرکارەکەی حازم بەگ چەند کرێکارێك دەردەکا. که حازم بەگ لێی دەپرسی له هۆی دەرکردنیان دەڵی چونکه نیشمان پێیان نەماوه. حازم بەگ دەڵێ: با ئەو بەردانەی که گواستیتیانەوه با بیبەنەوه جێگاکەی خۆی. سەرکارەکه سەری سوڕ دەمێنێ. حازم بەگ دەڵێ: ئەوانه هەژارن. دەمەوی بێکار نەبن گوزەران بکەن "رەگێر"

## ماجد مستەفا

ماجید مستەفا مەحمود دەچێتەوە سەر خێزانێکی ناسراوی کورد. ساڵی ١٨٩٦ لە سلێمانی هاتۆتە جیهان، لە قوتابخانەی دواناوەندی عەسکەری دەخوێنێ پاشان بەرەو ئاستانە دەکەوێتە رێ، دەچێتە خوێندنگا سوپاییەکەی، بە ملازم سانی دەرچووە، وەك ئەفسەرێك دەچێتە ناو لەشکری تورکی، لە شەڕەکانی جناق قەلعە و فەلەستین بەشدارو زامدار دەبێ. دوای ئاگر بەست دەگەڕێتەوە بەغدا، بەشداری لە بزوتنەوە نیشتمانییەکەی کوردی کردووە لە سلێمانی و یەك لەسەرکردەکانی هێزی شێخ مەحمود بووە لە کاتی یاخی بونەکەیدا (تەموز ١٩٢٣)، دوای ئەوە بووە بە مودیر ناحیەی موفەقیە لە پارێزگای کوت (١٩٢٧)، بۆ قایمقامی ئامێدی باڵا دەکری (١٩٢٩)، دەچێتە کفری (١٩٣١)، دووبارە ئامێدی (١٩٣٢)، لە ئەیلولی ١٩٣٤ دەیکەنە جێکاری پارێزگاری کوت، دوایی دەبێتە پارێزگاری مونتەفیك (نیسان ١٩٣٥)، ئینجا عەمارە پاشان دیوانیە (١٩٣٦)، هەروەها کوت (١٩٣٧) دیسان عەمارە (١٩٣٨)، لە حوزەیرانی ١٩٤١ دەگوازرێتەوە بە پشکنێنەوی بەرێوبەرایەتی، پاشان لە تشرینی یەکەمی ئەو ساڵەدا دەست بەرداری دەکەن، لە ٢٥ی کانونی یەکەمی ١٩٣٤ لە وەزارەتی هەشتەمی نوری سەعید دا دەبێتە وەزیری بی وەزارەت هەتا ٣ حوزەیران ١٩٤٢، لە نیسانی ١٩٤٤ بە نوێنەری سلێمانی هەڵدەبژێردرێ، دەیکەنە وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتی (١٦ ئەیلولی ١٩٥٠-١٠ تەمموز ١٩٥٢)، بە نوێنەری قەزای رانیە هەڵدەبژێردری (تشرینی دووەم ١٩٥٠)، بەردەوام دەبێ لە وەزیرایەتی کاروباری کۆمەڵایەتیدا (١٢ تەموز ١٩٥٢)، پاشان وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی و هەروەها جێکاری وەزارەتی ئابووری وەردەگرێت (٢٢ تشرینی دووەم ١٩٥٢) لە ٢١ کانونی یەکەم ١٩٥٢ دەست بەردار دەبێ. لە کانونی دووەم ١٩٥٣ و حوزەیرانی ١٩٥٤ بە نوێنەری سلێمانی هەڵدەبژێردرێتەوە، بەڵام ئەو ئەنجومەنە

دەست بەجی هەڵدەوەشێ، جارێکی تر دەیکەنەوە وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتی (٢٩ کانونی دووەم ١٩٥٣-١٧ ئەیلول ١٩٥٣)، پاشان دەکەوێتە کاروباری بازرگانیەوە. ماجید مەستەفا لە ٢ ئابی ١٩٧٤ لە بەغدا ماڵ ئاوایی لە ژیان دەکات.

## راغب عەبدوڵلا بەگ

راغب عەبدوڵلا بەگی عوسمان پاشازادە لە سەردارانی عەشیرەتەکانی باجەلانە لە خانەقین (سەر بە پارەزگای دیالە ) لە حوزەیرانی ١٩٥٤ بە نوێنەری ئەوی هەڵدەبژێردرێ. سەرلە نوی لە ئەیلولی ١٩٥٤ و ئایاری ١٩٥٨ هەڵ دەبژێردرێتەوە. لە کانونی دووەمی ١٩٦٨ لە خانەقین جیهان بەجی دێڵێ.

مستەفا پاشا کوری عوسمان پاشا لە ماوەی جەنگی یەکەمی جیهانی دا سەرۆکی عەشیرەتەکانی باجەلان بووە، کە کۆچی دوایی دەکات عەبدوڵلا بەگی برای ( باوکی راغب بەگ) جێگای دەگرێتەوە، پاشان شەوکەت بەگی کوری (واتا برای راغب بەگ).

## دکتۆر شەوکەت زەهاوی

شەوکەت کوری ئیبراهیم کوری محەمەد فەیزی زەهاوی موفتی بەغدایە، لە پێنجی ئازاری ١٨٩٦ لە بەغدا هاتۆتە دنیا، لە کۆلێجی پزشکی حەیدەر پاشا لە ئاستانەدا پاشان لە پاریس دەخوێنێ، دەگەرێتەوە بەغدا دەیکەنە یاریدەدەری بەرێوەبەری پەیمانگای باسۆلۆجی(١٩٢٢)، دوایی بەرێوەبەری پەیمانگاکە (١٩٣٥) هەتا تەموزی ١٩٥٨، جگە لە ماوەیەکی کەم کە بوەتە وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتی (٢٣ نیسانی ١٩٤٦ _٣١ ی ئایاری ١٩٤٦ )، پاشان دەگەرێتەوە بۆ بەرێوەبەری پەیمانگای بایۆلۆجی (حوزەیرانی

١٩٤٦) لە ئایاری ١٩٥٣ دەیکەنە ئوستازی کۆلێجی پزشکی، دوای شۆڕشی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ لە فەرمان دەست بەردار دەبێ.

کتێبی (البایۆلۆجی العام) ساڵی ١٩٦٣ داناوە. ئەحمەد حەسەن زەمیاد باسی دەکا دەڵێ: پشوی فراوان، بیر تەسك و هۆشمەند، هەوڵ و کۆششی هەمووی بەکارو فەرمانەکەیەوە بەند بوو، چ ئارەزوێکی تری نەبوو، بەشداری چ بیرو رایەکی نەدەکرد تا ئێستا بایەخی بە هیچ رووداوێك نەداوە.. دکتۆر شەوکەت لە ژیاندا ماوە لە بەغدایە (کانونی دووەمی ١٩٩١).

## ئەحمەد موختار جاف



شاعیری کورد ئەحمەد موختار بەگ لە سەرۆکەکانی جافە، کوڕی عوسمان پاشا کوڕی محەمەد پاشا کوڕی کەیخوسرەو بەگە. ساڵی ١٨٩٦ لە هەڵەبجە هاتۆتە جیهان، لەسەر دەستی زاناکانی ئەوی دەخوێنێ، لەخۆڕسکەوە بەهرەی شاعیریەتی هەبووە، شیعری بە دوو زمانی کوردی و فارسی هونیوەتەوە. لە تەموزی ١٩٢٥ بە نۆێنەری سلێمانی لە ئەنجومەنی نوێنەراندا هەڵبژێردرایەوە. بەڵام لەساڵی داهاتوودا واز دەهێنێ، دووبارە لە تشرینی دووەمی ١٩٣٠ هەڵبژێردراوە. ساڵی ١٩٣٣ لە کاتی پەرینەوەی لە زێی سیروان دەدرێتەبەر گوللە و گیانی لە دەست دەدا. دیوانە شیعریەکەی ساڵی ١٩٦٠ چاپکراوە و لە بەرهەمە بەجێماوەکانی : چیرۆکی مەسەلەی ویژدان ، چاپی ساڵی ١٩٧٠ .

ئەحمەد موختار شۆڕە سوارێکی ئازا بوو، کوڕێکی نیشتمان پەروەر بوو. گەل و ولاتەکەی لا خۆشەویست بوو. محەمەد ئەمین زەکی نمونەیەکی شیعری هێناوەتەوە کە دەڵی:

له خەو هەڵسن درەنگە میللەتی کورد خەو زەرەرتانە

هەموو تەریخی عالەم شاهیدی فەزل و هونەرتانە

دەسا تێکۆشن ئەی قەومی نەجیبی بی کەسی مەزڵووم

بە کورتی ببڕن ئەو ڕێگە دورەی وا لە بەرتانە

ئەنوەر قادر جاف لە وتارێکدا لە ڕۆژنامەی (التآخي- ١٩٧١/١٢/٢٠) دەڵێ: شاعیر لە کۆمەڵگایەکی پڕ زۆرداری کۆمەڵایەتی و جەور و ستەمی چینایەتی ژیاوە، ئەو بارە نالەبارە بوو هێزی لێستاندبوو، بەرژەوەندی تایبەتی و ژیانی شادمانی و کامەرانی خۆی خستۆتە لاوە ڕێزی چینی بەگلەری و دەرەبەگایەتی بنچینەیی خۆی بەجی هێشتووە، چۆتە ڕیزی گەلەکەی، بە خەبات و شیعرەکانی دەستی بە چارەسەرکردنی کێشەکانی میللەتەکەی کردووە. هانی داون کە یەکگرن و ڕاپەڕن لە پێناو ئازادی و سەرفرازیا، لە شیعرەکانیدا ڕەخنەی لە کۆمەڵگا بێسەروبەر و ناهەموارەکەی گرتووە، ئەو کۆمەڵگایەی کەوا دووبەرەکی عەشایەری و خەرافات باڵی بەسەردا کێشاوە، کەوا بووەتە قوربانی و بەندە گیربوونی ئەو جەور و ستەمە، لە چوارچێوەی زەبر و زەنگی ناڕێکی و نەریتی کۆنی ئەوسای کۆمەڵەی کوردەواری دەینالاند، بیری پڕهەستی نەتەوایەتیەکەی لە داکۆکی بەرگری لە هەژار و چەوساوەکانی تێکڕای گەلەکەی ڕەنگی داوەتەوە. چیرۆکێکی جوانی لە ژێر ناونیشانی (مەسەلەی ویژدان) هەیە. شاعیرێکی شۆڕشگێر بوو بە هەموو مانای وتەوە. ڕەفیق حیلمی دەڵێ: شیعرەکانی ئەحمەد موختار نمونەیەکن لە تەر و پاراوی و ئاوازیی جوان.

ئەنوەر قادر جاف باسی دەکا و دەڵێ: ئەحمەد موختار پەیوەندیەکی دۆستایەتی بە شێخ مەحمود حەفیدەوە هەبوو، بەڵام بە هۆی بوختان و لێدوانی ناحەزانی شێخ حەپسی دەکا.. شاعیر قەسیدەیەکی هەست بزوێن و پڕستایش بۆ شێخ مەحمود دەهۆنێتەوە ئیتر بەری دەدا.

## لیوا بەهائەدین نوری

بەهائەدین کوڕی شێخ نورەدین کوڕی ئیسماعیل کوڕی حەسەن بەگ شێروانییە، شێخ نورەدینی باوکی لە زانا ناسراوەکانی ئایینی بووە، ساڵی ١٨٦٧ لە هەولێر هاتۆتە جیهان و ساڵی ١٩٤٢ لە بەغدا ماڵئاوایی لە ژیان کردووە، لە سەردەمی تورکەکاندا کردیانە بەڕێوەبەری خوێندنگای مامۆستایان لە بەغدا و لە بەسرە ١٩٢٠- ١٩٢٦). پاشان بەڕێوەبەری کولیەی ئیمام ئەعزەم بووە، چەندین کتێبی داناوە لەوانە: خلاصە تاریخ الاسلام، الفسلسفە العلمیە، الفلسفە الاخلاقیە، تاریخ التربیە... هتد.

بەهائەدین ساڵی ١٨٧٩ لە سلێمانی لەدایك بووە، لە خوێندنگای عەسکەری لە ئەستەنبول بە ئەفسەر دەرچووە، لە مەیدانی عێراقدا جەنگاوە، بە دیلیەتی دەکەوێتە دەست سوپای بەریتانی بە سەرکردایەتی جەنەراڵ مۆد، دوای ئەوە دەچێتە ناو سوپای عەرەبی لە حیجاز و سوریادا. لە ١١ی ئابی ١٩٢١ دێتە ناو سوپای عێراق. پاش ئەوە دەیکەنە مامۆستای (خانەی مەشقی سوپایی). لە کۆتایی ساڵی ١٩٢٤ دەینێرنە بەریتانیا ساڵێك لە (ئالدەرشود) مەشق دەکا. پاشان دەچێتە قوتابخانەی چەکە سوکەکان، لە شوباتی ١٩٢٦ دەیبەنەوە بۆ عێراق پێشکەوتووی ڕاهێنەری ڕەشلشەکان ئینجا ئەفسەر روکن لە وەزارەتی بەرگریدا. لە کولیەی ئەرکانی عێراق دەخوێنی لێی دەردەچێ. بە پایەی مقدم لیوا بەشداری لە بزوتنەوەکانی سلێمانی و بارزان دەکا. لە تەموزی ١٩٢٨ لەگەڵ تۆفیق

سوێدی دەچی بۆ کۆنگرەی جەددە وەك پسپۆڕێکی سوپایی بۆ وتوویژ کردن لەگەڵ عەبدولعەزیز ئالسعوددا. وەفدەکەش بە سەرۆکایەتی سێرجلبرد کالاتین بووە.

بەهائەدین نوری ساڵی ١٩٣١ بڕوانامەی بە کەلۆریۆسی زانیاری لە کولیەی ویلایەتی کەنساس بەدەست هێناوە. بە کاری دەرس وتنەوە لە کولیەی ئەرکان هەڵدەستێ. ساڵی ١٩٣٥ بە وەفد دەنێردرێتە ئینگلتەرە بۆ بەردەوامبوونی خوێندن لە کولیەی ئەرکان لە کمبرلی. پاش ساڵێك دەگەڕێتەوە. دەبێتە ئەفسەر روکنی یەکەم. ئینجا ئامیر کولیەی ئەرکانی عێراقی (١٩٣٧). باڵا دەکری بۆ پایەی عەمید ئەیلولی ١٩٣٨. لە کانونی یەکەمی ١٩٣٨ خانەنشینی دەکەن. خزمەتگوزاریەکەی دەگوازنەوە بۆ سکەی شەمەندەفەر و دەیکەنە جێگری بەرێوەبەری گواستنەوە. لە ئابی ١٩٤١ دەگەڕێتەوە سوپا، دەیکەنە ئامیر کولیەی ئەرکان. دوایی یارمەتیدەری سوپاسالاری ئەرکان و بریکاری بەرێوەبەرایەتی گشتی لە وەزارەتی بەرگریدا. لە کانونی یەکەمی ١٩٤١ بۆ پایەی لیوا باڵا دەکرێ. دەگوازرێتەوە بۆ سەرکردەی ناوچەی باشور لە بەسرە تشرینی دووەمی ١٩٤٢، پاشان لە ئابی ١٩٤٤ لە فەرمان دەستبەردار دەبێ، دەیکەنە پارێزگاری سلێمانی لە ئازاری ١٩٤٧. پاشان لە حوزەیرانی ١٩٤٨ بە نوێنەری سلێمانی هەڵدەبژێردرێ. دەیکەنە وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتی ٦ی کانونی دووەمی ١٩٤٩ تا ١٠ی کانونی یەکەمی ١٩٤٩. پاشان کردیانە وەزیری مفەوەز لە دیوانی وەزارەتی دەرەوە مایسی ١٩٥١ دوایی دەبێتە وەزیر مفەوەز لە باڵوێزخانەی عێراق لە تاران (ئابی ١٩٥١). پاشان لەوی باڵا دەکری بۆ باڵوێز ئایاری ١٩٥٣.

دوابەدوای یەکبوونەکەی عێراق و ئۆردن و یەکبوونی فەرمانی دیپلۆماسییەتی هەردوو دەوڵەت بە سەفیرایەتی دەگوازرێتەوە عمان کانونی دووەمی ١٩٥٦- تەموزی ١٩٥٨. دوایی شۆڕشەکەی ١٩٥٨ لە ئۆردن دەمێنێتەوە. دەیکەنە سەفیر لە وەزارەتی دەرەوەی ئۆردن تا لە ئابی ١٩٥٩ لە پایەکەی دەخەن. دەیکەنە وەزیر مفەوەزی ئۆردن لە رۆما. لە

نیسانی ١٩٦٠ لە پایەختی ئیتالیا جیهان بەجی دێلێ. بەهائەدین ئەم کتێبانەی لە ئینگلیزیەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی *(الرتل الخامس ١٩٤٢)* *رحلة ريج في العراق عام ١٨٢٠* لە ساڵی ١٩٥١ چاپکراوە، جەنگیزخان ١٩٤٦، *حرب الفلسطين، الخطوط الاساسية لحرب العراق (١٩٣٥)*، هەروەها *(كيف تعالت بروسية)* هی ئەحمەد رەفیق (١٩٣٤)، بەهائەدین نوری کتێبی سوپایشی داناوەو وەریگێڕاوە لەوانە: *اوامر الحركات (١٩٢٨)، تعبيئة الرشاشات (١٩٢٩)، رتل باز في حركات بارزان (١٩٣٢)، مسائل في تعبيئة الخيالة (١٩٣٠)، نقاط في تدريب التعبيئة الصغرى (١٩٣٠)*...هتد. خالید دورڕە دەڵێ: بەهائەدین نوری پەروەردە ئاینیەکەی و گەنجایەتی بەغدای لی کۆبۆوە، ئەفسەر روکنێکی بە تواناو رۆشنبیرێکی بەرفراوان بوو، ئەحمەد حامید سەراف بۆی باس کردم کەوا بەهائەدین لە زمانی تورکی ئەدیب بووەو شیعری ناسکی هۆنیوەتەوە. هەروەها عەبدولعەزیز موزەفەر پێی گوتم کە: بەهائەدین نوری ساڵی ١٩٢٤ دەچێتە ئینگلتەرە بۆ بەشداری کردن لە دەورەیەکی سوپایی، بەپێی ئەوەی کە ئاین پەروەرێکە دەپرسی لە مزگەوتێك کە لە لەندەن نوێژی لی بکات پێیان گوتبو مزگەوتێك لە شاری (وۆکینگ) هەیە ٢٤ میل لە باشوری رۆژهەڵاتی پایتەختە، رۆژی هەینی سواری شەمەندەفەر دەبێ بەرەو ئەو شارە دەکەوێتە رێ، نیوەرۆ دەچێتە مزگەوتەکە سەیر دەکا دەرگاکە کلیل دراوە، کە زەنگەکە لێدەدا بە زەحمەت پیاوێکی پیری سەرو سیما هیندی عەمامە بەسەری لێدێتە دەرو پێی دەڵێ: ئایا ئەوە مزگەوت نیە! ئیمڕۆ هەینی یەو کاتی نوێژهاتووە کوا نوێژکەرەکان؟ پیاوە پیرەکە داوای لێبوردنی لی دەکا دەڵێ: ژمارەی موسڵمانەکان کەمە ئەوان رۆژی جومعەکار دەکەن، ئەگەر رۆژی یەك شەم بێیت کە لەم وڵاتەدا پشودانە دەتوانی بەشداری نوێژی جومعە بکەیت. بەهائەدین نوری نیوەرۆی یەك شەمە دێتەوە شاری (ووکینگ) کە چی دیسان دەرگاکە داخراوە، زەنگەکە لی دەدا کابرا لێی دێتە دەر و بەسەر سوڕماوی پێی دەڵێ: ها کوڕە لاوەکە ئەوە تۆی هاتیەوە!! دەڵی بەڵی بەڵام کوا نوێژ کەرەکان؟ دەڵێ: پەلە مەکە تۆ لە وڵاتی موسڵمانان نی لە ووڵاتی کافرانی لێرە نوێژ

عەسران دادەبەستری، سەعات چوار وەرەوە، نویژبکەو پاشان چا بخۆرەوە! بەهائەدین نوری لە سەعاتی دیاری کراودا دەچیتەوە دەبینی دەرگای مزگەوتەکە کراوەتەوە، لەگەڵ چەند کەسانیکی هیندی بەشداری نویژ دەکا و چاش دەخواتەوە.

ئەو چیرۆکەم بۆ تۆفیق وەهبی گیرایەوە پیکەنی و گوتی: بەهائەدین نوری بەدینەو نویژلە لەندەن دەکات؟! شیخ نوری باوکی گلەیی لای من لی دەکرد کەوا کەم تەرخەمی لە کاروباری ئاینی دەکات!!

وەك زانراوە مزگەوتی ووکینگ دەگەریتەوە بۆ تیپی ئەحمەدیە ناسراو بە (قادیانیە) کە میرزا غولام ئەحمەدی شاری قادیان سەربە بنجابی هیندی ساڵی ١٨٧٩ دروستی کردووە، وای راگەیاندووە گوایە مهەدی و مەسیح لە شەخسی ئەودا کۆبونەتەوە، راستە مەسیح لە خاچ دراوە، بەڵام بە زیندویی دایان بەزاندوەو حۆریەکانی هینایتیانە کشمیر، لەوی ژیاوە تاکو لە گوندی سرینجار دەمری و دەنیژری.

## سەیفوڵلا خەندان

سەیفوڵلا بەگ خەندان دەچیتەوە سەر خیزانیکی ناسراوی سلیمانی، دایکی لە بنەماڵەی بابانە، عیزەت بەگی باوکی کوری حوسین پاشایە کە وەزیر دەبی لەسەردەمی سوڵتان محەمەد وەحیدەدینی شەشەم، بەڵام سەعید پاشای مامی ناسراو بە (کوردی) لە (اساطین– مەزنە پیاو) ی سەردەمی حەمیدی بووە.

سەیفوڵلا بەگ ساڵی ١٨٩٧ لە ئاستانە هاتۆتە دنیا لە قوتابخانەی (غەڵتەت سەرای) خوێندویەتی ساڵی ١٩٢٣ هاتۆتە عیراق، لە ئایاری ١٩٢٨ بە نوینەری سلیمانی هەڵبژیردراوە، لە کانونی یەکەمی ١٩٣٣ دەبیتە جیکاری شەریکەی کارەبای بەغدای بەریتانی، سەر لە نۆی لە تشرینی دووەمی ١٩٣٠ و شوباتی ١٩٣٣ و کانونی یەکەم ١٩٣٤ و ئابی ١٩٣٥ بە نوینەرایەتی هەڵدەبژیردریتەوە، پاشان دەیکەنە یاریدەدەری

نێردراوی عێراق لە (عصبە الأمم) ئاب ١٩٣٧-١٩٣٨، جارێکی تر لە حوزەیرانی ١٩٣٩ بە نوێنەری سلێمانی هەڵدەبژێردرێتەوە، دەبێتە بەرێوەبەری تەشریفات لە وەزارەتی دەرەوە (١٩٤١)، دوایی دەبێتە قونسڵ لە ئەستەنبۆڵ (تشرینی دووەم ١٩٤١)، پاشان سکرتێری یەکەم لە موفەوەزیەتی عێراق لە واشنتۆن (نیسان ١٩٤٢)، دەگوازرێتەوە بەراوێژکار لەموفەوەزیەتی عێراق لە لەندەن (حوزەیرانی ١٩٤٦). پاشان بە ئەرکی موفەوەزی عێراق لە پاریس هەڵساوە (تشرینی یەکەمی ١٩٤٧). کە مەزاحیم پاچەچی دەبێتە سەرەك وەزیران لە پایەکەی دەخا (١٩٤٨). ئەمەش بە هەلێك دەزانی کەوا خوێندنی باڵای تەواو بکا. بڕوانامەی دکتۆرای لە (علوم سیاسە) لە جامیعەی پاریس ساڵی ١٩٥١ بەدەست هێناوە. باسی دکتۆراکەشی لەسەر (کێشەی قوبرس) دەبێ. پاشان دەیگەرێننەوە سەر فەرمان. دەیکەنە بەرێوەبەری گشتی تەشریفات لە وەزارەتی دەرەوە (کانونی یەکەمی ١٩٤٩). دوایی ئەوە بۆ پلەی وەزیر مفەوەز باڵا دەکری (١٩٥٢). دەبێتە وەزیری مفەوەزی عێراق لە بۆن (ئەیلولی ١٩٥٣). پاشان سەفیر لە مەدرید (تشرینی یەکەمی ١٩٥٦- ئابی ١٩٥٨). لە فەرمان دەستبەرداری دەکەن. دوای ئەوە دەکەوێتە کاروباری ئابووریەوە، لە ئاکامی رووداوی ئۆتۆمبێل خۆی و ژنەکەی لە شاری ڤیێنا ساڵی ١٩٧١ گیانیان لەدەست داوە.

•

### محەمەد عەتا ئەمین

لە سیاسەتمەدارانی لێهاتوو محەمەد عەتا کوڕی محەمەد ئەمین ئەعزەمی لە پانزدەی کانونی یەکەمی ١٨٩٧ لە بەغدا لە دایك بووە. لە سەردەمی عوسمانیەکاندا لە قوتابخانەی سوڵتانیە دەخوێنێ. لەسەر ئەنجامی داگیر کردنی ئینگلیزەکان دەچێتە دەورەی مامۆستایان لە بەرێوەبەرایەتی پەروەردە، دەکری بە مامۆستای خانەی مامۆستایان و قوتابخانەی فەرمانبەران (تشرینی یەکەمی ١٩١٧). پاشان دەگوازرێتەوە بە سکرتێری بەرێوەبەری پەروەردە (١٩١٩). دوایی وەرگێڕ لە بەرێوەبەرایەتی عەدلیە (١٩٢٠). پاشان نووسەر لە دیوانی

پاشایەتیدا (١٩٢١). ئینجا یاریدەدەری سکرتێر لە دیوانی ناوبراودا (١٩٢٢-١٩٢٥). لەو ماوەیەشدا لە خوێندنگای حقوق دەخوێنێ. ساڵی ١٩٢٣ لێی دەرچووە، لە تافی لاویەتییەوە بە ئەدیب و نووسەر ناسراوە، وتار و لێکۆڵینەوە و چیرۆکی لە رۆژنامە و گۆڤارەکانی عێراقیدا بڵاو کردۆتەوە بە تایبەتی لە گۆڤاری (*دار السلام*) و رۆژنامەی (*العراق*). لەوانە (*کیف یرتقی العراق، رؤیا صادقه*) لە (*دار السلام*) بڵاو کراوەتەوە (١٩١٩). *لوحه من الواح الدّهر- دارالاسلام ١٩٢٠ . عاقبة الحیاة- دارالسلام، وقفة علی دیالة- جریدة العراق ١٩٢١* . هەروەها نامەیەکی لەسەر (السلم الدولی العام ١٩٢٣). پاشان وتارەکانی لە گۆڤاری (*حریه*) دا نووسیوە (١٩٢٤- ١٩٢٦).

هەر لە سەرەتای دامەزراندنییەوە دەچێتە فەرمانی دپلۆماسیەتی عێراق دەیکەنە سکرتێری نوێنەری سیاسی عێراق لە لەندەن (٢٧ی حوزەیرانی ١٩٢٥). بە (مدەون) قانونی بۆ وەزارەتی داد دەگوازرێتەوە (١٩٢٧). دوایی دەیگەرێننەوە بە سکرتێر لە موفەوەزیەتی عێراق لە لەندەن (ئازاری ١٩٢٨). پاشان لە ئەنقەرە (ئازاری ١٩٣٠) جازێکیتر لە لەندەن (ئابی ١٩٣٢). لە کۆتایی کانونی یەکەمی ١٩٣٢ لە فەرمانەکانی دەستبەرداری دەکەن.

خوازبێنی ئەمیرە (سارە) کچی حوسێن مەلیکی حیجاز واتا خوشکی ئەمیر زەیدی کردووە. دەیگەرێننەوە دەیکەنە سکرتێری یەکەم لە موفەوەزیەتی عێراق لە رۆما (تشرینی دووەمی ١٩٣٤). ئینجا راوێژکار و کارگێری موفەوەزیەتی عێراق لە لەندەن (١٩٣٥). دەگوازرێتەوە بە راوێژکار و کارگێر لە موفەوەزیەتی پاریسدا (ئازاری ١٩٣٨). دوایی لە بەرلین (ئازاری ١٩٣٩)، جارێکیتر رۆما (تەموزی ١٩٣٩)، دوایی راوێژکاری یەکەم و کارگێری فوفەوەزیەتی عێراق لە لەندەن (حوزەیرانی ١٩٤٠). دەگەرێتەوە بەغدا دەیکەنە بەرێوەبەری گشتی وەزارەتی دەرەوە (تشرینی دووەمی ١٩٣٤). پاشان دەبێتە وەزیری موفەوەز لە ئەنقەرە (ئابی ١٩٤٤). دوایی وەزیری موفەوەز لە پاریس (نیسانی ١٩٤٩). دەستبەردار دەبێ لە کاروبار و فەرمانی دەرەوەدا (تەموزی ١٩٥٢). دەیکەنە

بەڕێوەبەری گشتی لە بەرژەوەندی پاڵاوتنی نەوتی میری. دوایی سەرۆکی ئەنجومەنی بەڕێوەبردنی بەرژەوەندیەکە (ئەیلولی ١٩٥٥) هەتا تەموزی ١٩٥٨. دوایی ئەوە شاری جنێڤ لە سویسرا دەکاتە هەوار و هەر لەوێش لە ٢٥ی ئەیلولی ١٩٧١ کۆچی دوایی دەکات. لە گۆڕستانی ئیمامی ئەعزەم دەنێژرێ.. هەڵبژاردەی چیرۆکەکانی لە کتێبێکدا بە ناوی (قصاصون من العراق) وەزارەتی ڕاگەیاندن ساڵی ١٩٧٧ بلاوی کردۆتەوە.

سامی خوندە پێی ڕاگەیاندم: لە ماوەی جەنگی یەکەمی مەزندا لەگەڵ عەتا ئەمین هاوڕێی دەبن لە قوتابخانەی سوڵتانیە. ئەو محەمەد عەتایە کوڕی محەمەد ئەمین کوڕی حوسێن ئەفەندی پشدەریە. تۆفیق وەهبی دەڵێ: جاری عەتا ئەمین پێی گوتم کەوا بنچینەی بنەماڵەکەی لە عەشیرەتی پشدەری کوردە. عەباس عەزاوی لە کتێبەکەیدا (عشائرالعراق) لە بەشی دووەمدا (العشائرالکردیە) دا دەڵێ: حوسێن ئەفەندی پشدەری باپیری عەتا ئەمینە. ئەمڕۆ عەشیرەتی پشدەر لە بەهێزترین عەشیرەتەکانی کورد دەژمێردری زۆر زانای بلیمەتیان لێ پەیدا بووە لەوانە: حوسێن ئەفەندی کۆچ کردووی ١١ی کانونی یەکەمی ١٩٠٤ لە مامۆستایانی مەدرەسەی ئیمامی ئەعزەم بووە لە بەغدا.

## ئەحمەد تۆفیق

ئەحمەد تۆفیق کوڕی تۆفیق بەگ کوڕی محەمەد ساڵح بەگ کوڕی سلێمان بەگ لە ئەشرافەکانی سلێمانییە. دایکی لە خانەوادەی سەرۆکەکانی پشدەرە. ساڵی ١٨٩٩ لە سلێمانی هاتۆتە جیهان. لە سەر دەستی مامۆستایانی تایبەتی لە موسڵ و کەرکوك و سلێمانی خوێندویەتی. چۆتە خوێندنگای دواناوەندی. کە جەنگە مەزنەکە بەرپا دەبێ تۆفیق بەگی باوکی بە سەرکردەیی عەشیرەتەکانی کورد لە تەك سوپای تورکیدا لە تەورێز و مەهاباد و بۆکان جەنگاوە. لە شەر و پێکدادانی لەگەڵ روسیادا دەکوژرێ. دوای جەنگەکە ئەحمەد بەگ هەڵوێستێکی باشی دەربارەی مانەوەی ویلایەتی موسڵ و سلێمانیشی لەگەڵدا پی نواندووە کەوا بەشێکە لە عێراق و جیا ناکرێتەوە. ساڵی ١٩٢٤ هەڵبژێردرا

به نوێنەری سلێمانی لە ئەنجومەنی دامەزراندندا. پاشان دەبێکەنە پارێزگاری سلێمانی (ئازاری ١٩٢٥). لە نیسانی ١٩٢٧ واز دەهێنێ. جارێکیتر دەیکەنەوە پارێزگاری شارەکە (ئەیلولی ١٩٣٠). بۆ پارێزگاری هەولێر دەگوازرێتەوە (نیسانی ١٩٣٥). پاشان دەبێتە موفەتیشی ئیداری (١٩٣٩). هەر لەم ساڵەدا لە تشرینی دووەم لە فەرمان دەستبەردار دەبێ. بە نوێنەری سلێمانی بۆ پەرلەمان هەڵدەبژێردری (تشرینی یەکەمی ١٩٤٣). بەڵام لە کۆتایی تشرینی دووەمی هەمان ساڵدا واز دەهێنێ. لە ٧ی کانونی یەکەمی ١٩٦٣ لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە.

## عەلی کەمال عەبدوڕەحمان

عەلی کەمال لە ٢٩ی تشرینی یەکەمی ١٩٠٠ لە بنەماڵەیەکی ناسراودا لە سلێمانی هاتۆتە جیهان. عەبدوڕەحمانی باوکی لە ئاکامی پێکرانی بە گوللەیەك گیانی لەدەست داوە. کە ئەوسا عەلی کەمال منداڵێکی ساوای تەمەن دوو ساڵونیو دەبێ. دایکی پەروەردەی دەکا دەیخاتە قوتابخانە. ساڵی ١٩١٤ روو دەکاتە بەغدا. دەچێتە خوێندنگای دواناوەندی سوپایی. دوای دوو ساڵ بەرەو ئاستانە دەروا. دەچێتە قوتابخانەی جەنگی. ساڵی ١٩١٨ بە ملازمی دووەم دەردەچێ. بە مامۆستایەتی قوتابخانەی تازە ئەفسەران لە ناوچەی ئەستەنبول دادەمەزرێ. پێش ئاگربەست بۆ ئەزمیر دەگوازرێتەوە. لە ئایاری ١٩١٩ سوپای یۆنانی ئەو شارە داگیر دەکا. مستەفا کەمال (ئەتاتورك) سەرداری سوپای رزگاری بۆ داکۆکی و بەرگری لە شاری ئەستەنبول رادەپەرێ. عەلی کەمال لە خۆیەوە دەچی بەشداری لە شەری سەربەخۆییبوون دەکا. دوای ئەوە بۆ دیاربەکر و ماردین دەگوازرێتەوە. لە شوباتی ١٩٢٢ دەگەرێتەوە بەغدا. دەچێتە ناو فرمانی پۆلیسی. دەیکەنە معاون لە هەولێر و بۆ کۆیسنجاق دەگوازرێتەوە. ئینجا بۆ دیوانیە (کۆتایی ساڵی ١٩٢٣). لەوی بەشداری لە هەڵمەتی تەمبی کردنی عەشیرەتە یاخیبووەکان دەکا. دوای ئەوە بۆ سلێمانی

دەگوازرێتەوە. پاشان دەیکەنە بەڕێوەبەری پۆلیسی دیالە (نیشانی ١٩٣١)، دوایی هی بەغدا (حوزەیرانی ١٩٣٢)، ئینجا کەرکوك (کانونی دووەمی ١٩٣٤)، پاشان دەگوازرێتەوە بۆ بەڕێوەبەری پۆلیسی بادیەی باشور. دوایی پشتگیری کردنی بزوتنەوەکانی سوپا بۆ ئاسایی کردنەوەی شاری (*سوق الشیوخ*) پی دەسپێرن. هەر لەو قەزایەشدا دەیکەنە قایمقام (١٩٣٥). زۆری پی ناچی واز لە بەڕێوەبەرایەتی دێنێ. لە ئابی ١٩٣٥ بە نوێنەری سلێمانی هەڵدەبژێردرێ. دووبارە هەر لەم شارەدا لە حوزەیرانی ١٩٤٨ هەڵدەبژێردرێتەوە. لە هەمان کاتدا خۆی خەریکی کاروباری ئابوری کردووە. بەشداری لە هەموو هەوڵ و کارێکی خێرخوازیدا کردووە. خوێندکارە ئایینیەکانی لەسەر کیسەی خۆی بۆ خوێندن دەنارد بۆ ئەزهەر لە میسر، چاودێری و یارمەتی مزگەوت و هەتیوخانە و بنکە تەندروستیەکانی دەکرد. دوای شۆڕشی چواردەی تەموزی ١٩٥٨ ماوەیەك دەگیری و بەندی دەکەن. پاش ئەوە روو دەکاتە لەندەن و لێی نیشتەجی دەبێ[٥١].

## سەعید بەگ میری شێخان

سەرۆکی یەزیدیەکان سەعید بەگ ناسراو بە ئەمیری شێخان، نیشتەجێکەی لە باعوزری نزیك مەزاری شێخ عەدیە، ئەو کوڕی عەلی بەگ کوڕی حوسێن بەگ کوڕی عەلی بەگی گەورە کوڕی حەسەن بەگە، بنەچەکەی دەگەڕێتەووە بۆ عودەی کوڕی سەخر (ئەو کوڕی برای عودەی کوڕی موسافیر هەکاریەکە ساڵی ١١٦٢ کۆچی دوایی کردووە) لە شێخەکانی تەسەوف بووە، باپیری ئەو بنەماڵەیە عەلی بەگی گەورە بەناوبانگ بوو، ساڵی

51– من ئەو کاتە لە لەندەن بووم کە عەلی کەمال لە یەکی ئابی ١٩٩٨ لە لەندەن کۆچی دوایی کرد. تەرمەکەیان بردەوە کوردستان لە سلێمانی بەخاك سپێردرا. حکومەتی هەرێمی کوردستان لە سلێمانی زۆر بە شکۆمەندیەوە لە چلەیدا کۆڕی ماتەمینیان بۆ بەست. "وەگێر"

١٨٣٢ لە زارگەلی نزیك رەواندوز دەکوژری و هەر بەناوی ئەویش ناونراوە (گەلی عەلی بەگ).

سەعید بەگ سالی ١٩٠١ لە دایك بووە، باوکی سالی ١٩١٣ لە زارگەلی دەکوژرێ، دایکی میان خاتون کچی عەبدی بەگ جلەوی کاروبار دەگرێتە دەست، ژنێکی ژیرو مشورگێڕ بووە، لە سەردەمی داگیرکردنی ئینگلیزدا سەعید بەگ لە تەمەنێکی هەرزەکاری دا دەبێ، بە ئەرکی سەرۆکایەتی هەڵدەستێ، سالی ١٩٢١ ئامادەی ئاهەنگی دانانی مەلیك فەیسەلێ لەسەر عەرش دەبێ لە بەغدا. پاشان لە سەرۆکایەتیەکەیدا ئیسماعیل بەگ کوڕی عەبدی بەگی ئامۆزای کێشەی لەگەڵدا بووە دوایی پێکهاتونەتەوە، سەعید بەگ ئایاری ١٩٤١ لایەنگری رەشید عالی دەبێ داوا لە کۆمەڵەکەی دەکا بچنە ناولەشکری عێراق و بەگژداچوونی ئینگلیز.

سەعید بەگ سالی ١٩٤٢ کۆچی دوایی دەکا. تەحسین بەگی کوڕی کە ئەوسا منداڵ دەبێ جێگای لە ئیمارەتەکەدا دەگرێتەوە. سالی ١٩٣٠ هاتۆتە دنیا. دووبارە خاتومیان نەنکی دەگەرێتەوە سەر هەڵسوڕانی کاروباری هۆزەکەی، هەتا تەحسین بەگ پی دەگا.

پاش شۆڕشی چواردەی تەموزی ١٩٥٨ سەرۆکایەتیەکە دەدرێتە معاویەی ئەمەوی کوڕی ئیسماعیل بەگ کە پێشتر باسمان کرد. پاشان بۆ بایەزیدی برای. کە بایەزیدی سەرۆکی ئیسماعیلیەکان سالی ١٩٨١ دەمرێ، نیاز دێتە سەر ئەوەی کە داوا لە تەحسین بەگ بکری سەرلەنوی کاروباری ئیمارەتەکە بگرێتەوە دەست، کە ماوەیەکی زۆر نیشتەجێی لەندەن بووە. هەروەها لە سەرداره ناسراوەکانیتریان لەم سەردەمەدا: شێخ ئیلیاس سەرەك عەشیرەتی هەکاری کوڕی شێخ خدر کوڕی حەسەنە. عەباس عەزاوی لە کتێبەکەیدا (تاریخ الیزیدیة) – ١٩٣٥، باسی دەکا دەڵێ: زۆرترین زانیاریەکانی لە ئەو وەرگرتووە– واتا شێخ ئیلیاس– خوێندن و نووسین هەر لە چوارچێوەی بنەماڵەکەی ئەودا بەندە گیرە.

مستەفا عەلی (وەزیری داد لە سەردەمی عەبدولکەریم قاسمدا) پێی راگەیاندم: کەوا شێخ ئیلیاسی ناسیوە چاوی پێ کەوتووە دەڵێ: پیاوێکی ئاسۆ فراوان و ئارەزوومەندی رۆشنبیر بوونی هۆزەکەی بووە. حەزی بە تێکەڵی و پەیوەندارییەتی لەگەڵ میللەتەکانیتردا کردووە. بەڵام ئیسماعیل بەگ کوڕی عوبێد بەگ کە کێشەی لەگەڵ سەعید بەگی ئامۆزای لە سەرۆکایەتیدا هەبوو دوای داگیرکردنی بەغدا پەیوەندی بە سوپای ئینگلیزەوە دەکا کە ئەوسا لە نزیك سامەرا هەڵیان دابوو، ئەشکەنجە و داپڵۆسینی تورکەکانی پێ رادەگەیەنێ. داوای یارمەتییان بۆ نەتەوەکەی لێ دەکا. زانیارییەکی فرەدیاردەی بنچینەکەیان دەداتە دکتۆر قوستەنتین کە پشتی بۆ دانانی کتێبەکەی پێ بەستووە (الیزیدیة قدیما و حدیثا) داوا لە ئیسماعیل بەگ دەکری لە بەغدا نیشتەجێ بێ پاشان لە موسڵ. دوایی رێی پێ دەدری بچێتە سنجار، لە تەموزی ١٩٣٣ جیهان بەجێ دێڵێ.

یەزیدییەکان لە مێژوویاندا دووچاری مەینەتییەکی گەورە بوون لە سەر دەستی عومەر وەهبی پاشا سەرکردەی هێزی چاکسازی تورکی، کە ساڵی ١٨٩٢ دێتە موسڵ داوا لە پیاوەکانیان دەکا لە سەروی هەموویانەوە میرەکەیان میرزا بەگ کە دەبێ واز لە بیروباوەری خۆیان بێنن. بگەڕێنەوە سەر ئایینی ئیسلام. ئیتر بەربادیان دەکا. سەربازەکانی دەنێرێتە سەر گوندەکانی شێخان تاڵانی دەکەن ئەوەی پیاوە دەیکوژن و پرکێشی ئافرەت و منداڵەکانیان دەکەن. دوای ئەوە روو دەکەنە گوندەکانی سنجار، هەمان رەفتار لەگەڵ ئەوانیشدا دووبارە دەکەنەوە. شکات و سکاڵای ئەو کارە دڕندانەیە دەگاتە ئەستەنبول وڵاتانی بێگانە دێنە دەنگ، فەریق وەهبی پاشا لێ دەخەن.

میسس کرترۆدبێڵ لە ساڵی ١٩٠٩ سەردانی ناوچەکانی کوردستان دەکات. چاوی بە عەلی بەگ ئەمیری یەزیدییەکان دەکەوێ. قاوەی لا دەخواتەوە. پێی دەڵێ: کۆمەڵەکەت لە چیا پێیان راگەیاندم کەوا تۆ (حاکمی گشتیانی) زۆر بە ناسکی وەڵامی دەداتەوە دەڵی (حاکمی هەموومان هەر ئەو خودایەیە) باسی دەکا کە: پیاوێکە لە رەوەراستی تەمەن دایە.

سەروسیما و روخسار هێمن و لەسەرخۆ. ردنێنێکی درێژی خەنەیی پێچپێچی هەتا کەمەری شۆڕبۆوە. جلوبەرگێکی سپی پۆشیبوو. لەسەریەوە هەتا دامێنی هاتبوو.

## غیاسەددین نەقشبەندی

شێخ غیاسەددین کوڕی هەرە گەورەی شێخ بەهائەدین نەقشبەندی کوڕی محەمەد کوڕی تاهیر کوڕی مەلا مورشید و رابەری ئامێدی و بامەرنی و دەوروبەرەکەیەتی. شێخ غیاسەددین ساڵی ۱۹۰۰ هاتۆتە دنیا. رێبازی سۆفیەتی لە باوکی وەدەگرێ. لەسەر دەستی زاناکانی ناوچەکەیدا وەك: موفتی ئامێدی و شوکری ئەفەندی دەخوێنێ.

لە تشرینی دووەمی ۱۹۳۰ بە نوێنەری موسڵ هەڵدەبژێردرێ. دوای ئەوە لە ئابی ۱۹۳۵، کانونی یەکەمی ۱۹۳۷ و تشرینی یەکەمی ۱۹٤۲ هەڵدەبژێردرێتەوە. لە ساڵی ۱۹٤٤ لە ئامێدی کۆچی دوایی دەکات.

موسڵیحەددین نەقشبەندی برای، ناودار بوو. ساڵی ۱۹۲۰ لە ئامێدی هاتۆتە دنیا. لە کۆلێژی یاسا دەرچووە (۱۹٤۳). دەچێتە کاروباری دادوەری. دەیکەنە نائیب حاکم دوایی دەبێتە حاکم. لە ساڵی ۱۹۵۳ بە نوێنەری موسڵ هەڵدەبژێردرێ. سەرلەنوی ۱۹۵٤ و نیسانی ۱۹۵۸ هەڵدەبژێردرێتەوە

دەگەڕێتەوە سەر کاری دادوەری. دەبێتە حاکمی بەدائەی کەرادە. موسڵح نەقشبەندی لە وەزارەتی تاهیر یەحیا دەبێتە وەزیری دەوڵەت بۆ کاروباری ئەوقاف (۲۰ی تشرینی دووەمی ۱۹٦۳). دوایی وەزیری ئەوقاف (یەکی نیسانی ۱۹٦٤). سەرەرای پایەکەی دووبارە دەیکەنە وەزیری دەوڵەت (۱۱ی کانونی یەکەمی ۱۹٦۵). جێکاری وەزیری پیشەسازی (۱۷ی نیسانی ۱۹٦٦- ۱۸ی نیسانی ۱۹٦٦). جارێکیتر وەزارەتی دادی پێ دەدرێتەوە (۹ی ئابی ۱۹٦٦). بە ئەرکی خۆی لە وەزارەتەکانی یەك لە دوای یەك هەڵساوە هەتا ۳۰ی تەموزی ۱۹٦۸. لە ساڵی ۱۹۹٦ لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە.

## ئەحمەد موختار بابان

ئەحمەد بەگ کوڕی حەسەن بەگە دایکی لە بنەماڵەی بابانە. ساڵی ١٩٠٠ لە بەغدا هاتۆتە دنیا. بڕوانامەی یاسای بەدەست هێناوە. خزمەتگوزاری لە پیشەی دادوەری و بەڕێوەبەرایەتیدا کردووە. ساڵی ١٩٤٢ بووەتە وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتی، پاشان بە پایەی وەزیرایەتی مواسەلات و ئەشغال، وەزیری داد، سەرەك دیوانی پادشایی، جێگری سەرەك وەزیرانی پێ دراوە. دوای ئەوەی کە دەبێتە وەزیری بەرگری و بریکاری وەزیری پەروەردە لە ١٩ی ئایاری ١٩٥٨. دەبێتە سەرەك وەزیران کەوا دوا سەرەك وەزیران بووە لە پێش بەرپا بوونی شۆڕشی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨. لە ٢٤ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٧٦ لە بۆن پایتەختی ئەڵمانیای یەکگرتوو کۆچی دوایی دەکات.

## محەمەد سەعید قەزاز



محەمەد سەعید قەزاز ساڵی ١٩٠٤ لە سلێمانی هاتۆتە جیهان، منداڵێکی ساوا دەبێ کە باوکی کۆچی دوایی دەکات، لە خوێندنگەی دواناوەندی ساڵی ١٩١٧ دەرچووە، لە ٢٠ تەموزی ١٩٢٤ بە نوسەر (کاتب) لە بەشی پشکنینەری بەڕێوەبەرایەتی وەزارەتی ناوخۆ دادەمەزرێ. پاشان بوەتە بەڕێوەبەری (تەحریرات) لە پارێزگای هەولێر (١٩٣٢)، دوایی لە کەرکوك. دەیکەنە

مودیر ناحیەی تکریت (١٩٣٩)، دوای ئەوە پێبەپێ پلەو پایەی بەڕێوەبەرایەتییەکانی بینیوە، مودیر ناحیەی شەقلاوە (١٩٣٥)، قایمقامی هەڵەبجە (١٩٣٨)، دوایی زاخۆ (١٩٣٩)، لە تەموزی ١٩٤١ بوەتە یاریدەدەری بەڕێوبەری گشتی ناوخۆ، پاشان پارێزگاری لیوای هەولێر (ئەیلول ١٩٤٤)، پاشان پشکنینەری بەڕێوەبەرایەتی (١٩٤٦)، دوایی پارێزگاری لیوای کوت (ئەیلول ١٩٤٦) ئینجا کەرکوك (کانونی دووەم ١٩٤٨)، دوایی موسڵ (حوزەیران ١٩٤٦)، پاشان وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی پی دەسپێرن (٢١ کانونی یەکەم ١٩٥٢-٢٩ کانونی دووەم ١٩٥٣)، دوای ئەوە دەنێتە بەڕێوەبەری گشتی بەندەرەکان لە بەسرە (١٥ شوبات ١٩٥٣) بەڵام لە شەشی نیسان ١٩٥٣ واز دەهێنی، دیسان دەیکەنەوە بەڕێوەبەری گشتی بەندەرەکان (حوزەیران ١٩٥٣)، دوایی وەزیری ناوخۆ (١٩ی ئەیلول ١٩٥٣) پایەکەی خۆی لە وەزارەتی فازڵ جەمالیدا پاراستوە (٨ی ئازار ١٩٥٤)، هەروەها لە وەزارەتی دووەمی ئەرشەد عومەری (٢٩ی نیسانی ١٩٥٤-١٤ی حوزەیرانی ١٩٥٤)، خۆی دەست بەردار دەکا. بە نوێنەری کەرکوك هەڵدەبژێردری (تشرینی یەکەم ١٩٥٣)، سلێمانی (ئەیلول ١٩٥٤) و (نیسانی ١٩٥٨). لە وەزارەتی دوزادەمینی نوری سەعید دا دەیکەنە وەزیری ناوخۆ (٣ی ئاب ١٩٥٤) لە پایەکەی خۆی لەوەزارەتی سێزدەمی نوری سەعیدا دەمێنێتەوە (١٧ کانونی یەکەم ١٩٥٥-٢٠ حوزەیرانی ١٩٥٧)، دیسان بە وەزارەتی چواردەمینی نوری سەعید بە وەزیری ناوخۆ دەگەڕێتەوە (٣ی ئازاری ١٩٥٨)، هەروەها لە وەزارەتی ئەحمەد موختار باباندا (١٩ی ئایار ١٩٥٨) هەتا (١٤ی تەموز ١٩٥٨)، لە ڕۆژی شۆڕشەکەدا دەگیری "مەحکەمەی شەعب" حوکمی خنکانی بەسەردا دەدا (٤ی شوبات ١٩٥٩) حوکمەکەیان سەر لە بەیانی ٢٠ ئەیلولی ١٩٥٩ لە بەغدا بەجی هێناو لە سێدارە درا[٥٢].

---

[52]- جەمیل غەریس بەڕێوەبەر و خاوەنی (گۆڤاری ئەلتەحریر) لە بەیروت پارچە شیعرێکی ناسکی پڕستایشی لەسەر سەعید قەزاز بڵاو کردۆتەوە کە بەم شێوەیە دەست پی دەکات:

سەعید قەزاز بەرێوەبەرێکی ئازاو نەبەرد بوو، ترس لە دڵیدا نەبوو، سەربوردەی خۆبەختکەری ڵی دەگێڕنەوە کەوا بە دەستی خۆی چەتەو تاوانباری لە چیاکانی کوردستان بەردەست کردووە. دژی کۆمۆنیست بوو. وای بۆ چووبوو کەوا ئەو بیروبڕوایە بیروبڕوایەکی تێکدەر و روخێنەرە کە وڵاتانی ساوای تازە پێگەیشتووی وەك هەرێمی عێراق وێران دەکات. کاتی لافاوەکەی ساڵی ١٩٥٤ کە چواردەورەی بەغدای بەسەر ئاو خستبوو، مەترسی ژێر ئاوبوونی لی دەکرا. لە شەوێکی توش و پشێویدا دوای ئەوەی پرد و بەربەستەکان رمان ئاو چووە ناو چواردەورەی گەرەکی سەعدون. وەزیر و لێپرسراوی ئاودێری کۆبوونەوە. زۆرترینان چۆڵکردنی بەرەی رەسافەیان پەسند کرد کە دووچاری هەڵچوونی دیجلەیە، بەڵام سەعید قەزاز دەڵێ: چۆن بەری رۆژئاوا چۆڵ دەکەن، کە لە دوو پردی زیاتر نیە بە کەرخیانەوە ببەستێ. دەبێتە هەرا و پەشۆکاوێك کەس بە کەس نابێ. هەر خەڵکە و دەکەوێتە ژێر پێوە و هەر ئۆتۆمبیلە و پێك دەکەوێ. فرمانی دا لە کۆمپانیا خاوەنپڕۆژە زلەکان کە دەستبەجێ ٢٢ ئۆتۆمبیل و ئامێری قورس و ئامرازە بەرزکەرەوەکانیان بێنن پرد و بەربەستەکان توند و چاك بکەنەوە. بە هۆی دانایی و هیمەتی ئەو پیاوە مەردەوە بەغدا لە ژێرئاوبوون و خنکان رزگاری بوو. سێر همفری تریفلیان باڵیۆزی بەریتانی دوای شۆڕشی چواردەی تەموز لە کتێبەکەیدا "الشرق الاوسط في غمار الثورة" دەڵێ: شیوعیەکان رقیان لە سەعید قەزاز دەبۆوە و لێی دەترسان. لای هەموو کەسێکیش رێزدار بووە، دەڵێ: بەرانبەر جنێودان و ریسواکردنی پڕهەرای دادگای مەهداوی بە شێوەیەکی خۆڕاگر و هێمن چاونەترس و ئازا راوەستا[53].

---

*لك اسم مثل السيف نافذ يا وزير و الوفاء و الجود حافض لك عهود* (وەرگێڕ)

[53]- محەممەد سەعید کوڕی میرزا مەجید کوڕی حاجی ئەحمەدی قەزازە. ساڵی ١٩٠٣ لە گەرەکی گۆیژە لە سلێمانی هاتۆتە دنیا، کە باوکی کۆچی دوایی دەکات لە ژێر سایەی حاجی ئەحمەدی باپیری و دوای ئەو لە لای مامی پێدەگات. هاوسەرەکەی سەعید قەزاز "زەکیە خان" کچی تۆفیق قەزازی مامی بوو.

## سەعید قەزاز لە مەحکەمەی شەعبدا

لە ٢٩ی کانونی دووەمی ١٩٥٩ بەرانبەر مەحکەمەی شەعب بە سەرۆکایەتی عەقید فازل مەهداوی راوەستا کەوتە داکۆکی و بەرگری لە خودی خۆیدا، کۆتایی پێ هێنا و گوتی: من ئێستا راوەستاوم، وا دەبینم مردنم لێ نزیك بۆتەوە، سێدارە نامترسێنێ. کاتی لێی بە سەر دەکەوم زۆر کەسان لە ژێر پێمەوە دەبینم کەوا شایستەی ژیان نین. بە ئاشکرا رای دەگەیەنم کە من بەو کردەوە و خزمەتگوزاریانە دەنازم کە پێشکەشی نیشتمانی خۆشەویستم کردووە، شانازی دەکەم کە قەلاچۆی شیوعیەتم لە پێناو موسڵمانیەتی و نیشتیمانەکەمدا کردووە. بەوە دەنازم وەزیرێکی کارامە بووم رەفتار و کردەوەم ئەنجامداوە. بە وەحی لە خواوە و بەو عەقڵ و هۆشە و ئەو دڵەی لە سینەمدایە بەدکاری شیوعی جیهانی و مەترسی لەسەر نیشتیمانی ئازیزم راگەیاندووە، بۆیە کۆتایی بە بەرگری لە خۆکردنم دێنم کەوا داوای بەخشین و بەزەیی لە هیچ ئادەمیزادێك ناکەم. بەڵکو خۆم دەخەمە بەر دەستی خودا. ئارام دەگرم تا یەزدان حوکمی خۆی دەدا، کە ئەو چاکترین حاکمە[54].

---

ساڵی ١٩٨٣ کۆچی دوایی کردووە. تاقە کچێکی بە ناوی "پەری " لە دوا بەجی ماوە. چەندین جار لە لەندەن دیدارم لەگەڵدا کردووە. ئافرەتێکی خاتون و هۆشمەند و لێوەشاوەیە. هاوسەرەکەی دکتۆر کەماڵ عەبدوڵلا ناجییە. کچێك و دوو کوڕی بڕوانامەیان هەیە. "وەگێڕ"

54– ئەگەرچی سەعید قەزاز بە بڕوا و لەخۆبوردوییەوە خۆی دا بە دەستەوە. عەبدولکەریم قاسم سەرکردەی شۆڕشی ١٩٥٨ و سەرەك وەزیران بەڵێنی بە هەندێك کەسایەتی کوردیش دا کەوا حوکمە بەسەر دادراوەکەی سەعید قەزاز بەجێ نەهێنێ. کەچی لە ٢٠ی ئەیلولی ١٩٥٩ لە سێدارە درا. دلێرانە خۆی لەبەر سام و ترس و وێشومەی مەرگ راگرت. ئەحمەد جەمال جیاووك لە رۆژنامەی خەبات بە عەرەبی لە بارەی دوا ساتی ژیانی سەعید قەزاز لە بەندیخانەدا نووسیویەتی کە ئەویش لە کابرایەکی عەرەبی گوێی لێ بووە کە لەو کاتەدا لە بەندیخانەکە دەبی دەڵێ: پیاوی وا قارەمان وەك سەعید قەزاز کەم

هەڵدەکەوێ. بەهجەت عەتیە بەڕێوەبەری ئاسایشی ئەوسا کە لەبەر جەلادەکەی دەپاڕێتەوە کەوا هەندێك دوایبخا و بیکاتە دوا لیستەی لەسێدارە دراوەکان. سەعید قەزاز کە لە تەنیشتی دەبی خۆی لی توڕە دەکا دەڵێ: حەڤتا سالی تەمەنت بەری کورد بێزار نەبووی. چەند ساتێك لە دواخستنی بەجێهێنانەکە چ سوودێك دەگەیەنێ کە تۆ لەو بار و هەڵوێستە بی. پاشان سەعید قەزاز لە جەلادەکەی رادەخوڕێت و دەڵێ: وەرە، من ئامادەم حوکمەکە بەجی بێنە. نامەوێ لەم مەینەتەدا بمێنمەوە پێم باشترە بە پەتی سێدارەوە هەڵواسرێم کەسانێك ژێر پێم دەبینم کە شایستەی ژیان نین.

عیدۆ باب شێخ – وتارێکی بە عەرەبی لە رۆژنامەی ئیتحاد ژمارە ١٥٥ شەممە ٢٨ی تشرینی یەکەم سالی ١٩٩٥ بلاو کردۆتەوە. ئێمەش تەنیا بەشێکمان لی وەرگێڕایە سەر زمانی کوردی دەڵی : لە مێژووی تازە دامەزراوی حکومەتی عێراقی گەلی کەسایەتی کورد پەیدا بوون کە وا بەو پەری دڵسۆزی و خۆبەختییەوە لە بواری خۆیاندا خزمەتیان کردووە. لەوانەی کە لە بەڕێوە بەرایەتیدا ناودار بوون ئوستاد سەعید قەزاز بوو، کە وا پی بە پی لە پلە و پایەکانی تێهەڵچووە تا ئەوەی بە هۆێ زیرەکی و دەست پاکی و لی هاتوویی خۆی گەیشتە پایەی وەزیری ناوخۆ بەراستی نمونەیەك بوو لە بەڕێوە بەریکی سەرکەوتوو : بەش بە حاڵ گەلی چیرۆك و بەسەرهاتم لەوانەی کە لە ژێر دەستیا کارمەند بوون گوی لی بووە، سەراپا هەمووش ئازایەتی و دڵسۆزی لە کار و رەفتاردا دەگەیەنن. پێکەوتن و ئاگاداربوونی لە کاروباری بەڕێوەبەرایەتی و فەرمانبەر و پێداویستی خەڵك و شێوەی بەڕێوەچوون لەو پەری ولاتدا.

سەرەرای دڵسۆزی بۆ پایە و پیشە و فرمانەکەی خۆی گەلی هەڵوێستی نەتەوەیی و نیشتمان پەروەری نواندووە. چەندین کەسایەتی و سیاسەتمەداری کوردی لە تەنگ و چەڵمەی ترسناك رزگار کردووە. ئەگەرچی دەشیزانی بە کاری سیاسی ئەوتۆ هەڵساون کەوا بە پێی یاسا و بڕیاری دەوڵەت قەدەغە و تاوانە لە کاتێکا خۆشی وەزیر و بەرپرسیارە. هەوڵێکی زۆری داوە کە مودیر ناحیە و قایمقام و ئەفسەری کورد دابمەزرێنی و هانیدەدان کەوا بۆ گەل و نیشتمانەکەیان دڵسۆز بن. وا دیارە ئەو هەموو هەڵوێستە نەتەوەیی و نیشتمانپەروەرییەی جگە لە سەر راستی و جگەرسۆزی بۆ کار و فرمانەکەیا هیچیان لە کاتی بەرپا بوونی شۆڕشی "١٤ی تەموزی ١٩٥٨" دادی نەدا. تەنانەت حوکمەکەشی سوك نەکرا و لە کاتیکا زۆربەی پیاوانی کاربەدەستانی سەردەمی پاشایەتی بەرامبەر مەحکەمەی شەعب وەستان، کەچی بەشی خوالێخۆشبوو سەعید قەزاز لەسێدارەدان بوو. هیچ حیزبێکی ئەوسا تەنانەت هیچ کەسێك نەهات بەرگری لی بکات. هەندێك راستی و حەقیقەتی شەرەف مەندی دەربخەن، بەڵکو هەموو بێدەنگ بوون.

ئەوەش لە ترسی ئەوەی نەبادا لە لایەن جەماوەرەوە تاوانبار بکرێن کە گۆیا بەرگری کردنە لە ئیمپریالیزم و کلکەکانی بە پێی باوبوونی زاراوەی ئەوسا، ئیتر سەعید قەزاز بە مەردی و دلێری رووبەرووی مردن بۆوە و لە کاتی بە سەرکەوتنی سێدارەدا، گوتوویەتی "خەڵکانی ئەوتۆ لە ژێر پێمەوە دەبینم کە شایستەی ژیان نین". من مەبەستم لە نووسینی ئەو پێشەکیە بەرگری کردن نیە لە شکۆداری کەسایەتیی قەزاز، مێژوو کەفیلی ئەوەیە، بەڵام دەمەوی بڵێم کە چەندین پاڵەوان بە سەرگەرمی بەشداری لەناوبردنی کورد و هەڵمەتی ئەنفال و وێرانکردنی گوندەکان و ئەشکەنجەدانی تێکۆشەران و دابەزاندنی نەفسیەتیان کردووە و هەرگیز رۆژی لە رۆژان بەقەد تۆزقاڵێك بیریان لە خزمەتی کورد نەکردۆتەوە، هەروەك خوالێخۆشبوو سەعید قەزاز کردویەتی. کەچی لەگەڵ ئەوەشا سەرکردەکانی شۆڕشی کورد بە هۆی بیرجۆشی سۆزیانەوە تا ئەوەی چاولێکەری شۆڕشی تەموزیشیان نەکرد بەڵکو لێبووردنی گشتیان بۆ ئەو قارەمانانە دەرکرد، بەوەش نەوەستان بەڵکو خەلات و بەراتیشیان پێ بەخشین و بەخۆیانەوە گرتن.

بەش بە حاڵی خۆم لە مەحکەمەی سەعید قەزاز ئامادە بووم (١٩٥٩) بۆ یەکەمجار بوو ئەو پیاوە کوردە ناودارەم دیت. پیاوێکی سەر سپی، باڵا بەرزی سەروسیما کۆك و لێوەشاوەم هاتە بە چاو کە هێنایان بە هێمنی لە ناو قەفەسی ئاسنینی مەحکەمەکە راوەستا، بە چ بارێك پەشۆکاوی و ترسی لی بەدی نەدەکرا. ئینجا داوا کاری گشتی عەقید روکن ماجید محەمەد لائیحەی تۆمەت و برگە و بەندەکانی تاوانبار بوونی دەست پێکرد، ئەوەی جێگای سەرنجراکێشەر بوو کە نەیتوانی چ تاوانێکی ئەوتۆ بخاتە پاڵی جگە لەوەی کە وەزیر بووە و دژ بە چەپڕەوی کۆمۆنیست بووە. جەلسەی دووەم سەر لە بەیانی پارێزەرەکەی کە مەحکەمەکە بۆی دیاری کردبو هەڵسا کەوتە بەرگری لێکردنی، ( من لە پشتیەوە دانیشتبووم ) تەنیا ئەوەم لە یاد ماوە کە سەرەتاکەی بەم رستەیە دەستی پێکرد (لندع التاریخ یتکلم قلیلا) لە کۆتاییشدا گوتی "*<u>هذا هو المتهم واقفا امام ارادة الشعب خاضعا خاشعا ینتظر عطفکم و عفوکم عما جناه</u>*". سەعید قەزاز تێوەی رامابوو وەك زوبانی حاڵی بەم وتانەی قایل نەبووبێ. یەك لەو شەهیدانەی هێنایان فەرمانبەرێکی پێشوو بوو. هەندێك لایەنی دەستپاکی و رەفتاری چاکی سەعید قەزازی باس کرد کە ئەوەش پێچەوانەی مەبەستیان بوو، شاهیدێکی تر "دیوالی ئاغا" بوو کە بەهۆی دەستدرێژی بە تالانکردنی هەندێك گوندی هۆزی رکابەری هەڵسابوو. لە کاتێکا سەعید قەزاز "متصرف"ی موسڵ بوو (ئێمەش خوێندکاری خانەی مامۆستایان بووین). سەعید قەزاز خۆی هاتە دهۆك لە سەرا بەدوای دیوالی ئاغای دا نارد و یەکسەر فەرمانی گرتنی دا و بە دەستبەسەری حەپسی ناردی بۆ مووسڵ (وەرگێر).

## عەلی حەیدەر سلێمان

دەچێتەوە سەر بنەماڵەیەکی کوردی ناسراو کە فەرمانڕەواییان لە ناوچەی سۆراندا کردووە. هەتا سەردەمی محەمەد پاشای (کۆرە) ی ڕەواندوزی کوژراوی ساڵی ١٨٣٦. عەلی حەیدەر سلێمان ساڵی ١٩٠٥ لە ڕەواندوز لە لیوای هەولێر هاتۆتە جیهان. لە موسڵ خوێندویەتی دوایی نێردراوەتە بەیروت بۆ تەواو کردنی خوێندنی لە جامیعەی ئەمریکی (١٩٢٦). ساڵی (١٩٣٠) لێی دەرچووە بڕوانامەی بە کەلۆریۆسی لە علومی سیاسی بەدەست هێناوە، بە مامۆستایەتی دادەمەزرێ. پاشان پشکنێنەر لە وەزارەتی (مەعاریف)، کتێبی "مێژووی شارستانیەتی ئەوروپا" (١٩٢٣) و "مێژووی ئەوروپای نوی "ی داناوە (١٩٣٧). دەگوازرێتەوە بە (ملاحظ) لە نوسینگەی تایبەتی وەزارەتی ناوخۆ (١٩٣٣). دوایی یاریدەدەری بەرێوەبەری گشتی ناوخۆ (١٩٣٥). پاش ئەوە کارمەند دەبێ لە فەرمانی دەرەوە، سکرتێری سێیەمی مفەوەزیەتی عێراق لە رۆما (١٩٣٧). بۆ مفەوەزیەتی قاهیرە دەگوازرێتەوە. پاشان لە فەرمانەکەی دەستبەردار دەکەن و دەگیری (تشرینی دووەمی ١٩٤١). کە بەری دەدەن دەکەوێتە کاری سەربەخۆ، ساڵی ١٩٤٨ بە نوێنەری ڕەواندوز هەڵدەبژێردرێ، بەڵام لە ئازاری ١٩٥٠ واز دەهێنێ. دەیکەنە وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتی (١٩ی ئابی ١٩٤٨) و بریکاری وەزیری ئابوری (یەکی کانونی یەکەمی ١٩٤٨- ٦ی کانونی دووەمی ١٩٤٩). پاشان بە وەزیری ئەشغال و مواسەڵات دامەزراوە (١٠ی کانونی یەکەمی ١٩٤٩- ٥ی شوباتی ١٩٥٠). سەرلەنوی بە نوێنەری ڕەواندوز هەڵدەبژێردرێتەوە (کانونی دووەمی ١٩٥٣) و لە (حوزەیرانی ١٩٥٤) دەبێتە وەزیری ئاوەدان کردنەوە (اعمار) (١٧ی ئەیلولی ١٩٥٣). دوایی وەزیری ئابوری (٨ی ئازاری ١٩٥٤) و جێکاری وەزارەتی ئاوەدان کردنەوەشیان پی سپاردووە (١٤ی نیسانی

١٩٥٤- ٢٩ی نیسانی ١٩٥٤). پاشان دادەمەزری بە باڵیۆز لە وەزارەتی دەرەوە (تەموزی ١٩٥٦). بە سەفیرایەتی عێراق دەنێردرێتە بۆن (تشرینی یەکەمی ١٩٥٦). لە هەمان کاتدا دەیکەنە وەزیری مفەوەز لە هۆڵندە (١٩٥٧). دیسان دەیکەنە سەفیر لە وەزارەتی دەرەوە (تشرینی دووەمی ١٩٥٨). بە جێگری وەزیری دەرەوە دادەمەزری (شوباتی ١٩٥٩). پاشان دەیکەنە باڵیۆز لە واشنتۆن (ئازاری ١٩٥٩). لە تەموزی ١٩٦٢ بە سەفیرایەتی لە دیوانی وەزارەت دەگەرێتەوە بەغدا. دیسان دەیکەنە سەفیر لە واشنتۆن (ئەیلولی ١٩٦٤). ئینجا سەفیر لە برن (تەموزی ١٩٦٤) دوایی سەفیر لە رۆما (تەموزی ١٩٦٦). لە ئازاری ١٩٦٨ خانەنشین دەکرێ[55].

## محەمەد سدیق تەها

محەمەد سدیق کوڕی تەها کوڕی محەمەد کوڕی عەبدوڵلای کوڕی سەید تەهای نەهری گەیلانیە. سەید تەهای باپیرە گەورەی لە نەوەی عەبدولعەزیز کوڕی شێخ عەبدولقادری گەیلانیە و لە رابەرانی رێبازی قادریە. لە تشرینی یەکەمی ١٩٤٣ هەتا تشرینی دووەمی ١٩٤٦ بە نوێنەری هەولێر هەڵبژاردراوە. نزیکەی ساڵی ١٩٧٠ کۆچی دوایی کردووە.

## قاسم حەسەن

پارێزەر و نووسەری سیاسەتمەدار قاسم حەسەن بنەماڵەکەی لە دایکیەوە کوردی کەرکوکە. باوکی ئەفسەرێکی لەشکری تورکی بووە. ساڵی ١٩١٠ لە بەغدا هاتۆتە جیهان. لە کولیەی حقوق دەردەچێ. لە کاتی خوێندکاریدا بەشداری لە بزوتنەوەکانی خۆپێشاندان و مانگرتندا کردووە. لە شوباتی ١٩٣٤ دەگیرێ. بە کاری پارێزەری هەڵساوە. لە سییەکانا تێکەڵ بە دەستەی دەرچوێنەری رۆژنامەی (الاهالی) دەبێ. خەباتی

---

[55]– عەلی حەیدەر سلێمان لە تشرینی دووەمی ١٩٩١ لە بەغدا کۆچی دوایی دەکات. "وەگێڕ"

لەگەڵ گەنج و لاوانی پێشکەوتنخواز و چاکسازا کردووە. بەشداری لە بزوتنەوە نیشتیمانیەکەی ئایاری ١٩٤١دا دەکات لە سەرئەنجاما بەرەو ئێران هەڵدێ. دەچێتە ناو (حیزبی دیموکرات) لە کاتی دامەزرانیدا (١٩٤٦)، لە ریزەکانی تێکۆشاوە و لە رۆژنامەکەیا دەینوسێ. لە راپەرینی تشرینی دووەمی ١٩٥٢ بۆ ماوەیەکی کەم دەگیرێ. لە ئاکامی بەرپابوونی شۆرشی تەموزی ١٩٥٨ دەیکەنە باڵیۆزی عێراق لە دەلهی (١٩٥٩). بۆ براغ دەگوازرێتەوە (١٩٦٠). پاشان بۆ بۆدابست هەتا ١٩٦٣. بەشداری دەکا لە کۆنگرەی (یەکگرتووی ئاسیایی و ئەفریقی). ئەندام دەبێ لە وەفدی عێراقی لە کۆبوونەوەی دوو دەورەی نەتەوە یەکگرتووەکاندا (١٩٦٠ و ١٩٦١). دەگەرێتەوە سەرکاری پارێزەرایەتی. لە ٣ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٠ لە بەغدا جیهان بەجی دێڵێ. قاسم حەسەن لە نووسەرە سیاسیە بەرزەکان بوو. کتێب و نامیلکەی زۆری داناوە لەوانە: جهاد العرب القومی فی فلسطین (١٩٣٩). (المبادیء السیاسیة الحدیثة فی بلادنا) (١٩٣٩). (الثورة الصناعیة فی انکلترا). الحق بین الصهیونیة و الاستعمار (١٩٤٦). العرب و المشکلة الیهودیة (١٩٤٦). اسرائیل دولة فاشیة اعتدائیة (١٩٦٠). بوابتا ثورات القرن العشرین (١٩٦٩). لمحات من تاریخ التطورات الأجتماعیة فی الغرب ١٩٥٨... هتد.

## حەسەن فەهمی جاف

لە سەرۆکانی عەشیرەتی جاف حەسەن فەهمی کوڕی عەلی کوڕی مەحمود پاشایە. لە ١٦ی تشرینی دووەمی ١٩٠٥ لە هەڵەبجە هاتۆتە دنیا. لەسەر دەستی مامۆستایانی تایبەتی خوێندویەتی. خەریکی کشتوکاڵ و بەرێوەبردنی کاروباری عەشیرەتەکانی بووە. ئارەزوومەندی بە لای ئەدەبەوە چووە. وتارەکانی لە بارەی کاروباری ئابوری و ئاوەدانی ناوچەکەیدا لە گۆڤاری گەلاوێژی مانگانەی کوردی بڵاو کردۆتەوە کە ساڵی ١٩٣٩-

١٩٤٩ دەرچووە. باس و توێژینەوەی لەسەر مێژووی بنەماڵەی زەندی کورد نووسیوە کەوا لە ناوەراستی سەدەی هەژدهەمدا فەرمانڕەوایی ئێرانی کردووە.

لەسەر گەشتی زەینەفون بۆ کوردستان، بە نوێنەری هەڵەبجەی سەر بە پارێزگای سلێمانی هەڵدەبژێردری (حوزەیرانی ١٩٤٨). سەرلەنوێ لە کانونی دووەمی ١٩٥٣ و ئەیلولی ١٩٥٤ و ئایاری ١٩٥٨ هەڵدەبژێردرێتەوە. لە ١٨ی حوزەیرانی ١٩٧٣ لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە. دانەرەکانی: بە زمانی کوردی: (پاڵەوانی زەند) سەربوردەی لوتفی عەلی خانی زەندە، لە فارسیەوە وەری گرتووە و لە ١٩٥٦ چاپکراوە. کوردستان گەرانەوەی دهەزار یۆنانی ساڵی ٤٠١ پێش زایین دانەرەکەی (زەینەفۆن) هەروەها لە (١٩٥٦ چاپکراوە). لە دەستخەتە بەجێماوەکانی: شیعرەکانی بە کوردی و فارسی و تورکی و کتێبی لەسەر عەشیرەتی جاف.. هەروەها لە سەرۆکە ناسراوەکانی هۆزی جاف ئەحمەد محەمەد سالح: کوڕی محەمەد سالح بەگ کوڕی عەزیز بەگ کوڕی محەمەد بەگ کوڕی قادر بەگ (لە بەرەی بەهرام بەگ) ە ساڵی ١٩٠٣ لەدایك بووە. لە تەموزی ١٩٥٤ بە نوێنەری سلێمانی هەڵبژێردراوە (قەزای هەڵەبجە). لە ١٦ی ئابی ١٩٧٣ لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە.



## میرانی قادر بەگ

میرانی عەبدولقادر بەگ کوڕی مستەفا بەگ سەرۆکی هۆزی خۆشناو دەچێتەوە سەر بنەماڵەی میر محەلی. بارەگاکەی لە ناحیەی شەقلاوەی سەر بە هەولێرە. دوای مەرگی بایز بەگی برای سەرداریەتی هۆزەکەی گرتۆتە دەست. پیاوێکی توند و بەتوانا بوو. داواکاری یەکێتی و یەکبوون. هەوڵی بلاوکردنەوەی خوێندەواری لە هەموو ناوچەکانی هۆزەکەی داوە. لە

شوباتی ١٩٣٣ بە نوێنەری هەولێر هەڵبژێردراوە. سەرلەنوی لە دەورەکانی داهاتوودا هەتا ساڵی ١٩٣٧ هەڵدەبژێردرێتەوە. لە کۆتایی ئایاری ١٩٣٩ بە هۆی زام و برینێکی باسکی لە تەمەنی شەستەکاندا کۆچی دوایی دەکات.

سدیق میرانی کوڕی جێگای لە سەرۆکایەتیەکەدا دەگرێتەوە. ساڵی ١٩٠٧ هاتۆتە دنیا. لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٣٩ بە نوێنەری هەولێر هەڵبژێردراوە. بە نوێنەری لە هەموو دەورەکانی یەك لە دوای یەکدا دەمێنێتەوە. هەتا شۆڕشی تەموزی ١٩٥٨.

لە شوباتی ١٩٦١ لە نزیك شارۆچکەی شەقڵاوە لە هاتووهەرای عەشیرەتگەری نێوان بارزانیەکان و کوردەکانی شەقڵاوە بە غەدر دەکوژرێ[٥٦].

---

[56] ئەوەی راستی بی وەك کاك فازل کاوانی لە لەندەن پێی راگەیاندم گوتی: هۆی کوشتنی سدیق بەگ لەبەر ناکۆکی و کێشەی مولك و زەوی یان لەبەر ناحەزی و دوژمنایەتی نەبوو، بەڵکو فەرمانێکی سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلولی ١٩٦١ بە خالم مەحمود کاوانیان سپارد کە یەکێك بوو لە هەرە نزیکەکانی سەرەك بارزانی و سەرکردەیەکی شۆڕشەکەش بوو، رووداوەکەش بەمجۆرە بوو: لە کاتێکا سدیق بەگ لەگەڵ چەندین چەکداری دەست و پێوەندی خۆیەوە لەسەر تازیەی حوسێنی مەلا کە ئاغایەکی دزەیی و ئەندام پەرلەمان بوو بەرەو شەقڵاوە دێتەوە لە نزیك گوندی حوجران مەفرەزەیەکی پێشمەرگە بە سەرکردایەتی مەحمود کاوانی خالم بۆسەی لی دادەنێنەوە و دەستڕێژی لی دەکەن. دەبێتە شەر و تەقە لە نێوانیاندا و سدیق بەگ تێیدا دەکوژرێ. دەتوانم بڵێم کوشتنی سدیق میران سەرەتای داگیرسانی شۆڕش و خوێنڕژان و کوشت و کوشتار بوو لە کوردستاندا و نەپسایەوە تا ئەمڕۆشی لەگەڵدا بێ. دوای ئەم رووداوەش بە ساڵێك مەحمود کاوانیش لە ئاکامی بوردومان کردنی فڕۆکەکانی عێراق لە گوندی عاقوبان نێوان ناحیەی هیران و شەقڵاوە بریندار دەبی دوای دوو حەفتە گیانی لە دەست داوە (١٩٦٢/٨/٢١) (وەرگێڕ).

## بابا عەلی شێخ مەحمودی حەفید



باباعەلی کوڕی شیخ مەحمود کوڕی شێخ سەعید کوڕی کاك ئەحمەد کوڕی شیخ مەعروفی نۆدێیە. شێخ مەحمودی باوکی (١٨٨١- ١٩٥٦) سەرۆکی عەشیرەتەکانی بەرزنجە بووە لە سلێمانی. سەرکردایەتی چەندین شۆڕشی لەسەر حکومەتەکانی تورکی و بەریتانی و عێراق بەرپا کردووە.

باباعەلی لە بەهاری ساڵی ١٩١٢ لە سلێمانی هاتۆتە جیهان. قوتابخانەی سەرەتایی لە بەغدا تەواو دەکا. ناردویانە بۆ کولیەی فکتۆریا لە ئەسکەندەریە (١٩٢٨). ساڵی ١٩٣٢ لێی دەرچووە. پاشان چووەتە جامیعەی کۆڵۆمبیا لە نیۆیۆرك (١٩٣٣). بڕوانامەی (*استاذ العلوم*) ی لە بواری ئابوری ساڵی ١٩٣٨ بەدەست هێناوە. کە دەگەڕێتەوە بۆ ماوەیەکی کەم فەرمانبەری لە بەڕێوەبەرایەتی سکەی شەمەندەفەر بینیوە (١٩٤٠). پاشان دەکەوێتە کاروباری کشتوکاڵی و ئابوریەوە. ساڵی ١٩٤٣ لە عەمارە و رومادی بە هۆی بەدگۆیی و بوختانێکی درۆوە دەگیرێ. دوای دوو مانگ بەردەدرێ. لە وەزارەتی ئەرشەد ئەلعومەری دەیکەنە وەزیری ئابوری (یەکی حوزەیرانی ١٩٤٦). لە پایەکەی خۆی لە وەزارەتی نۆیەمینی نوری سەعید دەمێنێتەوە (٢١ی تشرینی دووەمی ١٩٤٦- ٢٩ی ئازاری ١٩٤٧). بە نوێنەری سلێمانی هەڵدەبژێردری (ئازاری ١٩٤٧). دەیکەنە وەزیری ئەشغال و مواسەلات (١٤ی تەموزی ١٩٥٨). لە ٧ی شوبات ١٩٥٩ واز دەهێنێ. پاشان بە وەزیرایەتی کشتوکاڵ دادەمەزرێ (٨ی شوباتی ١٩٦٣- ١٦ی حوزەیرانی ١٩٦٣).

دوای ئەوە خۆی خەریکی کاروباری ئابوری کردووە. ساڵی ١٩٦٨ عێراق بەجێ دێڵێ. دوو ساڵ لە تاهران و بەیروت نیشتەجێ دەبێ پاشان لە لەندەن دەکاتە دوا هەواری[٥٧].

## نازم زەهاوی

نازم کوڕی عەبدولجەلیل کوڕی محەمەد فەیزی موفتی بەغدای سەردەم، لە بەغدا لە ساڵی ١٩١٠ هاتۆتە دنیا. لە تشرینی یەکەمی ١٩٢٩ دەست بە کار دەبێ لە خزمەتگوزاریەتی حکومەت. لە کولیەی حقوق دەخوێنێ. ساڵی ١٩٣٤ لێی دەرچووە. لە ئایاری ١٩٣٥ بە بەڕێوەبەری (ئەموالی قاسرین) دادەمەزرێ. هەتا لە کۆتایی ساڵی ١٩٤٥ واز دەهێنێ. لە گەنجە رۆشنبیرەکانی داواکار بۆ بیروبڕوای پێشکەوتن و چاکسازی بووە. وتارەکانی لە گۆڤار و رۆژنامەکاندا نووسیوە. کتێبی: "*نقد المثالیة الحدیثة*" دانەرەکەی جۆن لویس وەرگێڕاوە (١٩٤٥) "الاصول التاریخیه للامپریالزم الالمانی (١٩٤٦) دانەرەکەی ئوجین ڤارکا پسپۆڕی ئابوری مەجەری، "*مقدمة فی الفلسفة المادیة*" کاتی بەڕێوەبەری بەرپرسیاری رۆژنامەی (السیاسە) دەبێ لە ئابی ١٩٤٦ سەبارەت بە وتارە ئازا و چاونەترسیەکە لە رۆژنامەکەیا بڵاوی کردونەتەوە دەیگرن و مانگێك حوکمی دەدەن. پاشان بەری دەدەن. دەگەڕێتەوە خزمەتگوزاریەتی میری دەیکەنە بەڕێوەبەری گشتی ئەموالی موستوردە (١٩٤٨). دوایی پشکێنەری گشتی دارایی (١٩٥٢). ئینجا بەڕێوەبەری گشتی لە وەزارەتی ئابوری (١٩٥٢). دەگوازرێتەوە بە بەڕێوەبەری گشتی "مصرف صناعی " (١٩٥٣)، بە نوێنەری عێراق دەبێتە بەڕێوەبەر لە کۆمپانیە نەوتەکان لە لەندەن (حوزەیرانی ١٩٥٥). دوای شۆڕشی ١٩٥٨ دەگەڕێتەوە بەغدا. دەبێتە بەڕێوەبەری گشتی شەریکەی "الزیوت النباتیە" دەیکەنە موحافیزی بەنکی مەرکەزی (نیسانی

---

[57]- بابا عەلی لە ١٩٩٨ لە لەندەن کۆچی دوایی کرد. تەرمەکەیان بردووە کوردستان لە سلێمانی دەنێژرێ. "وەرگێڕ"

١٩٥٩). دوایی وەزیری بازرگانی (١٥ی تشرینی دووەمی ١٩٦٠- ٨ی شوباتی ١٩٦٣). دوای ئەوە پەنا دەباتە بەر وڵاتی عەرەبی سعودی لە ٢٤ی تشرینی دووەمی ١٩٦٣ لە (ریاز) کۆچی دوایی دەکا. مەحمود سوبحی دەفتەری بۆی باس کردم: ئەو ساڵی ١٩٣٩ وەزیری داد دەبێ. لیستەیەك بۆ لێ خستنی هەندێك لە فەرمانبەرانی گەورە خرایە بەر دەستی ئەنجومەنی وەزیران، لەوانە نازم زەهاوی بەرێوەبەری "ئەموالی قاسرین" بوو. دەفتەری دەڵێ: سەبارەت بەوەی من توانا و سەرراستی نازم زەهاویم دەزانی بەرهەڵستیم لە لادانی کرد و لە فەرمانەکەی خۆیدا مایەوە. دوای چەند رۆژێك هات سوپاسی کردم پاشان پێی گوتم: پاش ماوەیەکی کەم شایستەی بەرزکردنەوەی موچەکەمم. گوتم: هەرچی لە توانامدا بی بۆتی دەکەم. بەڵام مەزەندەی ئەوە ناکەم لەم تەرزە زروفەدا تەرفیعت ببێ. هەفتەیەك یا دەرۆژی نەبرد جارێکیتر نازم هاتەوە لام. لەبارەی بەرزکردنەوەکەی پرسی چی لێ هاتەوە، چونکە ماوەی پێویست بە گوێرەی یاسا سی ساڵە. من لەو رۆژەوە هەقی خۆمە. بە پێکەنینەوە پێم گوت: چما ئەوە کۆمپیالەیە کەوتۆتە سەرم کە بیدەم تۆش هاتووی داوام لێ دەکەی!!...

## خالید نەقشبەندی

خالید عەبدول غەفار نەقشبەندی لە ساڵی ١٩١٥ لە گوندی بامەرنی سەر بە قەزای ئامێدی لە پارێزگای موسڵ هاتۆتە دنیا، خوێندنی قوتابخانەی ناوەندی لە موسڵ دواناوەندی لە بەغدا تەواو کردووە. چۆتە کولیەی عەسکەری (١٩٣٦) لە تەموزی (١٩٣٧) بە ملازم لێی دەرچووە. دوای ئەوە لە کولیەی ئەرکان بە پایەی رەئیس روکن دەردەچی (١٩٤٥). ئێواران لە حقوق دەخوێنێ. ساڵی ١٩٥٠ تەواوی دەکا. لە سوپا دەمێنێتەوە. بۆ پایەی موقەدەم باڵا دەکری (١٩٥٠). دەیکەنە ئامیر فەوجی دووەم لە لیوای سێیەمدا و ئامیری حامیەی رەواندوز.

سوپا بەجی دێڵێ. دەبێتە قایمقامی قەزای رانیە (١٩٥٢) و کۆیسنجاق ئینجا هەڵەبجە. بۆ پارێزگاری لیوای هەولێر باڵا دەکری (١٩٥٧). کە شۆڕشی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ بەرپا دەبێ دەیکەنە ئەندام لە ئەنجومەنی سیادەی کۆماری عێراق، هەتا کۆچی دوایی لە بەغدا لە ٢٧ی تشرینی دووەمی ١٩٦١.

## عزالدینی مەلا ئەفەندی

کوڕی ئەبوبەکر مەلا ئەفەندی ١٨٦٧- ١٩٤٢ لە زانایانی هەولێر و ناودارەکانییەتی. دەچێتەوە سەر بنەماڵەیەکی ئایینی، ئەرکی دەرس وتنەوەیان لە مزگەوتی گەورەی قەڵات بینیوە، لەوانە: حاجی عومەری باوکی و ئەبوبەکری باپیری کە نازناوی کوچك مەلا بووە، کوڕی مەلا عوسمان کوڕی ئەبوبەکری حوجرەوییە.

عیزەدین ساڵی ١٩١٦ لە هەولێر هاتۆتە دنیا[٥٨]. لە جامیعەی ئەمریکی لە بەیروت خوێندویەتی. بە نوێنەری هەولێر لە ئەنجومەنی نوێنەراندا هەڵبژێردراوە (ئازاری ١٩٤٧).

---

[58]- راستی مێژووی هاتنە دنیای عیزەدین ئەفەندی وەك خۆی دەڵی ١٩١٧ بووە. لە مانگی ئازاری ١٩٩٧ لەگەڵ کاك نهاد نورەدین ئاغا ئەندامی پەرلەمان چووینە سەردانی. ئەگەرچی لە تەمەنی هەشتا ساڵیدا بوو بەڵام هۆش و هەست و جوڵەی ئاسایی و پرچالاکی بوو. هەر چواردەوری ژوورەکەی کتێبی هەمەجۆرەی بەهادار بوو. زۆرترین کاتی خۆی وەك پێی راگەیاندم بۆ خوێندنەوەی تەرخان کردووە. زمانی ئینگلیزی، فەرەنسی، عەرەبی و تورکی جگە لە زمانی کوردی زکماکی خۆی و فارسیشی زانیوە. لە کتێب خوێندنەوەی فەرەنسی و ئینگلیزی هەر بەردەوامە یادەوەری و سەربوردەی ژیانی خۆی پێبەپی نووسیوەتەوە. بەڵام نیازی بڵاو کردنەوەی نیشان نەدا. "وەگێڕ"

دوایی شۆڕشی تەموزی ١٩٥٨ نزیکەی دوو مانگ دەگیرێ. دووبارە هەر لە سەردەمی عەبدولکەریم قاسمدا لە ١٩٦٢ بەند دەکرێتەوە. دوای بەردانی دیسان ١٩٦٣ بەعسیەکان دەیخەنە بەندیخانەوە. دوای بەربوونی دەچێتە پاریس لەوێشەوە روو دەکاتە بەیروت پاشان دێتەوە کوردستان هەوارگەی باب و باپیران. لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٩٩ لە هەولێر جیهان بەجی دێڵێ. "وەرگێڕ"

سەرلەنوی لە دەورەکانی داهاتووی یەك لە دوای یەکدا هەڵبژێردراوەتەوە. لە یەکی کانونی یەکەمی ۱۹٤۷ بە جێگری دووەمی ئەنجومەنی نوێنەران هەڵدەبژێردرێ. دیسان لە ۲۱ی حوزەیرانی ۱۹٤۸ هەڵدەبژێردرێتەوە. پاشان هەڵبژاردنەکەی نوی دەکرێتەوە هەتا ۲۷ی تشرینی یەکەمی ۱۹۵۲. بە جێگری دووەمی سەرەك ئەنجومەنەکە هەڵدەبژێردرێتەوە (۲٤ی کانونی دووەمی ۱۹۵۳). پاشان بە جێگری یەکەمی سەرۆك (یەکی کانونی یەکەمی ۱۹۵۳). دیسان هەڵبژاردنەکەی نوی دەکرێتەوە هەتا (۱۵ی کانونی یەکەمی ۱۹۵۷). دادەمەزری بە وەزیری بی وەزارەت (۱۵ی کانونی یەکەمی ۱۹۵۷ تا ۳ی ئازاری ۱۹۵۸). دوایی بە جێگری یەکەمی سەرەك ئەنجومەنی نوێنەران هەڵدەبژێردری (۱۰ی ئایاری ۱۹۵۸ تا ۱٤ی تەموزی ۱۹۵۸). دوای ئەوە لە بەیروت نیشتەجی دەبێ.

## مەحمود جەمیل

لە بنەماڵەی ناسراو بابانە. مەحمود کوڕی جەمیل کوڕی مەجید پاشای بابانە. باوکی نوێنەر بووە لە ئەنجومەنی نوێنەراندا. لە تەموزی ۱۹٤٦ کۆچی دوایی کردووە. مەحمود بابان ساڵی ۱۹۲۰ لەدایك بووە. لە جامیعەی ئەمریکی لە بەیروت دەخوێنێ. لە کولیەی حقوق لە بەغدا دەرچووە (۱۹٤۳) دەبێکەنە کاتبی یەکەم لە دادگاکانی مەدەنی (۱۹٤٤) دوایی (محقق عەدلی) ئینجا جێگری حاکمی ئەعزەمیە (کانونی دووەمی ۱۹۵۰) دەبێتە حاکمی جەزای بەغدا. ساڵی ۱۹۵۱ بە نوێنەری خانەقین هەڵدەبژێردرێ. دوایی نوێنەری قەزای کفری لەم دەورانەدا ۱۹۵۳ و ۱۹۵٤ و ۱۹۵۸ ئیمتیازی دەرچواندنی گۆڤارێکی کوردی بە ناوی (هیوا) ی پی دراوە دەرچواندنەکەشی بە حافز مستەفا و هاشم دۆغرەمەچی سپاردووە. دادەمەزری بە وەزیری تەندروستی (۱۵ی کانونی یەکەمی ۱۹۵۷). دوایی وەزیری دەوڵەت (۳ی ئازاری ۱۹۵۸). بەردەوام دەبێ لە پایەکەی لە

۱۹ی ئایاری ۱۹۵۸ هەتا ٤ی تەموزی ۱۹۵۸. ئامادەی کۆنگرەی پەرلەمانیەکانی دەوڵەتان دەبێ کەوا لە برن (۱۹۵۲) و (۱۹۵۵) و لەندەن (۱۹۵۷) دەبەسترێ. دوای ئەوە بە راوێژکار لە وەزارەتی ناوخۆی سعودیە کارمەند دەبێ. بۆ لەندەن دەگوازرێتەوە لێی نیشتەجی دەبێ. دەکەوێتە کاروباری بازرگانیەوە.

## گەریدە و مێژوونوسان

زۆر لە گەریدەو مێژوو نوسانی بیانی یاداشتی خۆیان دەربارەی کورد و کوردستان نووسیوە زۆربەشیان بە چاپیان گەیاندووە بۆیە بە پێویستمان نەزانی لێرەدا دوبارەیان بکەینەوە، ئەوانەی لەم کتێبەدا ناویان هاتووە لەسەردەمی جیاجیادا سەردانی کوردستانیان کردووە ئەمانە بوون: "وەرگێر".

## لیکلاما ئینهوڵت

گەریدەیەکی هۆڵەندی نەژاد، لە ۱۸۳۷ لە بسترواغ هاتۆتە جیهان، گەشتەکەی لە ساڵی ۱۸٦۵ تا ۱۸٦۸ دەخایەنی، لەو ماوەیەدا زۆرترین وڵاتانی رۆژهەڵاتی ناوەراست و کوردستان دیدار دەکات. لە ساڵی ۱۹۰۰ کۆچی دوایی کردووە.

کرترود مارغریت لوثیان بێل

رۆژهەڵات ناسی گەریدە کرترود مارغریت لوثیان بێل لە ۱٤ تەموز ۱۸٦۸ لە ناوچەی درهام لە بەریتانیا هاتۆتە دنیا. لە تەمەنی سی ساڵیدا دەبێ کە دایکی کۆچی دوایی دەکا، هیو بیلی باوکی بە ئەرکی پەروەردەو رۆشنبیر بورنی هەڵدەستێ، خوێندنی لە کولیەی مەلەکی لە لەندەن جامیعەی ئۆکسفۆرد تەواو دەکات، لە مێژوو تایبەتمەند دەبێ، هەر لە هەرەتی نەوجەوانیدا هەواداری گەشت و سەفەر دەبێ، کەم وڵات هەیە لە ئەوروپا، ئاسیا و باکوری ئەفریقا ئەم ئافرەتە سەردانی نەکردبێ. تا ئەوەی کەنداو و ئەمریکاشی بەسەر

کردۆتەوە. بە هۆی ئەوەوە زانیاری و شارەزاییەکی زۆری دەربارەی ئەو وڵاتە پەیدا کردووە. چەندین کتێب و نامیلکەی بە چاپ گەیاندووە. فارسی و عەرەبی بە باشی فێر بووە. لە هەواداری شاعیری ناوداری ئێرانی (حافز شیرازی) بووە. لە میانەی گەشتەکانیدا سەردانی ناوچەی یەزیدییەکان دەکا. عەلی بەگ ( کە ئەوسا سەردار و میری یەزیدییەکان بووە) پێشوازی و میوانداری دەکات (١٩٠٩). ئەم دیدار و چاوپێکەوتنەشی لە کتێبەکەیدا (من مراد الی مراد) بڵاو کردۆتەوە (١٩١١). ئەم خاتوونە بەهرەوەر و هۆشمەند رۆڵ و دەوری کاریگەری لەسەر دامەزراندنی حکومەتی نیشتیمانی عێراقی بە سەرۆکایەتی عەبدوڵرەحمان نەقیب و دانانی مەلیك فەیسەل لەسەر عەرشی عێراقدا هەبووە. بە پێی ئەوەی سکرتێری برسی کۆکس حاکمی سیاسی ئینگلیز لە بەغدا دەبێ. لە ١١ی تەموزی ١٩٢٦ لە بەغدا جیهان بەجێ دێڵێ.

## ئیلی بانیسترسۆن

مێجەر "رائید" ئیلی بانیستر سۆن خاوەنی گەشتی خۆگۆڕین بۆ کوردستان لە ١٦ ئاب ١٨٨١ هاتۆتە دنیا دەچێتەوە سەر خێزانێکی دێرینی ئینگلیزی کە زۆربەی رۆڵەکانی بە کشتوکاڵەوە خەریك بووین، کاتی باوکی دەمری تەمەنی لە دوو ساڵ کەمتر دەبێ، خوێندنی دواناوەندی لە ١٨٩٨ تەواو دەکات، دەبێتە فەرمانبەری بانقی شاهانەی ئێرانی، لەوی فارسی بە باشی فێر دەبێ، چوارینەکانی خەیام وەردەگێڕێتە سەر زمانی ئینگلیزی. لە ١٩٠٥ پەیڕەوی ئاینی ئیسلامیدەکا، سەردانی ناوچە جیاجیاکانی کوردستان و عێراقی کردووە. کتێبە بەناوبانگەکەی (رحلە تنکر الی بلاد الرافدین و کردستان) ساڵی ١٩١٢ بەچاپی گەیاندووە، ساڵی ١٩٢٦ دوای مردنی دووبارە چاپکراوەتەوە. سۆن سەردان و گەشت و سەفەری بۆ تورکیا و رۆژهەڵاتی ناوەراست کردووە، جل و بەرگی کوردی و هەندێك جار هی ئێرانیی پۆشیوە. ناوی لەخۆی ناوە (میرزا غولام حوسێن شیرازی).

دەنێردرێتە ناوچەی بەختیار، توانیویەتی بەهۆی شەش جەنگاوەری ئازای کورد بزوتنەوەو سەربزێوی تورکی، ئەڵمانی، لە ناوچەکەدا لەناو بیات. ساڵی ١٩١٩ دەبێتە حاکمی سیاسی شاری سلێمانی. ئەمن و ئاسایشی تێدا سەقام گیرکردووە، گەلی پردو ڕێگاوبان و قوتابخانەی بنیاد ناوە. لە قوتابخانەکان بە کوردی خوێندراوە، فەرمانبەرو کارمەندانی خۆی هەمووی لە ڕۆڵەو پیاوی کورد پێك هێنابوو. لە ساڵی ١٩٢١ پاش دامەزراندنی حکومەتی نیشتمانی عێراق دەگەرێتەوە ئینگلتەرە، بەردەوام دەبێ لە دانانی فەرهەنگی زمانی کوردی، دەست نووسەکەی دوای مردنی لە (پەیمانگای دیراسەتی ڕۆژهەڵات) پارێزراوە. نەخۆشی تینی بۆ دێنێ، بۆ چارەسەر دەچێتە بنزرت لە تونس، لە گەرانەوەیدا لەناو کەشتیەکەدا لە ٢٤ شوبات ١٩٢٤ گیانی لەدەست داوە.

سۆن لەو ماوەیەدا شارەزایی و زانیاریەکی تەواوی لەسەر هۆزو عەشیرەتەکانی کورد پەیدا کردووە. سەردانی عادلە خانم دەکا بەراشکاوی باسی میوان داری و شێوەی روخسار و جلوبەرگی ئەم خاتونە سەردارە کوردە دەکات، پاشان چاوی بە تاهیر بەگی شاعیر دەکەوێت و دەڵێ: تاهیر بەگ جگە لە زمانی کوردی فارسی و تورکی و کەمی فەرەنسی زانیوە.

سۆن لە کتێبەکەیدا باسی جلوبەرگ و داب و دەستور و نەریتی کوردی کردووە. کتێبەکەی بە لێدوان لەسەر هەندێك خێڵەسات و عەشیرەتەکانی کورد کۆتا پی هێناوە، لەوانە: حەیدەرانلۆ، شکاك، هەکاری، موکری، پشدەر، ڕەواندوز، شوان، بابان، بانە، مەریوان، جاف، هەماوەند، شەرەف بەیانی، باجەلان، هەورامان، سلاحی، جۆران، کەلەوڕو، سنجابی.

## سێر جۆن ئیدمۆندس

له پێشەوەی شارەزایانی کاروباری کوردو زمانەکەیەتی لەم سەردەمەدا. فەرمانبەری بەڕێوەبەرایەتی و ئەدیب و دانەری ئینگلیزی سێرئیدمۆندس لە ٢٦ تشرینی یەکەم ١٨٨٩ شاری ئۆسکای یابانی هاتۆتە دنیا، کەوالتەر ئیدمۆندسی باوکی لەوی قەشە دەبێ.

سێر لە جامیعەی کمبریدج خوێندویەتی زمانی عەرەبی، تورکی و فارسی فێر بووە. ساڵی ١٩١٠ بە سیفەتی وەرگێڕ دەچێتە ناو کاری قونسولیەت. کارمەند دەبێ لە ئەستەنبول و بوشهەر. جەنگی جیهانی بەرپا دەبێ. دەیکەنە یاریدەدەری ئەفسەری سیاسی. لەو هەڵمەتە سوپاییەی کە نێردراوەتە سەر عێراق (١٩١٥). بەو پایە و بەو سیفەتە خزمەتگوزاری لە عێراق و ئێران و کوردستاندا کردووە. دوای دامەزراندنی حکومەتی عێراقی دەبێتە پشکنینەری بەڕێوەبەرایەتی کەرکوك و سلێمانی (١٩٢٢). دەگوازرێتەوە بە یاریدەدەری راوێژکار لە وەزارەتی ناوخۆدا (١٩٢٥). پاشان راوێژکار لە وەزارەتی دەرەوە (١٩٣٣). دوایی راوێژکاری وەزارەتی ناوخۆ (١٩٣٥- ١٩٤٥). دەگەڕێتەوە لەندەن دەیکەنە راوێژکار لە وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا. دەبێتە نوێنەری هەمیشەیی لە دەزگاکانی نێودەوڵەتی بۆ پەناهەندەکان لە جنێڤ. بۆ پایەی وەزیر مفەوەز باڵا دەکرێ. لە ١٩٥٠ واز لە کار و فەرمان دێنێ. دوای ئەوە دەستی کردووە بە موحازەرە لە سەر زمانی کوردی لە پەیمانگای دیراسەتی رۆژهەڵاتی و ئەفەریقی سەر بە جامیعەی لەندەن.

ئەم پیاوە بە گەلی ئەرکی گرنگی بەڕێوەبەرایەتی و سیاسی لە عێراق هەڵساوە. پەیوەندی دۆستایەتی بە گەلی کەسایەتی دەستەڵاتداری عێراق هەبووە. بە شێوەیەکی تایبەتیش بە ئەدیب و زانای مەزنی کورد تۆفیق وهەبی بەگەوە، هەتا مەرگ لێکی دانەبڕاندن ئاشنایەتی و هاموشۆیان لەگەڵ یەکتر هەر بەردەوام بووە. پێکەوە فەرهەنگێکی کوردي- ئینگلیزییان داناوە (١٩٦٦).

ئیدمۆندس دانەری چەندین کتێبە ناودارترینیان (کورد_ تورك_ عەرب) (١٩٥٧) پاریزەر جەرجیس فەتحوڵلا وەریگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی.

ئیدمۆندس لە ١١ حوزەیران ١٩٧٩ لە ناوچەی کند کۆچی دوایی دەکا. وتارێکی لە ژێر ناوی (*الخلفية الدستورية للحرب الكردية في العراق*) نووسیوە و لە گۆڤاری کوردستان زمان حاڵی خوێندکارانی کورد لە ئەورروپا لە لەندەن بە ئینگلیزی دەردەچوو بلاّوکردۆتەوە.

## وەرگێڕ لەچەند دێڕێکدا



- عەبدولخالق کوڕی عەلائەدین کوڕی حاجی ئاغا مستەفایە.

- لەشاری دێرینی کۆیە هاتۆتە دنیاوە (١٩٣٢).

- دوا قۆناغی خوێندنی دەچێتە خانەی مامۆستایان دەبێتە سەرۆکی یەکێتی قوتابیانی خوێندنگاکە و نوێنەر بۆ یەکەم کۆنگرەی یەکێتی قوتابیانی عێراق کە بۆ یەکەمجار لەمێژوودا لەبەغدا بەسترا (١٩٤٨).

- (٣٣) ساڵ لەپرۆسەی پەروەردە و فێرکردن لەقوتابخانە جیاکانی سەر بەپارێزگای هەولێر و پێنج ساڵیش لەباشووری عێراق ئەنجامداوە.

- بەهۆی هەڵوێست و جمجۆڵی سیاسی و نیشتمانی دوا شەش مانگ لەبەندینخانەکانی کۆیە - هەولێر - کەرکوك و بەغدا دوو ساڵ حوکم و ساڵێك ژێر چاودێری پۆلیس لەمەحکەمەی عورفی بەغدا بەسەری سەپێندراوە، بەهۆی تەمەنییەوە ئەنجام نەدراوە ساڵێك لەخوێندن دادەبڕێت.

- ساڵێك و دوو مانگ بەبەشداربوونێکی بیر و باوەڕ بەشۆڕشی ئەیلول لەناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی شۆڕش بەسەر بردووە.

- دەگەڕێتەوە سەر فەرمان و دەبێتە راوێژکار لەوەزارەتی رۆشنبیری لەهەولێر (١٩٩٦).

- ئەندام لەسەندیکای مامۆستایان و بەشداری لەکۆنگرەکاندا کردووە.

- بەنوێنەرایەتی لاوانی کۆیە بەشداری لەدوو فیستیڤاڵی لاوانی جیهانی لەڤیەننا - پایتەختی نەمسا (١٩٥٩) و سۆفیا -- پایتەختی بولگاریا (١٩٦٧).

- هەر لەسەرەتای دامەزراندنی یەکێتی نووسەرانی کورد تێیدا بووەتە ئەندام و لەکۆنگرەکانی یەك لەدوای یەکدا بەشداربووە، چەند جارێك لەدەستەی بەڕێوەبەرایەتی هەولێر بووە.
- ئەندام لەسەندیکای ڕۆژنامەنووسان.
- ئیتر ڕوو لەهەندەران دەکات و بەپەناهەندەیی لەلەندەن لەگەڵ ماڵ و منداڵەکانی نیشتەجێ دەبێت (١٩٩٨).
- ئێستاش لەهەولێر زۆربەی ژیانی بەسەر دەبات، لەساڵانی پەنجاکانەوە وتار و نووسینی لەبوارە جیاجیاکانی ئەدەبی لەگۆڤار و ڕۆژنامەکانی کوردی بڵاوکردۆتەوە.

ئەم کتێبانەشی بەچاپ گەیاندووە:

١/ بەسەرهات و ژیانی مەلا محەمەدی کۆیە – چاپخانەی نەجەف ١٩٧٤.

٢/ دڵدار شاعیری شۆڕشگێڕی کورد – چاپخانەی جامعە لەبەغدا ١٩٨٥.

٣/ مەلای گەورە زانا و ئەدیب و شاعیر – چاپخانەی زانکۆ لەهەولێر ١٩٩٤.

٤/ ناودارانی کورد لەعەرەبیەوە (٢٠٠٢) چاپ و بەخشی سەردەم – سلێمانی.

٥/ مەلای گەورە زانا و ئەدیب و شاعیر چاپی دووەم (٢٠٠٨)، چاپخانەی منارە–هەولێر.

٦/ ناودارانی کورد چاپ دووەم (٢٠٠٩) – چاپخانەی منارە – هەولێر.

بەرهەمە چاپ نەکراوەکانی:

- یاداشتی خودی خۆی.
- ناودارانی کۆیە.

# پێرست

# سەرچاوەکان

کەم تا زۆر سوودم لەم سەرچاوانە وەرگرتووە "وەرگێڕ"
. دیوانی فایەق بێکەس / چاپی دووەم محەمەدی مەلا کەریم ١٩٨٠
. دیوانی پیرەمێردی نەمر / محەمەد رەسول هاوار
. دیوانی پیرەمێرد / فایەق هۆشیار
. دیوانی حاجی قادر کۆیی / عەبدول رەحمان سەعید ١٩٢٥ چاپخانەی دار السلام
. دیوانی گۆران _ بەرگی یەکەم / محەمەدی مەلا کەریم چاپخانەی کۆری زانیاری کورد ١٩٦٦
. دیوانی شێخ رەزای تاڵەبانی
. پەندی پێشینانی _ پیرەمێرد / بەشی یەکەم ١٩٩٥ بەشی دووەم ١٩٦٦
. شێخ مەحمودی قارەمان / محەمەد رەسول هاوار
. دیوانی حەمدی / ئەحمەد بەگی ساحێبقڕان
. میرایەتی بابان لە نێوان بەرداشی رۆم و عەجەمدا / نەوشیروان مستەفا
. دیوانی سالح حەریق / مەحمود خاکی ١٩٦٩
. چاوپێکەوتن لەگەڵ عیزەدین مەلا ئەفەندی
. دیوانی پیرەمێرد / کۆکردنەوەو ساغکردنەوەی _ مستەفا سالح کەریم _ فایق هوشیار _ مەحمود ئەحمەد محەمەد، محەمەد نوری تۆفیق، ئەحمەد زرەنگ.
. پەیوەندی دیدار لەگەڵ مامۆستا موسعود محەمەد
. دیوانی ئەحمەد موختار جاف
. *الكرد و كردستان _ في الوثائق البريطانية / دكتور* وەلید حەمدی
. چاوپێکەوتن لەگەڵ خوشکە نەجات کچی رەفیق حیلمی

. شارە شیرینەکەم سلێمانی / جەمال بابان

. دیوانی مەحوی / مەلا محەمەدی بلاخی لێکدانەوەو لێکۆڵینەوەی مامۆستا عەبدولکەریم مودەریس

. دیدارو چاوپێکەوتن لەگەڵ خوشکە پەری کچی سەعید قەزاز _ لەندەن

. رۆژنامەی خەبات / ١٦-١٢-١٩٤٢ ئەحمەد جەمال

. یادداشت / مامۆستا رەفیق حیلمی

. کۆماری مەهاباد / مەحمود مەلا عیزەت

. دیوانی حاجی قادر / کەریم شارەزا _ سەردار میران

نرخ وبایەخی ئەم کتێبە زیاتر لەوە دایە کە دانەرەکەی کورد نیە وبە زمانی عەرەبی دایناوە، لەتەک ئەوەشا دانەرەکەی پیاوێکی بیر ڕووناک و نووسەر و شاعیر و ئەدیبێکی ناودارە، توانیویەتی بە هۆی دۆستایەتی و هەڵسوکەوتی لەگەڵ کوردی ڕۆشنبیر و شارەزا و پایەبەرز زانیاریەکی ورد و فراوان دەربارەی بەسەرهاتەکانی کوردستان و پیاوانی ناودار و ناسراو بە دەست بێنێ، سەرەڕای ئەوەش پشتی بە چەندین سەرچاوەی باوەڕپێکراوی مێژوویی بەستووە، لەگەڵ ئەوەشا مانای وانیە کە کورد لە و مرۆڤانەی ناویان لەم کتێبەدا هاتووە زیاتری لێ هەڵنەکەوتووە، بەڵکوو وەکو کورد گوتەنی(ئەوە مستێکە نمونەی خەروارێکە). ئەم کتێبە سەرچاوەیەکی بەهادارە بۆ ئێمەی کورد بە شێوەیەکی تێکڕاییش بۆ هەموو توێژەرەوە و مێژوونووسانی تایبەتمەند.

چاپخانەی منارە - هەولێر